# ڕۆمانسیزم لە شیعری
# هێمن و محەمەد نووری دا

ڕزگار عومەر فەتاح



# ڕۆمانسیزم لە شیعری
# هێمن و محەمەد نووری دا

**ڕزگار عومەر فەتاح**




## خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- **رۆمانسیزم لە شیعری هێمن و محەمەد نووری دا**
- **نووسینی: رزگار عومەر فەتاح**
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** رێمان
- **نرخ:** ٤٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم**
- **تیراژ:** ٥٠٠ دانە
- **چاپخانە:** موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(2535)ی ساڵی ( ٢٠١٣) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٨٥٨)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

**پێشکەشە بە:**

- بە گیانی پاکی شاعیرانی لێهاتووی کورد، مامۆستا (هێمن و محمد نوری )
- بە هەموو مامۆستاکانم لە هەموو قۆناغەکاندا، ئەوانەی وەك مۆم بە سوتانی تەمەنی خۆیان ڕوناکیان بە ژیان بەخشی.
- بە گیانی پاکی باوك و دایکە دڵسۆز و ئازیزەکانم٠
- بەخوشك وبرا بەرێزە کانم ٠
- بە هاوسەری ژیانم ( ڕۆژگار ) ٠
- بە جگەر گۆشەکانم ( ڕۆسۆ و ڕاڤین و ڕاسان و ڕۆزا)٠
- بە خوێنەرانی ئەم نامەیە و هەموو هاوڕێیان و خۆشەویستان.

## سوپاس و پێزانین :-

*له ناخی دڵمەوه سوپاس وپێزانینم ئاراستەی هەموو ئەم بەرێزانه دەکەم ئەگەر بەوشەیەکیش هاوکاریان کردووم به تایبه تی ئەم  به ریزانه ی خواره وه:-

*بەرێز: (محێدین  تەها محەمەد) وگشت کارمەندانی  خانەی موکریانی که ئه رکی له چاپدانی ئەم کیتێبه یان گرتە ئه ستۆ٠

*به ریزان(پ٠د٠ئیبراهیم ئه حمەد شوان، پ. ی. د. عەزیز گەردی، پ. ی. د. کەمال مه عروف ، پ. ی. د. دلشاد عەلی، پ. ی. د. سەردار گەردی، پ. ی. د. عادل گەرمیانی پ ٠ ی٠د٠هیمدادحوسێن ،پ٠ی٠د٠٠عوسمان دەشتی ،د. گالب، د. ئازاد هەمەوەندی، د. عومەر پەتی ).

# لیستی هێماکان

## کوردیەکان

**ب.** بەرگ.

پ. پرۆفسیۆر.

چ. چاپ.

خ. خول.

د. دکتۆر.

ڕ. ڕۆژنامە.

ژ. ژمارە.

گ. گۆڤار.

س. پ. سەرچاوەی پێشوو.

ل. لاپەڕە.

و. وەرگێڕان.

عەرەبیەکان

| | |
|---|---|
| ت. | ترجمه. |
| د.م.ط. | دون مكان طبع. |
| د.س.ط. | دون سنه طبع. |
| ط. | طبع. |
| ع. | عدد. |
| م. | مجله. |
| مج. | مجلد. |
| ص. | صفحه. |

# ناوەرۆك

## (بە ناوی خودای گەورە و میهرەبان)

## پێشەکی:

ئەم لێکۆڵینەوەیە کە بە ناونیشانی (ڕۆمانسیزم لە شیعری هێمن و محەمەدی نووری) دایە، هەوڵێکە بۆ تیشك خستنە سەر هەندێ باسی زیندوو و پێویست و گرنگ و، بزواندنی چەند وەتەرێکی هەستیار، لە هەمان کاتدا پەردەلادانە لەسەر چەند ڕوویەکی شاراوەی بەنرخ و بەهادار کە تا ئێستا فەرامۆش کراوە و، بەپێی پێویست لای لێ نەکراوەتەوە، ئەویش ڕۆمانسیزمە لە شیعر و ئەدەبیاتی کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا. بە تایبەتی لای ئەم دوو شاعیرە بەرزو هەست ناسکە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕەوشە ناهەموارەی کوردستانی ڕۆژهەڵات لە بوارە جۆراوجۆرەکانی ژیاندا لەگەڵ ئەو کۆت و بەندانەی بەهۆیتوندوتیژیی باری ڕامیارییەوە دروست بوون.

ڕۆمانسیزم وەك یەکێ لە ڕێبازە سەرەکییەکانی ئەدەبی، پانتایەکی گەورە و فراوانی لە شیعری جیهانیدا هەیە، هەروەها لە شیعری کوردیشدا لە کوردستانی ڕۆژهەلاَت لای هەندێ شاعیرانی وەك (هێمن و محەمەدی نووری) لە ئاست و پایەیەکی بەرزدایە٠

هۆکارەکانی هەڵبژاردنی ئەم بابەتەش، بۆ چەند خاڵێك دەگەڕێتەوە، گرنگترینیان ئەمانەن -:

١- زیندوویی و گرنگیی ئەم بابەتە و تامەزرۆییم بۆ شیعرە ناسك و تەڕ و پارا و ڕەسەنەکانی ئەم دوو شاعیرە.

٢- بۆ کردنەوەی دەروازەیەك بە مەبەستی زیاتر بایەخدان بە شیعری شاعیرانی کوردستانی ڕۆژهەلاَت. بەتایبەتی شیعری ڕۆمانسیزمی و پیشاندانی سیما و شەنگەستەکانی ڕۆمانسیزم لە شیعری ئەم شاعیرانەدا ٠

٣- هەبوونی بۆشاییەك لە بواری خستنەڕوو و نیشاندان و لێکدانەوەی بەرهەمە ڕۆمانسیزمییەکان لە شیعری شاعیرانی کوردستانی ڕۆژهەلاَتدا بە گشتی و، ئەم دوو شاعیرە بەتایبەتی.

دیارە ئەنجامدانی هەرکارێکی ئەدەبی بێ گیروگرفت نابێ و، ئێمەش بۆ نووسینی ئەم لێکۆڵینەوەیە تووشی هەندێ گرفت بووین، لەوانە کەمی سەرچاوە. چونکە ئەگەرچی دەربارەی

هێمن و شیعرەکانی زۆر نووسراوە و تەنانەت نامەی ماستەریشی لەسەر نووسراوە، بەڵام تا ئێستا زۆر کەم یان دەتوانم بڵێم هەر هیچ سەرچاوەیەکی ئەوتۆ لەسەر لایەنی ڕۆمانسیزم لە شیعرەکانی هێمن بەدی ناکرێ و نەخراوەتە ڕوو. مەگەر بە شێوەی چەند سەرەقەڵەمێك پێشان درابێ. وێڕای ئەمەش لەبارەی محەمەدی نوریی شاعیر زۆر بە کەمی نووسراوە، خۆ ئەگەر نووسرابێش، ئەوا لە کوردستانی ڕۆژهەڵات بووە و، لای ئێمە لە کوردستانی باشوور سەرچاوەکان زۆر زەحمەت دەست دەکەوێ یان پەیدا نەبوونی ئەو گۆڤار و ڕۆژنامە کوردیانەی لە کوردستانی ڕۆژهەڵات دەردەچن، لەوانەیە گەلێ بابەت و لێکۆڵینەوەی تێدابێ کە سوود و بایەخی زۆری هەبێت بۆ لێکۆڵینەوەکەمان، هەرچەندە ئەم گیروگرفتە لە ڕێی هەندێ نووسەر و دۆست چ لە کوردستانی ڕۆژهەڵات بێ یان لە کوردستانی باشوور تا ڕادەیەکی زۆر باش بەسەریاندا زاڵ بووین. هەروەها جیاکردنەوەی سروشتی دەقە ئەدەبیەکانی ئەو شاعیرانە کارێکی ئاسان نەبوو. هەرچەندە ڕۆمانسیزم بە یەکەم قۆناغی ئەزموونی شیعری شاعیران دادەنرێت کەوا هەوڵ دەدات شیعری خۆیان لەمەڕ خۆشەویستی و جوانیی ئافرەت و جوانیی سروشت و ئەشکەنجە و ئازاری مرۆڤ و ئاستی هەڵچوونی ناخەوەی مرۆڤ لە حاڵەتەکانی خۆشی و ناخۆشیدا دابڕێژن.

ناوەڕۆکی ئەم لێکۆڵینەوەیە بە شێوەیەکی گشتی لە سێ بەشی سەرەکی پێك هاتووە و، بەشییەکەم تەرخان کراوە بۆ لایەنی مێژوویی و تیۆریی ڕۆمانسیزم لە ئەدەبی ئەورووپی و کوردیدا. ئەم بەشە لە دوو تەوەرە پێك دێت:-

تەوەرەییەکەم بریتییە لە چەمك و پێناسەی ڕۆمانسیزم لە ئەدەبی ئەورووپیدا و لێرەدا هەوڵمان دا تیشك بخەینە سەر زاراوە و چەمك و پێناسەی ڕۆمانسیزم و بیرو بۆچوون و تێڕوانینەکانی نووسەرو شاعیران و فەیلەسوفەکان لەم بارەوە بخەینە ڕوو. لەهەمان کاتدا هۆکارەکانی سەرهەڵدان و خەسڵەت و تایبەتمەندیەکانی ئەم ڕێبازە پیشان بدەین، لە تەوەرەی دووەمیشدا. باسی ڕۆمانسیزمی کوردی دەکات و ڕۆڵی شاعیرە پێشەنگەکانی ڕۆمانسیزمی کوردی پیشان دەدات. لەوانە: مەولەوی و پیرەمێرد و شێخ نووری و گۆران و دڵدار و هەردی، بەڵام بەشی دووەم ئەوا باس لە بەهاکانی جوانی و ئازادی و سروشتی خود لای شاعیران هێمن و محەمەدی نووری دەکات و لە سێ تەوەرە پێك دێت:-

لە تەوەرەی یەکەمدا باسی بەهای جوانیی ئازادی لای ئەم دوو شاعیرە دەکەین کە جوانییەکانی سروشت و ئافرەت دەگرێتە خۆ. لەگەڵ ئازادیی نیشتمان و تاکەکەس. تەوەرەی

دووەم دەربارەی سروشتی خودە لای شاعیران هێمن و محەمەدی نووری و، لە چوارچێوەی نامۆیی و گەشبینی و ڕەشبینی وگەڕانەوەدا بۆ ڕابووردوو خۆی دەنوێنێ، بەلاّم تەوەرەی سێیەم دەربارەی هەندێ بنەما و بابەتی ڕۆمانسیزمە لای ئەم شاعیرانە.

بەشی سێیەم تیشك دەخاتە سەر بایەخی شێوازی شیعری و لە سێ تەوەرە پێك دێت، تەوەرەی یەکەم، باس لە زمانی شیعری لای ئەم شاعیرانە دەکات و، لە سنووری ڕۆمانسیزم دەخولێتەوە. لە تەوەرەی دووەمیشدا بایەخی مۆسیقای شیعری دەخاتە ڕوو. تەوەرەی سێیەمیش گرنگیی وێنەی شیعری لای ئەم شاعیرانە دەردەخات.

لە کۆتایشدا ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە و لیستی سەرچاوەکان و پوختەی نامەکەمان بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی خستۆتە ڕوو، بەو هیوایەی توانیبێتمان لە ڕێگای ئەو لێکۆڵینەوەوە خزمەتێکی بچووك بە گەلەکەمان بکەین.

## ڕێبازی لێکۆڵینەوەکە:

لەم لێکۆڵینەوەیەدا هانامان بردۆتە بەر هەردوو ڕێبازی شیکاری و ڕەخنەیی لە چۆنیەتی تێڕوانینی ڕەخنەیی خۆمان بۆ دەقی ئەو شیعرانەی دەستمان کەوتوون لە باخچەی شیعرەکانی هەریەکە لە شاعیرانی بە توانا و هەست ناسك، (هێمن)[*] و محەمەدی نووری. لە بەکارهێنانی

(*) (هێمن): ناوی سەید موحەمەد ئەمین شێخە لیسلامی موکریە، کوڕی سەید حەسەنی موکریە، لە بەهاری (١٣٠٠ه-١٩٢١) بە شەوی جێژنی بەراتێ لە گوندی لاچین نزیك (سابلاغ — مهاباد) لە دایك بووە. لە بنەماڵەیەکی دەوڵەمەندو ناودارو کورد پەروەر بووە. لەلای سەعید ناکام فێری ئەلف و بێ بووە، دوای لە قوتابخانەکانی (سەعادەت و پەهلەوی) شاری مهاباد چوار پۆل دەخوێنێ، پاشان باوکی دەینێرێتە خزمەتی مامۆستا فەوزی لە گوندی (کولیجە) بۆ ئەوەی درێژە بە خوێندن بدات، هەر لەم گوندەش بۆ یەکەم جار ئاشق بووە. شاعیر لە ژیانی سیاسی دا گەلێك قۆناغی گەورە و بەرزی بڕیوە لە زۆربەی گۆڤارو ڕۆژنامەکانی ئەو سەردەمە شیعرو نووسینی بلاّو کردۆتەوە. لە ڕۆژی (٢٥ خەزەڵوەری ١٣٢٥) ژیانی هاوسەری پێك هێناوە، شاعیر بۆ ماوەی دە ساڵ ئاوارەی عیراق بووە. دوای گەڕانەوەی بۆ زێدی خۆی بۆماوەیەکی زۆر سەرنووسەری گۆڤاری سروە بووە (١). خاوەنی چەندین بەرهەمی بەرزو نەمرە لە (١٨ نیسانی ١٩٨٦) کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی (بداغ سوڵتان) لە مهاباد نێژراوە(٢).

١- هێمن، تاریك و ڕوون، لە کوێ وە بۆ کوێ، لە بلاّوکراوەکانی بنکەی پێشەوا، ١٩٧٤، ل ٣.

ڕێبازی شیکاریدا بە بۆچوونێکی ئەکادیمیانە دەقی شیعرەکانمان خستۆتە بەر تیشکی شیتەڵکردنەوە و ڕاڤەکردن. ئەمەش زیاتر لە پێناو تێگەیشتن لە دەقی ئەو شیعرانەیە بۆ ئەوەی خوێنەران بەرچاو ڕوون بکەینەوە بۆ گەیشتنی پەیامە شیعرییەکانی شاعیران و پێکانی خاڵی مەبەست و ئامانجەکانمان.

هەروەها لەبەکارهێنانی ڕێبازی ڕەخنەیی لە نێو ئەم لێکۆڵینەوەدا هەوڵمان داوە بابەتیانە دەقە شعریەکان هەڵبسەنگێنین، بە مەبەستی خستنەڕووی چۆنییەتیی ڕەنگدانەوەی ڕێبازی ڕۆمانسیزم لە نێو ئەو دەقانە و بۆ ئەوەی بزانین کە ئایا تا چ ڕادەیەك شاعیرانی کوردستانی ڕۆژهەڵات لە بەرجەستەکردنی شەنگستەکانی ڕێبازی ڕۆمانسیزم لە نێو دەقە شعریەکاندا سەرکەوتوو بوونە.

## گرنگی لێکۆڵینەوەکە:

لە مێژوویەکی زۆر دوورو کۆنەوە میللەتی کورد لە تەواوی دەوران و دەسەڵاتی ڕژێمە یەك لەدوای یەکە داگیرکەر و زۆردارەکاندا بەتایبەتی لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە تاکۆ ئێستاش بە هەموو شێوەیەك چەوسێنراوەتەوە و دەنگ و ڕەنگی سەرکوت و کپ کراوە، نەیان هێشتووە هەست و نەستی دەربڕێ و بەهۆی گەلێك فشاری ڕامیاری و ئابووری و بوارەکانی ترەوە دەروازەکانی هزر و بیر و ئەندێشەکانی لێ داخراوە و قوفڵ دراوە و تەنانەت لە بچووکترین مافە سەرەتاییەکانی مرۆڤایەتیش بێ بەری کراوە، بە تایبەت شاعیرانی کوردستانی ڕۆژهەڵات زۆرکەم ئاوڕیان لێدراوەتەوە. بەهۆی توندوتیژیی ڕامیاریەوە ڕێگە نەدراوە هیچ لێکۆڵینەوەیەکی ئەدەبی لە کوردستانی ڕۆژهەڵات ئەنجام بدرێت، ئەمەش بۆتە ئاستەنگێك لەبەردەم زیاتر ئاشنابوونی میللەتەکەمان لەو بەشەدا بە ڕەوتی ئەدەب و شیعری کوردی لە کوردستانی ڕۆژهەڵات. هەروەها ئەم ئاشنانەبوونە هۆکارێکی دیکەیە بۆ کەمتر باسکردنی ڕەوتی شیعر و شاعیرانی کوردی لە کوردستانی باشووردا (کوردستانی — عیراق)، ئەم دوو لایەنە گرنگیی لێکۆڵینەوەکەمان بۆ دەخاتە ڕوو، کەوا بە کۆششێکی تایبەت، زۆری خۆمان توانیمان هەندێ زانیاری لەبارەی ڕەنگدانەوەی ڕۆمانسیزم لە شیعری کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا بخەینە ڕوو. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ڕێبازی

---

٢- عوسمان دەشتی، (هێمن) لەربارەی ناوەڕۆکی سیاسی و کۆمەڵایەتی شیعرەکانی، بلاۆکراوەی بەدرخان، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل ١٩.

ڕۆمانسیزم باشترین و لەبارترین ڕێبازی ئەدەبیە بۆ خستنە ڕووی هەست و نەست و سۆزی شاعیر وەك مرۆڤێکی خاوەن هەستێکی ناسك. ڕاستە تا ئێستا نامەی دیکە دەربارەی ئەم ڕێبازە لە شیعر و ئەدەبیاتی کوردی لە کوردستانی باشوردا پێشکەش کراوە، بەلاّم خۆ لەقەرەدانی ئەدەبی کوردی لە کوردستانی ڕۆژهەلاّتدا لەبەر ئەو هۆکارانەی باس کران، ئەستەم بووە و کەم کەس شانی وەبەرداوە، بۆیە بە پێویستم زانی لێکۆلّینەوەکەم لەم بارەیەوە پێشکەش بکەم.

## سنووری لێکۆلّینەوەکە:

ڕۆمانسیزم وەك ڕێبازێکی ئەدەبی لە نێو شیعری کوردیدا ڕەنگی داوەتەوە، وەك دیاردەیەکی زەق و بەرزیش لە نێو شیعری کوردی لە کوردستانی ڕۆژهەلاّتیشدا بەرچاو دەکەوێ. چونکە ڕۆمانسیزم باشترین ڕێبازی ئەدەبیە بۆ بەرجەستەکردنی هەستی ناوەوەی شاعیر. ئێمەش لەم لێکۆلّینەوەیەدا هەولّمان داوە تەنیا ڕێبازی ڕۆمانسیزم وەربگرین لە نێو شیعری کوردیی شاعیرانی کوردستانی ڕۆژهەلاّتدا بۆیە سنووری لێکۆلّینەوەکەمان لە ڕووی جوگرافیەوە کوردستانی ڕۆژهەلاّت دەگرێتەوە، هەروەها لە ڕووی ڕێبازەوە تەنیا ڕێبازی ڕۆمانسیزم بەخۆوە دەگرێت.

## ئامانجی لێکۆلّینەوەکە:

ڕۆمانسیزم وەك ڕێبازێکی ئەدەبی بەکاردانەوەی قوتابخانەی کلاسیزم دادەنرێت و، ئەم ڕێبازە نەك تەنیا لە ئەدەبی ئەورووپیدا، بەلّکو لە ئەدەبی گەلانی تریشدا ڕەنگی داوەتەوە، هەروەك چۆن لە ئەدەبیاتی کوردیشدا خۆی نواندوە و، لە ڕۆژهەلاّتی کوردستانیشدا بە هەمان شێوە هاتۆتە کایەوە و نشوونما و گەشەی کردوە.

ئەم ڕێبازە سەرەتا لە ولاّتانی ئەورووپا بە شێوەیەکی شۆڕشگێڕانە دەرکەوت، پاشان بایەخی بە خەم و پەژارە و تەنیایی و گۆشەگیری و خۆشەویستی و نامۆیی و باری ناخەوەی مرۆڤ دا. ئێمەش لەم لێکۆلّینەوەیەدا چەند تیشکێك دەخەینە سەر شەنگەستەکانی ئەم ڕێبازە و چۆنییەتی ڕەنگدانەوەی لە شیعری کوردیدا بە تایبەتی لە شیعری شاعیران (هێمن) و

(محەمەدی نووری)* لە کوردستانی ڕۆژهەلاٌتدا. کەواتە ئامانجی لێکۆلٌینەوەکەمان پیشاندان و خستنە ڕووی شەنگستەکانی ڕێبازی ڕۆمانسیزمە لە ئەدەبی ئەوروپایی بە شێوەیەکی گشتی و لە ئەدەبی کوردیدا بە شێوەیەکی تایبەتی، هەروەها چۆنییەتی ڕەنگ دانەوەی ئەم ڕێبازە لە نێو شیعری کوردیدا. بە تایبەتی لە لای شاعیرانی کوردستانی ڕۆژهەلاٌت ئامانجێکی دیکەی لێکۆلٌینەوەکەمانە.

---

* (محەمەدی نوری): ناوی محەمەدە کوڕی میرزا ئەبوبەکری، کوڕی حەمە زیندین بووە لە ١٥ ڕەشەمەی (١٣٠٥ هـ - ١٩٢٦ز) لە گوندی گلۆلاٌنی نزیك شاری مهاباد، لە بنەمالٌەیەکی هەژار و ئاینی و کورد پەروەر لە دایك بووە. لەلای باوکی خوێندن و نووسین فێربووە، پاشان دەچێتە خزمەت (مەلا عەبدولوەهاب) و زانستی ئاینی و عەرەبی فێردەبیٚ لە سالٌی (١٣٢٠ هـ) لە قوتابخانەکانی ئایینی دوایین پلەی دەورەی زمانی خوێندووە. بەمەش شارەزاییەکی باشی لە زمانی عەرەبی و فارسی پەیدا دەکات. شاعیر هەر مێرد مندالٌ بووە کاتیٚ باوکی کۆچی دوایی دەکات، بۆیە دووچاری هەژاری و کوێرەوەری و دەربەدەری و کارەساتی زۆر دەبێتەوە. جگە لەمە شاعیر تێکەلٌی سیاسەت دەبیٚ و بۆماوەیەك ئەندامی کۆمەلٌەی (ژ. ك) بووە. لە ڕۆژنامەکانی نیشتمان و کوردستان و گەلاوێژ، شیعری بلاٌو کردۆتەوە. لە سالٌی (١٣٢٧هـ - ١٩٤٨ ز) ژیانی هاوسەری پێکهێناوە. پیاوێکی ناودار و دنیا دیدەیە و بەمەلایەتی و کاری میرییەوە زۆربەی گوند و شارەکانی کوردستانی ڕۆژهەلاٌت گەڕاوە. سالاٌنی (١٣٤٠ هـ - ١٣٥٣ هـ) چەندین کارو فەرمانی گرنگی لە دامودەزگاکانی ولاٌت بەڕێوەبردووە. ئەندامی ئەنجومەنی (ویلایەتی و ئەیالەتی) بووە. دواجار بۆتە ئەندامی (مەجلیسی شوڕای میللی) واتە (ئەندامی پەرلەمانی ئێران) شاعیر هاوڕیٚ و دۆستی نزیکی هێمن و هەژارو هێدی و ئاوات و سوارەی ئیلخانی زادە بووە. شاعیر چوار کوڕو سیٚ کچی هەیە و ئێستا دانیشتووی شاری بۆکانە و لەوێدا ژیان بەسەر دەبات و خاوەنی دیوانێکی شیعری چاپکراوە ١.

١- محەمەد نوری، شەوێك و خەوێك، بستووی ژیان، پێداچونەوە و ئامادەکردنی سەلاٌحەدین ئاشتی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٦، ل٥.

# تەوەرەی یەکەم
# ڕۆمانسیزم لە ئەدەبی ئەورووپیدا

## زاراوەی ڕۆمانسیزم:

زاراوەی ڕۆمانسیزم (Romanicism) لە ئەدەبیاتی جیهانیدا گەلێك پێناسە و ناوی تایبەتیان بۆ بەکار هێناوە، لەوانە فەڕەنسیەکان (ڕۆمانتیزم – Romantisme) وە ئینگلیزەکانیش (ڕۆمانتیسیزم – Romanticism)، هەروەها ئەڵمانەکان (ڕۆمانتیك –)[1] (Romantic.

(ڕۆمانسیزم – Romanicism) بە ڕێبازەکە دەگوترێ، بەڵام (ڕۆمانتیك – Romantik) ئاوەڵناوە، هەروەها بە داهێنانی سەر ڕێبازەکە دەگوترێ، وشەی ڕۆمانسیەت هەمان واتای ڕۆمانسیزم دەگەیەنێ)[٢].

((ڕەسەنایەتیی وشەی ڕۆمانسیزم دەگەڕێتەوە بۆ وشەی فەڕەنسی (ڕۆمانس – Romance) کە بە واتای چیرۆك یان ڕۆمان دێت، جا ئەگەر ڕیالیستی یان خەیاڵی بێت)[٣]. واتە ((وشەی (Roman) لە سەردەمی چاخەکانی ناوەڕاستدا بە چیرۆکە ترسناکەکان دەوترا، پاشان واتاکەی فراوان بوو، وێنەی شیعری و ڕووداوە خوڕافیەکان و چیرۆکە ئەفسانەییەکانی گرتەوە))[٤]. هەروەها ((بەو کارانە یان ئەو کتێبانە دەوتران کە تایبەت بوون بە خەیاڵ و ئەندێشە و ئاماژە بۆ کتێبی میللی))[٥].

---

(١) د. محمد غنيمى هلال، الرومانتيكية، الطبعة السادسة، دار العودة، بيروت، ١٩٨١، ص ٥.

(٢) د. فەرهاد پیربال : ڕێبازە ئەدەبیەکان، چاپی دووەم چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ٥١.

(٣) د. نبيل راغب: المذاهب الأدبية من الكلاسيكية الى العبثية، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ١٩٧٧، ص ٢٤.

(٤) د. شفيق بقاعي، د. سامي هاشم، المدارس والأنواع الأدبية، منشورات المكتبة المصرية، صيدا، بيروت، ١٩٧٩، ص ٥٦.

5- J. A.cuddon, Adictonary of Litravy terms, Hazell Watson and viney Limited, 1979, P583.

((جان. جاك. ڕۆسۆ- J.j Rousseau) (1712 – 1778 یەکەم کەس بووە وشەی ڕۆمانتیکی بەکار هێناوە بۆ وەسف کردنییەکێك لە دەریاچەکانی سویسرا))[1]. ((گریسۆن- Grierson) دەڵێ: ڕۆمانسیزم وەکو کلاسیك زاراوەیە نەك هەوڵ بۆ ناساندنی هەر شتێك. هەروەها (لۆڤجۆی – Lovejoy) دەڵێ: وشەی ڕۆمانسیزم بۆ ئەوە هاتووە، چەندین واتا ببەخشێ، بەلاّم خودی وشەکە هیچ واتایەك بە دەستەوە نادات))[2]. نووسەر و ڕەخنەگری ئەڵمانی (فردریك شلیگل – Fridrich Shlegel) بە یەکەم کەس دادەنرێت کە وشەی

ڕۆمانسیزم (Romantich)ی بەکار هێنا لە دەقی ئەدەبیدا. (مەدام دی ستیڵ- Madame de stael) یەکەم کەس بوو زاراوەی (Romantique) ڕۆمانتیکی لە دەقە ئەدەبیەکاندا لە فەرەنسا بلاّو کردەوە[3].

سەرهەڵدانی زاراوەی ڕۆمانسیزم لە ئەوروپادا دیرۆکێکی کۆنی هەیە و ((یەکەم مێژووی زاراوەی ڕۆمانسیزم لە ئەڵمانیا بوو لە ساڵی (١٨٠٨)دا و، لە فەرەنساش لە ساڵی (١٨١٨)دا بوو. بەلاّم لە ساڵی (١٨٠٢)ەوە ئەڵمانیا پێشەنگ بوو لە بەکارهێنانی وشەی ڕۆمانسیزم، دوای ئەویش فەرەنسا لە ساڵی (١٨١٦)دا، پاشان ئیتاڵیا لە ساڵی (١٨١٦)دا دواتر ئینگلترا لە ساڵی (١٨٢٣)[4]. ئەم قوتابخانەیە بۆ یەکەم جار لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا لە ئەڵمانیا هاتە کایەوە))[5].

دوای ئەوەی زاراوەی ڕۆمانسیزم لە ئاسمانی ئەدەبی دا گەشایەوە و، ڕێبازەکەش پەلوپۆی هاویشت و ڕەگ و ڕیشەی بە هەموو لایەکدا بلاّو بۆوە و، بە تەواوی تۆکمە و بەهێز و پتەو بوون. گەشەسەندن و پێشکەوتنی گەورەی بەخۆوە دی، لە ئەدەبیاتی جیهانیدا زاراوەی ڕۆمانسیزم گەلێك ناوی جۆراوجۆری بەخۆوە دی، بە تایبەتی لە ئەدەبیاتی کوردیدا. ئەوەی

---

(١) د. انطونيوس بطرس، الأدب (تعريفه، وأنواعه، مذاهبه)، المؤسسة الحديثة للكتاب، طرابلس، لبنان، ٢٠٠٥، ص ٢٦٧.

2- Lilin R.Furst, Romanticism in prespactive, second Ediction, 1979, P2.

3- J. A. cuddon Adictionary of litary terms, p 583.

(٤) د. سالم احمد حمداني، مذاهب الأدبى الغربي ومظاهرها في الأدب العربي الحديث، مطبعة العليم العالي في الموصل، ١٩٨٩، ص ٨٥.

(٥) ئەحمەد سالار، ڕێبازە سەرەکیەکانی ئەدەب و هونەر، چاپخانەی (دار الحرية) بەغدا، ١٩٨٨، ل ١٠٣.

لێرەدا جێی سەرەنج و ئاماژەپێکردنە، بەکارهێنانی هەمە جۆری و فرەناوی و شێوازگەلێك بۆ ئەم زاراوەیە بۆ تەنیا مەبەستێك زۆر جار وای کردوە، سەر لە خوێنەر بشێوێنێ. لەم بارەیەوە دکتور فەرهاد پیربالْ دەلّێ: ((وشەی ڕۆمانسی واتای ڕۆمانتیك (نووسەر و هونەرمەندی ڕۆمانتیك) دەگەیەنێ....... عەرەب و کورد دایان هێناوە))[1].

کەچی زۆر جار چەند وشەیەکی جیا جیا بۆ ئەم زاراوەیە بەکار هاتووە ((جاری وا هەیە تەنیا یەك نووسەر یان یەك وەرگێڕ لە یەك بابەتدا وشەکانی (ڕۆمانسی) و (ڕۆمانسیزم) و (ڕۆمانتیك)ی بەکار هێناوە کە ئەمەش شتێکی زانستی نییە))[2]. بۆیە بە بۆچوونی منیش وشەی ڕۆمانسیزم نزیکتر و شیاوترە بۆ ئەم ڕێبازە لە ئەدەبی کوردیدا، چونکە مۆرکێکی کوردانەی هەیە.

## چەمك و پێناسەی ڕۆمانسیزم:

لە بنەڕەتدا ڕۆمانسیزم نیشانەی کۆمەڵێك هەڵوێستی ئەدەبی و هونەری بوو کە لە سالآنی کۆتایی سەدەی هەژدەهەم سەری هەڵدا، واتە دوای شۆڕشی فەرەنسای سالّی ((١٧٨٩، کە داوای سەرخستنی سۆز و خەیالّی بەسەر هۆشدا کرد، هەر لە سەرەتاوە ڕۆمانسیزم وەك شۆڕشێك لە دژی کلاسیکیەت هاتە کایەوە و، ئەو کۆتوبەندانەی تێك شکاند کە کلاسیکیەکان چەسپاندبوویان بەسەر ئەدەب و هونەر و نەهێشتنی ئەو قالّبانەی شیعری کەلەپچە کردبوو. سنورەکانی بەزاند و یاساکانی ڕەت کردەوە، جاڕی ئازادیی ئەدەبی دا، بۆ والآکردنی دەروازەکانی داهێنانی بوارەکانی ئەفراندن))[3].

((ڕۆمانسیزم دەیویست خۆی لە دوو دوژمن ڕزگار بکات، یەکێکیان ئەو بیروباوەڕ و هزرە و فەلسەفییەی کە لە سەدەی هەژدەهەمدا هەبوو، ڕێڕەوێکی کوشندە بوو بۆ حەماسەت و هاندان، ئەوەی تریان ئەو گەرموگوڕییە بوو نیوکلاسیك پێوەی خەریك و خۆشحالّ بوون لە

---

(١) فەرهاد پیربالّ، ڕێبازە ئەدەبیەکان، ل ٥١.

(٢) ئیدریس عبدولاّ، قۆناغی پێش ڕۆمانسیزمی شیعری کوردی (١٨٥١- ١٩٢١) چاپییەکەم، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٦، ل ٦١.

(٣) مجد محمد الباكير البرازي، في النقد الأدبي الحديث، الطبعة الأولى، مكتبة الرسالة الحديثة، عمان، اردن، ١٩٨٦، ص ١٨٩.

سەدەی حەڤدەهەمدا))[1]. ئەوە بوو ((لە دوای شۆڕشی فەرەنسا لەدەست دانی جیهانی بورژوازی لەم وڵاتەدا شەپۆڵی ڕۆمانسیزم زوو دەستی پێکرد، بە خورپەوەرگرتن لە ئەندێشەو دیدگای خەونەکان و جیهانی سوارچاکی))[2].

هەندێك لە ڕەخنەگران ئەو ماوەیەی کە ڕۆمانسیزمی تێدا بەدەرکەوت و بلاو بۆوە، بە نەخۆشیی سەردەم (مرض العصر) وەسفی دەکەن، ئەمەش تەنیا لە بواری ئەدەبدا نەبوو، بەڵکو کاریگەریەکەی هەموو سەدەکەی گرتەوە[3]. نەخۆشیەکانی سەردەم بەو بارودۆخە دەروونییە دەوترێت کە لە پەڕاوێزبوونی تاکەکەسدا لەدایك دەبێ، بۆ سەرکەوتنی لە نێوان توانا و هیوا لە نێوان دابڕان لە خۆشەویستی و حەزێکی زۆر بۆی، ئەم دژایەتیانە تاکەکەس دوورەپەرێز دەکا، تاکو سروشتیشی دەگۆڕێ و لە هیوا و ئارەزووەکانی دادەماڵرێ، یاخود گۆڕینی سروشتی شتەکانە. بۆ ئەوەی ببێتە وەلامێك بۆ حەز و ئاواتەکان))[4].

نووسەرە ڕۆمانسیەکان لە سەرەتادا بە تایبەتی نووسەرەکانی سەردەمی (وردز ورث) بیریان لەوە نەکردەوە کەسەر بە ڕێبازی ڕۆمانسیزم بن، چونکە ڕێبازی ڕۆمانسیزم تا ماوەیەکی زۆر بەتەواوی نەناسرابوو، بۆیە هەر نووسەرێك وەك قوتابخانەیەکی ئەدەبیی سەربەخۆ سەیر دەکرا[5]. ڕۆمانسیزم داوای ڕوخاندنی یاسا و دابونەریتی کۆن دەکات و جەخت لەسەر خودو گوزارشت لە خەون و کابووسی نادیار و وێنە و گۆڕینی ئەدەب بۆ چرایەکی ئارام دەکات[6]. بۆیە هەمیشە ((ڕکابەری سوڵتانی هزر دەکەن و، خۆ دەدەنە دەست هەست و سۆز و دڵ، کە شوێنی هەست دەبێتە کانیاوی خورپە))[7]. بەم شێوەیە دەبینین

---

(١) ف.ل. سولنيه، الروماطيقية في الأدب الفرنسي، ترجمة: احمد دمشقية، الطبعة الأولى، منشورات عويدات، بيروت، لبنان، ١٩٦٠، ص ٤٣.

(٢) د. كمال عبيد، فلسفة الأدب والفن، الدار العربية للكتاب، ليبيا، تونس، ١٩٧٨، ص ٥٢.

(٣) د. عزالدين اسماعيل، الأدب والفنون، الطبعة السادسة، مطبعة دار الفكر العربي، ١٩٧٦، ص ٥٢.

(٤) د. الطاهر احمد مكي، الشعر العربي المعاصر، روائعه ومدخل قراءته، مطبعة دار المعارف، مصر، ١٩٨٠، ص ٤٦.

5- Long, Adams, the Nortor Anthology of. Folume 2, sixth Edition, Norton, London, P4.

(٦) د. نبيل راغب المذاهب الأدبية من الكلاسيكية الى العبثية، ص ٢٧.

(٧) د. شفيق بقاعي، د. سامي هاشم، المدارس الأنواع الأدبية، ص ٥٧.

((ڕۆمانسییەکان لە فەلسەفەی لاساییکردنەوەی ((ئەرستۆ)) یاخی بوون، وتیان ئەدەب بە گشتی و شیعر بە تایبەتی لاساییکردنەوەی ژیان و سروشت نییە بەڵکو خولقاندنە))[1]. هەروەها ((بریتییە لە بەرز بوونەوەی ڕۆح تا ئەو ئاستەی بە خۆی دەگات و، لە خۆیدا ئەو شتە بەدی دەکات کە پێشتر لە جیهانی هەستیدا ئاواتەخوازی بوو))[2]. ((پێویست بوو لەسەر ڕۆمانسیزم ژیربێژی پێکهاتە تێکبشکێنێ، وەك چۆن ژیربێژی وەسفی تێك شکاند))[3]. هەمیشە گرنگی بە هێنانەوەی ئارەزوەکان دەدات بۆیە گەلێك شێوەی جیاوازی وەرگرت، وەك داستانی و شوانکاری و نامۆیی و جەفەنگ و خەون و منداڵی و خۆشەویستیی بەهێز و تەواو[4]. سەرەڕای ئەمانەش ((وەك بەرهەمێکی پێشەنگ بەرچاو دەکەوێ و پشت بە ئەندێشە و هەست و سۆز دەبەستێ و، جڵەو بۆ ئەسپی باڵداری خەیاڵ شل دەکات و، لە جیهانی پڕ ئەفسوناویی خویدا تاوی دەدات[5]. ((بەرهەمی ڕۆمانسیەکان لە خەون و خەیاڵەوە سەرچاوە دەگرێت و، مەینەت و دەردی خۆی و کۆمەڵەکەی دەردەبڕێ و، لە بەسەرهات و ڕووداو و کارەساتی ناخۆش و دڵتەزێنی کۆمەڵ سوود وەردەگرێ))[6].

وێڕای ئەمەش ((یەك جۆری نییە، یەك سەرچاوە و جۆگەی نییە، جۆگەکان بێ بنن، هێزەکان بێ کۆتان، ڕواڵەتەکان لە ژمار نایەن بەقەدەر جیاوازیی رۆح، تەماکان و خولیای

---

(١) د. محمد مندور، الأدب ومذاهبة، دار نهظة مصر للطبع والنشر، الفجالة – القاهرة، بدون سنة، ص ٦٩.

(٢) د. کمال میراودەلی، فەلسەفەی جوانی و هونەر، چاپی دووەم، خانەی چاپ و بلاۆکردنەوەی قانع، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ٨٢.

(٣) ر. م. ألبيرس، الأتجاهات الأدبية الحديثة، ت: جورج طرابيشي، منشورات عويدات، ط ٢، بيروت، مارس، ١٩٨٠، ص ٤٣.

(٤) جيلين بير، ترجمەی: سودا بە دقيقى، چاپی دوم، نشر مرکز، تهران، ١٣٨٣، ص ١٨.

(٥) د. حمید عزیز، ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە جیهانی فەلسەفەدا، گ، ڕامان، ژ ١٢١، ٢٠٠٧، ل ١٠٥.

(٦) سەید قادر سیادەت، باسی ئەدەبی، گ. سروە، ساڵی سییەم، ژ ٨، ٤٤١٣ (١٩٨٧)، ل ١٢.

ڕۆمانسیەکان بەرین و بەربلاْون))[١]. بۆیە دەتوانین بلێین ئەم ڕێبازە ((بینینی هەبوونە لە ڕێی خودەوە بۆیە بەهای مرۆڤ و مافی لە ئازادی دووپات دەکاتەوە))[٢].

دەتوانین بلێین پێشکەوتن و پەرەسەندنی ڕۆمانسیزم لە دوو سەردەمدا دەناسرێ:

١. سەردەمی ڕەتکردنەوەو یاخیبوون.

٢. سەردەمی گۆشەگیری و پەنا بردنە بەر سروشت[٣].

تێڕوانینەکان دەربارەی چەمکی ڕۆمانسیزم گەلێك بلاْوە و بە چەندەها چەمك پێناسەی جیاواز ناسراوە، لەم بارەیەوە (فردریك شلیگل) بۆ براکەی نووسیوە و دەلْێ:- (لە ١٢٥ لاپەڕەدا ئەم هەولاْنەم کۆ کردەوە، کە لە بارەی ڕۆمانسیزمەوە کراوە)[٤]. هەروەها لە هەمان کاتدا ((هەندێك لە ڕەخنەگرانی جیهان لە سالْی ١٩٢٥دا وتیان، زیاتر لە (١٠٠) پێناسەی جۆراوجۆر بۆ ڕۆمانتیك کراوە))[٥].

هەر ئەمەش وای کردووە کە نەتوانرێ ڕۆمانسیزم پاوان بکرێ و، هیچ سنوورێکی بۆ دابنرێ. ئەمەش لە خەسلْەت و تایبەتمەندیە دیارەکانی ڕۆمانسیزمە کە ((تا ئێستاش لە قۆناغی درووستبوون و پێکهاتن دایە، ئەمەش لە ڕاستیدا کرۆکی ڕۆمانسیزمە و لە جوداکارییە گەورەکانە، لەبەر ئەوەی هەردەم لە پێشکەوتنە و کۆتایی و تەواوبوونی نییە و هیچ تیۆرێکیش ناتوانێ چارەسەرێکی وا تەواو ڕەوانی بکات، کە هیچ پاشماوەیەك لە دوای خۆی بەجێ نەهێلْێ))[٦].

---

(١) د. کمال میراودەلی، هەردی و ڕۆمانسیزمی خود، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، سلێمانی- لندن، ٢٠٠٧، ل ٣٦.

(٢) د. ساسین عەساف، وێنەی شیعری لە ڕێبازی ڕۆمانتیکیەت دا، و: عادل گەرمیانی، گ. ڕامان، ژ ٣٧، ١٩٩٩، ل ١٧٤.

(٣) يمنى العيد، الدلالة الأجتماعية لحركة الأدب الرومانطيقي في لبنان بين الحربين العالميتين، دار الفارابي، بيروت، ١٩٧٩، ص٧٢.

(٤) د. محمد غنيمي هلال، الرومانتيكية، ص ٧.

(٥) ئومید ئاشنا، دەربارەی ئەدەب و مێژوو، چاپخانەی واناز، سلێمانی، ٢٠٠١، ل ٨٦.

(٦) ليليان فريست، الرومانتيكية، ت: عدنان خالد، من منشورات المركز الثقافي الأجتماعي، بغداد، ١٩٨٧، ص ٧١.

هەر بۆیە زۆربەی شاعیر و نووسەرانی ڕۆمانسیزم بە شێوەیەکی جیاواز لەوەی تر پێناسەی ڕۆمانسیزم دەکات و تێڕوانین و لێکدانەوەی خۆی دەردەبڕێت وەك لای هەندێك لەو شاعیرو نووسەر و بەناوبانگانەی خوارەوە دەردەکەوێت:-

- (ڕۆسۆ- Rousseau) دەڵێ: ((ڕۆمانسیزم گەڕانەوەیە بۆ سروشت))[١].
- (گۆتە- Goethe) دەڵێ: ((کلاسیکیەت لەشساغییە، ڕۆمانسیزم نەخۆشییە))[٢].
- (ڤیکتور هۆگۆ- Victor Hugo) دەڵێ: ((ڕۆمانسیزم لیبرالیەتە لە ئەدەب))[٣].
- ((وردز وۆرث- Words worth)) دەڵێ: ((ڕۆمانسیزم لافاوێکی خۆیی سۆزە بەهێزەکانە))[٤].
- ((هاینە- Heine)) دەڵێ: ((ڕۆمانسیزم زیندوکردنەوەی ژیان و بیری سەدەکانی ناوەڕاستە))[٥].
- ((ستاندال- Standal)) دەڵێ: ((ڕۆمانسیزم هونەری ئەمڕۆیە، بەڵام کلاسیکیەت هونەری دوێنێیە))[٦].
- ((جۆرج صاند- Gorge Sand)) دەڵێ: ((ڕۆمانسیزم سۆزە لە بڕی هۆش، دڵە لە بری سەر))[٧].
- ((بڕونتیر- Brontere)) دەڵێ: ((ڕۆمانسیزم بزووتنەوەیەکە هەموو ئەو شتانە بە پیرۆز دەزانێ، کە کلاسیکیەت ڕەتیان دەکاتەوە))[٨].

---

(١) لیلیان فریست، هەمان سەرچاوە، ص، ١٥.

(٢) امیه حمدان، الرمزیة والرومانتیکیة في شعر اللبناني، منشورات وزارة الثقافة والأعلام، العراق ١٩٨١، ص ٢٢.

(٣) د. حامي مرزوق، الرومانتیکیة والواقعیة في الأدب، دار النهضة العربیة للطباعة والنشر، بیروت، ١٩٨٣، ص ١٨.

(٤) د. احسان عباس، فن الشعر، الطبعة الرابعة، دار الشروق للنشر وتوزیع، عمان، اردن، ١٩٨٧، ص ٢٩.

(٥) رۆبرت جلكنر وجیرالد، الروماتیكیة، ما لها وما علیها، ت، احمد حمدى محمود، مطبعة الهیئة المصریة، ١٩٨٦، ص ١٣٤.

(٦) نفس المصدر،، ص ١٣٤.

(٧) لیلیان فیرست، الرومانتیكیة، ت: عدنان خالد، ص ١٦.

(٨) نفس المصدر، ص ١٥.

- ((پۆل ڤاليری- Pole Valiry)) دەڵێ: ((هەر نووسەرو ئەدیبێك بیەوێ پێناسەیەكی تایبەت بۆ وشەی ڕۆمانسیزم بدۆزێتەوە، پێویستە ئەو كەسە بیر و زەینێكی نائارامی هەبێت))[1]

- ((جۆن بیر- Jon Beer)) پێی وایە كە ڕۆمانسیزم: ((بریتییە لە وەڵام بۆ كۆمەڵێك ئاریشەی گشتی، نەك چەند بیروباوڕێكی گشتی))[2].

- ((نیلسۆن- Neilson)) دەڵێ: ((ڕۆمانسیزم ئەو خەیاڵەیە كە پێچەوانەی هۆش و ڕاستییە))[3].

## سەرهەڵدانی ڕۆمانسیزم لە ئەدەبی ئەورووپیدا:

ڕۆمانسیزم لە ڕووی ئەدەبییەوە شەپۆلێك بوو، لە سەدەی هەژدەهەمدا لە ئەورووپا پەیدا بوو، لە سەرەتادا لە ئینگلتەرە و ئەلمانیا، پاشان لە سەدەی نۆزدەهەمدا فەرەنسا و ئیتاڵیا و ئیسپانیا و وڵاتانی دیكەی گرتەوە. هۆیەكانی سەرهەڵدانی ڕۆمانسیزم لە ئەورووپا دەگەڕێتەوە بۆ كارتێكردنی ئەدەبیاتی ئینگلیزی و ئەلمانی. ((شاتو بریان)) كە نووسەرێكی بەناوبانگی فەرەنسی بوو لەژێر كاریگەریی ئەدەبی ئینگلیزیدا كۆمەڵێك بەرهەمی بەرزی وەرگێڕایە سەر زمانی فەرەنسی. هەروەها ((مدام دی ستایل)) لە ساڵانی (١٧٢٦-١٨١٧) لە ژێر كاریگەری ئەدەبی ئەڵمانی كتێبێكی دانا بە ناونیشانی (دەربارەی ئەڵمانیا) كە باسی گیانی ڕۆمانسیزم دەكات لەو وڵاتەدا. هەروەها ((ڕۆسۆ)) داوای دەكرد كە مرۆڤ ئازاد بێت و كۆمەڵ بە هیچ كۆت و زنجیرێك نەبەسترێتەوە. بگەڕێتەوە بۆ باوەشی سروشت، بەڵام ئەو بیروباوڕانە بەتەنیا نەبوونە مایەی سەرهەڵدانی ڕۆمانسیزم، بەڵكو گەلێك هۆكاری تر هەبوو بۆ هاتنە كایەی ئەم ڕێبازە، گرنگترینیان ئەمانەن:

---

(١) د. محمد غنیمی هلال، ڕۆمانسیەت و ڕەگەزە ئەدەبیەكان، و: جەمال محەمەد، گ بەیان، ژمارە، ١٩٨٠، ل ١٩.

8- Stephe Pricket, the context of English Literature, the Romantics, London, P2

9- Lilan. R. Furst, Romanticism in pres Pective, p2.

١. کاریگەری و ئەنجامەکانی (سەردەمی ڕۆشەنگەری) لە سەدەی هەژدەهەمدا لە ئەڵمانیا بە ڕابەرایەتی هیگڵ و کانت. لە فەرەنسا بە ڕابەرایەتیی جان جاك ڕۆسۆ و دیدرۆ و مۆتیسکۆ لە ئینگلتەرا بە ڕابەرایەتیی چۆن لۆك[١].

٢. شۆڕشی فەرەنسی و جەنگەکانی ناپلیۆن و کۆنەپەرستیی پیاوانی کەنیسە و هاوپەیمانی پیرۆز و شۆڕش و ئامانجە جیاوازەکانی[٢].

٣. ڕابەرە یەکەمینەکان کە گرنگترینیان (ڕۆسۆ- Rosseau) خاوەنی کتێبی (هیلۆزی تازە) لە ساڵی ١٧٦١دا کە ئەم بەرهەمە بە زەقترین هۆکارەکانی ئەدەبی ئامادەکار دادەنرێ بۆ سەرهەڵدانی ڕۆمانسیزم، بە هەمان شێوە لە ئینگلتەرا ((تۆماس گرای)) لە ئەڵمانیاش ((گۆتە- Gothe)) ڕۆڵی گرنگیان بینیوە[٣].

٤. هەروەها پاش ئەوەی نووسەری بەناوبانگ (غالان)ی فەرەنسی چیرۆکەکانی هەزارویەکشەوی وەرگێڕا، کە لە کەش و هەوایەکی ئەفسانەیی و جیهانێکی سەیروسەمەرەدایە و کاریگەریی خۆی هەبوو[٤].

٥. دیاردەکانی گۆڕانکاریی پیشەسازی و ئامانجە ئابووری و کۆمەڵایەتی و فکرییەکان[٥].

٦. دۆزینەوەی شکسپیر لە ئەوروپا کە زیاتر لە سەد ساڵ پاش مردنی ون ببوو، ئەم چاکەیەش دەگەڕێتەوە بۆ (ڤۆلتیر)ی فەرەنسی کە سەرسووڕماو و کاریگەر بوو بە شانۆگەرییەکانی[٦].

٧. هۆکاری گەشت و سەیران و گەڕان کە ئامانج گەیشتن بوو بە زانیاریەکی پێوانەیی لە ئەدەب و هونەردا[٧].

---

(١) د. فەرهاد پیر باڵ، ڕێبازە ئەدەبیەکان، ل ٥٢.

(٢) د. عماد حاتم، مدخل الى تأريخ الأداب الغربية، الدار العربية للكتاب، ليبيا، تونس، ١٩٨٩، ص ٢٨٧.

(٣) د. انطونيوس بطرس، (الأدب، تعريفه، أنواعه، مذاهبه)، ص٢٧٠.

(٤) ايليا الحاوى، الرومانسية في الشعر الغربي والعربي، دار الثقافة، بيروت، لبنان، بدون سنة، ص ٣٧.

(٥) نفس المصدر، ص٣٧.

(٦) نفس المصدر، ص ٣٧.

(٧) انطونيوس بطرس، نفس المصدر، ص ٢٧١.

٨. دەرکەوتنی تەوژمی فەلسەفی ((النزعة الفلسفية)) کە هاوڕێ بوو لەگەڵ تەوژمی تاکی و سۆزی[١].

٩. بلاّوبوونەوەی جاڕنامەی گەردوونیی مافی مرۆڤ[٢]. دیارە جگە لەم هۆکارانە گەلێك فاکتەری تریش کاریگەریان هەبوو بۆ سەرهەڵدانی ئەم ڕێبازە. وەك شاعیرانی گۆڕستان و کۆت و بەندەکانی عەقلی کلاسیکیەت کە دەرگای لەسەر زۆربەی هیوا و ئاوات و خەون و خەیاڵەکانی مرۆڤ داخستبوو. وێڕای ئاڵۆزی و گرانبوونی بارودۆخی ژیانی مرۆڤ، زیادبوونی ئاریشەی کۆمەلاّیەتی و ئابووری و ڕامیاری و ئاینی. بە تایبەتی لە شارە گەورە و جنجاڵەکاندا.

## خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی ڕۆمانسیزمی ئەورووپی:

خەسڵەت و تایبەتمەندیەکانی ڕۆمانسیزم بریتییە لە ساکاریی شێواز و، گەڕانەوە بۆ ڕابردوو، بایەخدان بە سروشت و ئافرەت و هەست و سۆز و خەون و خەیاڵ و، بەکارهێنانی توخمەگەلی نائاسایی، گرنگیدان بە جوانی و سەربەخۆیی، بەلاّم((بیرۆکە زاڵ و گشتگیرەکانی ئەدەبی ڕۆمانتیك بریتین لە ڕزگاربوونی شاعیر و جەماوەر لە چەوسانەوە))[٣]. بەرجەستەکردنی ئازادیی ڕەها. گرنگترین خەسڵەت و تایبەتمەندیەکانی ڕۆمانسیزم ئەمانەی خوارەوەن:

١. وێڵبوون بەدوای ئازادیی ڕەهادا و بایەخدان بە خود و تاکەکەس و خۆخنکاندن لە دەریای هەست و سۆز و خەون و خەیاڵدا.

٢. خستنەڕووی ئاریشەکانی ژیان، وەك گۆشەگیری و نامۆیی و ڕەشبینی و نائومێدی و یاخیبوون.

٣. دوورکەوتنەوە لە هزر و بیر و کە تواریەت و پەنابردنە بەر خەیاڵی پڕداهێنان و ئەفراندن.

---

(١) نفس المصدر، ص ٢٧١.

(٢) د. سالم احمد الحمداني، مذاهب الأدب الغربي ومظاهرها في الأدب العربي الحديث، ص ٩٤.

(٣) بەختیار سەجادی، محەمەد مەحمود، فەرهەنگی شیکارانەی زاراوەی ئەدەبی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ١٩٤.

٤. گەڕانەوە بۆ باوەشی سروشت و شتی ئەفسوناوی و تەماوی و منداڵی و ڕابووردوو، بۆ کەمکردنەوەی هەڵچوونی دەروونی.
٥. بایەخدان بە ئاوازی وتاری و، وێنەی شیعری و، سادە و ساکاریی شێوازی شیعری و شکاندنی کۆت و بەندەکانی شیعری.
٦. یاساو بنەماکانی مەسیحیەت. دەرگایەك بوو بۆ گەیشتن بە پاکی و چاکە و بێتاوانی.
٧. لە شیعری ڕۆمانسیەت دا هەریەکە لە خۆشەویستی و سروشت و نیشتمان و ئافرەت و ئازادی، پانتایەکی گەورە و فرەاوانیان گرتووە.
٨. بەرگریکردن لە چەوساوە و بێدەسەلاَتان وەك بەرگری کردن لە مرۆڤ و گیانلەبەرو درەخت و گەلانی ژێر دەست و گەڕان بە دوای جیهانێکی نموونەییدا کە دادپەروەری و یەکسانی و خۆشەویستی باڵی بەسەردا کێشابێ[1].

## مەڵبەندە سەرەکییەکانی ڕۆمانسیزم لە ئەوروپا:

دوای ئەوەی ڕێبازی ڕۆمانسیزم زۆربەی ولاَتانی ئەوروپای گرتەوە، لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەهەمدا، ئەم ڕێبازە لە بیچمی تایبەتمەندیی هاوبەشدا خۆی نواند، بەلاَم تا ئەندازەیەك سودی لە نمونەکانی ڕابردووی نەتەوەیی وەرگرت، لە هەمان کاتدا هەوڵی دا گشت کۆت و بەندێك وردوخاش بکات کە بە کلاسیکیەتی دەبەستێتەوە، مەڵبەندە سەرەکییەکانی ڕۆمانسیزمیش لە ئەوروپا ئەمانەن:-

### ١- ڕۆمانسیزمی ئینگلیزی:

ڕۆمانسیزمی ئینگلیزی بۆ سەرەتاکانی سەدەی هەژدەهەم دەگەڕێتەوە ئەو کاتەی (شافتیسبری) کتێبی (الأخلاقیات)ی نووسی. کە تێیدا داوای کردبوو، وەك چاوگەی خێرو ڕەواو جوانی و بلیمەتی لە سروشت بڕوانن و باوەڕی پێ بکەن، دوای ئەوە ((جیمس تومسون)) لە کتێبی چوار وەرزەکان (الفصول الأربعة)دا ساڵی ١٧٣٠ قسەی لەسەر سۆزێکی ڕاسگۆیانە و سروشتێکی هەڵقوڵاو بەبێ هیچ کۆت و بەندێك کردوە.

---

(١) مجد محمد الباكير البرازي، في النقد الأدبي الحديث، ص ١٩٤.

پاشان دیوانە شیعریەکەی (ئەدوار یانك) کە ناسراوە بە (یادەوەریەکانی ئێوارە) لە ساڵی (١٧٤٤)دا زۆر وێنەی خەمۆکی و شەو و تاریکی و گۆڕستان و گەڕانەوە بۆ چاخەکانی ناوەڕاست دەگرتەوە[١].

ڕەخنەگر ((هارفارد- Herford) لە نووسینی سەردەمی (وردز وۆرث) ئەم هەڵسانگاندنە دەخاتە ڕوو:

١- کۆمەڵی وردز وۆرث:- (١٧٨٩-١٨٠٦)

جەخت دەکاتە سەر ناوچەکانی (ستوی غراسمیر) کە لە (کۆلیردیج و کراب و کلیر) پێك هاتبوون کە ئەمانە بە جەختکردن لە گونجانی نێوان سروشت و مرۆڤ دەناسرانەوە.

٢- کۆمەڵەی سکۆت (١٨٠٥-١٨١٠)

ئەم شاعیرانە دەگرێتەوە (کامبل و مۆر و سۆزی) کە هەموویان بە خۆزگەخوازییان بە سەدەکانی ناوەڕاست و جەختکردنیان لەسەر کولتور جیا دەکرانەوە.

٣- کۆمەڵەی شیلی (١٨١٨- ١٨٢٢)

ئەو شاعیرانە کە چێژ لە تەوژمی جیهانی وەردەگرن، نیشتەجێی ئیتالْیا و یۆنانن، وەك بایرۆن و کیتس، کەوا بە ڕەچەڵەك بەریتانین، کە هەمیشە بە پاڵنەرایەتیی سۆز بۆ جەختکردنیان لەسەر ئازادی و جوانی دەبینران.[٢]

((هۆکاری یەکەم لەسەرهەڵدانی ڕۆمانسیزمی ئینگلیزی شۆڕشی پیشەسازی بوو، کە هەموو ڕووی ژیان و تێگەیشتنەکانی لە وڵاتدا هەژاند))[٣].

((ڕۆمانسیزمی ئینگلیزی هەڵبەستی تازەی هێنایە کایەوە، چونکە ئەدەبی سەردەمەکانی پێشوو تام و چێژی لەگەڵ سەردەمە نوێیەکەدا نەدەگونجا لە هەمان کاتدا بۆ ژمارەیەکی کەم لە خەڵکی ئەنووسرا، تەنیا چینی فەرمانڕەواکان ئەم جۆرە ئەدەبەیان دەخوێندەوە))[٤].

---

(١) د. نبيل راغب، المذاهب الأدبية من الكلاسيكية الى العبثية، ص ٢٨.

(٢) ليليان فريست، الرومانتيكية، ت، عدنان خالد، ص ٧٣.

(٣) د. عماد حاتم: مدخل الى تأريخ الأدب الأوروبية، ص ٢٩٧.

(٤) جەمال محەمەد،ئەدەبی ڕۆمانتیکی ئینگلیزی و شۆڕشی (١٨١٦) وەرگێردراوە لە ئینگلیزیەوە، گ، ڕۆژی کوردستان،ژ٣٤،ل٤٩

بۆیە شاعیرانی ڕۆمانسیزمی ئەوکات ئەگەڕانەوە بۆ سروشت و سادەیی لە هەموو شتێکدا، (وردز ورث) یەکێکە لەو شاعیرە ڕۆمانسیە هەرە بەناوبانگانەی ئینگلتەڕا، کە بەچاوێکی (نوێ)وە سەیری مرۆڤ و سروشتی کردوە[(١)].

بۆیە زۆری نەبرد ((ڕۆمانسیزمی ئینگلیزی کەوتە قۆناغی پێگەیشتنەوە بە شیعرەکانی (تۆماس جرای) و (ولیم بلیك)و بە شیعرەکانی (وردز ورث و شیللی و کیتس و بایرون) گەیشتە لووتکە. وێڕای ئەم هەموو ڕەخنە و ململانێیەی لە نێوانیاندا هەبوو. بەلاّم سیمای بنچینەی ڕۆمانسیزم یەکیانی خستەوە[(٢)].

ئەمەش هۆکارێکی گرنگ و بەهێز بوو، بۆ ئەوەی ڕۆمانسیزم بە زیندوویی و بەردەوامی بهێلێتەوە.

## ٢- ڕۆمانسیزمی ئەلّمانی:

ڕۆمانسیزمی ئەلّمانی بە یەکێك لە ژێدەرە بنەڕەتی و سەرەکییەکانی سەرهەلّدان و پەرەسەندنی ئەم بزوتنەوە ئەدەبیە دادەنرێت لە ئەوروپادا.

لە ڕووی مێژووی پێکهاتەشەوە دابەش دەبێتە سەر دوو نەوەی جیاواز، کە یەکەمینیان ناسراوە بە ڕۆمانسیزمییەکەمینەکان، بەلاّم دووەم ناسراوە بە ڕۆمانسیستە پاشکەوتووەکان، زۆر جاریش پێیان دەوترێ ڕۆمانسیزمی تازە پێگەیشتوو کۆمەلّەی یەکەم کە بە یەکەمین کۆمەلّەی ڕۆمانسیزمی ئەوروپی دادەنرێت، مێژوەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سالّی **١٧٩٧** واتە سالاّنییەکەم لە سەدەی نۆزدەدا بەردەوام بوو کە بەرلین مەلّبەندەکەی بوو. پاشان گواسترایەوە بۆ شاری (جینا- Jena) لێرەوە ڕۆمانسیزم جارێکی تر بەردەوام بوو لە قۆناغی دووەمیدا[(٣)].

بەلاّم ((نەوەی دووەمی ڕۆمانسیزمی ئەلّمانی لە سالاّنی (١٨١٠-١٨٢٠)دا بەملاوە دەستی پێ دەکات لە شاری (هاید لبیرگ) بۆیە پێی دەگوترێ ڕۆمانسەتی هایدلبیرگی. بەم شێوەیە ڕۆمانسیزمی ئەلّمانی لە چارەگەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم بەملاوە هێزێکی زیاتری پەیدا

---

(١) محەمەد ئەمین هەورەمانی، چەند دێڕێك لە ئەدەبی ڕۆمانسی، گ بەیان، ژ ١٥، ل ٥.

(٢) د. نبيل راغب، المذاهب الأدبية من الكلاسيكية الى العبثية، ص ٢٨.

(٣) ليليان فريست، نفس المصدر، ص ٦٧.

کرد[1]. ((ڕۆمانتیکی ئەڵمانی بزوتنەوەیەکی ئەدەبی و هونەری بووە، شا مەبەستەکەی زیندووکردنەوەی شیعرو ئەدەب و هونەری سەدەکانی ناوەڕاست بوو))[2]. بەم شێوەیە نووسەران و شاعیران لەو سەردەمەدا ڕۆڵێکی گرنگیان بینی لە گەشەسەندنی ئەدەبی ڕەسەنی ئەڵمانیدا و لە نێوان سالأنی (١٨١٠- ١٨٢٠) ڕۆمانسیزمی ئەڵمانی جوانترین و بەرزترین بەرهەمەکانی پێشکەش کرد[3]. بەمەش توانیی بگاتە ئاستی هەرە بەرزی قۆناغەکانی ڕۆمانسیزم.

### ٣- ڕۆمانسیزمی فەڕەنسی:

لە ئەنجامی شۆڕشی فەرەنسا لە ساڵی (١٧٨٩)دا و پەیدابوونی ئیمبراتۆڕیەتی فەرەنسا، گۆڕانێکی گەورە لە بوارە جیاجیاکانی کۆمەڵگای فەرەنسی و چەمکی ئەدەبی فەرەنسیدا ڕووی دا، بە تایبەتی سیمای نامۆیی و دوورکەوتنەوە و گۆشەگیر بوون لە ژیاندا بووە دیاردەیەکی بلأو، بەشێکی زۆریش دووچاری دەردی سەردەم (مرض العصر) بوون. ئەمەش ڕێخۆشکەر بوو بۆ ئەوەی ڕێبازی ڕۆمانسیزم بێتە کایەوە ((ڕۆمانسیزمی فەرەنسی لە ژێر کاریگەریەتی ڕۆمانسیزمی ئینگلیزی و ئەڵمانیدا جووزەرەی دەرکرد، ئەو کاتەی کە شاتو برییان (١٧٦٨-١٨٤٨) بۆ یەکەمین جار بەرهەمی نووسەرە ئینگلیزەکانی، هەروەها (مەدام دو ستایل) بەرهەمی نووسەرە ئەڵمانییەکانی وەرگێڕایە سەر فەڕەنسی، جگە لەوەی بەرهەمەکانی ژان ژاك ڕۆسۆ خۆشی کاریگەرییان هەبوو))[4]. چونکە فەلسەفەی ڕۆسۆ و هاوڕێییەکانی کە داوای ئازادی و تاکەکەسی و گەڕانەوە بۆ باوەشی پاکی سروشتی دەکرد، زەمینەیەکی شیاو بوو بۆ سەرهەڵدانی ئەم ڕێبازە، جگە لەمەش ((یەکەم خستنە ڕووی شانۆیی (هیرنانی)ی ڤیکتۆر هۆگۆ کۆکردنەوەی سەردەمی ڕۆمانسیزم بوو لە فەرەنسا))[5].

---

(١) د. فەرهاد پیربالّ، ڕێبازە ئەدەبیەکان، ل ٥٩.

(٢) د. حمید عزیز، ڕێبازی ڕۆمانتیکی لە جیهانی فەلسەفەدا، گ ڕامان، ژ ١٢١، ل ١٠٦.

(٣) د. هیمداد حسین، ڕێبازە ئەدەبیەکان، چ ١، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧، ل ٨٦.

(٤) د. فەرهاد پیربالّ، هەمان سەرچاوە، ل ٩٥.

(٥) د. نبیل راغب، نفس المصدر، ص ٣١.

لە ڕووی مێژووییەوە ڕۆمانسیزمی فەرەنسی دواترین کۆمەڵەی سەرەکیی ئەوروپایە، یەکەم کۆمەڵە شیعر کە بە شێوازێکی نوێ سەری هەڵدانی لە نووسراوەکانی (لامارتین) بوو بە ناونیشانی ڕامانەکانی شیعر (التأملات الشعريه) لە ساڵی ١٨٢٠دا، هۆکارەکانی دواکەوتنەکەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەم دوو خاڵە:-

١- ڕەگاژۆکردنی ڕەسەنایەتیی بنچینەکانی بەهای (کلاسیکیەتی نوێ) لە فەرەنسا.

٢- کاریگەریی ڕووداوە ڕامیارییەکان[1].

پاشان چەند دیوانێك بلاۆ کرانەوە و، چەند ناوێك لە ئاسمانی ڕۆمانسیزمدا درەوشانەوە وەك : (ڤیکتۆر هۆگۆ، ئەلفرید دی مۆسێ، جۆرج ساند) ئەم ڕێبازە لەسەر دەستی ئەمانەدا بەهێز بوو و، هەموو لایەنێکی هونەری و ئەدەبیی گرتەوە، وەك: شیعر، چیرۆك، شانۆ....هتد.

دروشمی سەرەکیی ئەم ڕێبازە بریتی بوو لەوەی کە ڕۆمانسیزم سەربەستییە[2].

## ٤- ڕۆمانسیزمی ڕووسی:

لە دوای ساڵەکانی سەدەی هەژدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەمدا، ڕۆمانسیزم پەڕیەوە بۆ ولاٚتی ڕووسیا، (کارامازین) کە نووسەرو ڕەخنەگر و مێژوونووسێکی گەورەی ڕووسە، ئەو کەسە کاریگەرە بوو کە ڕۆمانسیزمی هێنایە نێو ئەو وڵاتەوە[3]. جگە لەوەش ڕۆمانسیزمی ڕووسی لە ژێر کاریگەریی ئەدەبیاتی ڕۆمانسیزمی ولاٚتانی ئەوروپادا هاتە کایەوە. پاشان بووژایەوە و پەرەی سەند. چونکە نموونە بەرزەکانی ئەدەبیاتی ئەوروپا کارێکی زۆری لە ئەدەبی ڕووسی کردبوو، چایکۆ فسکی لە نووسینەکانیدا کەوتبووە ژێر کاریگەریی شاعیرانی ئینگلیز و ولاٚتانی ئەوروپا، (پۆشکین) هەوڵی دا ئەدەبی ڕووسی لە شالاٚوی ئەم کارتێکردنە ڕزگار بکات و، چەند تایبەتمەندییەکی ڕەسەن بۆ ئەدەبەکەی بدۆزێتەوە، بەمەش

(١) ليليان فريست، الرومانتيكية، ت: عدنان خالد، ص ٧٦.

(٢) د. عەبدولاٚ حەداد، موحازەراتەکانی بەشی کوردی، کۆلێجی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، قۆناغی دووەم، ١٩٩١.

(٣) حەسەن عەلی عومەر، ڕۆمانسیەت لە هۆنراوەکانی پیرەمێرد، نامەی ماستەر، کۆلێجی پەروەردە (ئیبن روشد) زانکۆی بەغداد، ٢٠٠٤، ل٤٠.

توانیی شتێك دابهێنێت، كه به ڕۆمانسیزمی ڕووسی ناسراوه. هەروەها ((بەرهەمەكانی پۆشكین و لێرمنتۆڤ بووه بناغەی ئەدەبی تازەی ڕووسی، كه پۆشكین ئیلهامی له بایڕۆن و شكسپیر وەرگرتبوو (لێرمنتۆڤ)یش له بایڕۆن و ئەلفرێد دۆڤینی)[1].

## ٥- ڕۆمانسیزمی ئیتاڵی:

له ئیتاڵیا ئەدەب به ڕامیارییەوە بەسترابۆوه له ساڵی ١٨١٥ بەدواوه ڕێبازی ڕۆمانسیزم له ئەدەبدا به واتای لیبرالیەت یان ئازادی دەهات. دوای پارچەكردنی ئیتاڵیا، ڕۆمانسیزم سەری هەڵدا، كه ئەمه به ڕاپەڕینێكی نەتەوەیی لەقەڵەم دەدرێت[2]. ((هەروەها ڕۆمانسیەت بەنده به بیرو باوەڕی نیشتمانی و داواكردنی سەربەستییەوە، ئەم دیاردەیه له نووسینەكانی ((مانزۆنی، لیو پردی، پرشه))دا خۆی نواند. تەوژمی ڕۆمانسیەت لەلای ئەو نووسەره ئیتاڵیانه زۆر بەهێز بوو و داوای سەربەخۆیی وڵاتەكەیان دەكرد))[3]

(١) د. فەرهاد پیربال، هەمان سەرچاوه، ل ٦١.

(٢) د. عەبدوڵا حەداد، موحازەراتەكانی بەشی كوردی، كۆلێژی ئاداب، زانكۆی سەلاحەدین، قۆناغی دووەم، ١٩٩١.

(٣) د. هیمداد حسێن، هەمان سەرچاوه، ل ٨٩.

# تەوەرەی دووەم

# ڕۆمانسیزم لە ئەدەبی کوردیدا

## چەمك و سەرهەڵدانی ڕۆمانسیزم لە ئەدەبی کوردیدا:

ڕۆمانسیزمی کوردی لەڕووی چەمك و سەرهەڵدانەوە، ئەم بزووتنەوە ئەدەبیە خاوەنی سیما و خەسڵەت و تایبەتمەندیی خۆیەتی. ئەگەرچی لە بنەڕەتدا لە زۆر لایەنەوە لەگەڵ ڕۆمانسیزمی ئەورووپی لێك چووە و، ڕەنگدانەوەی هەمان ڕێبازە. لە ڕووی سەرهەڵدانەوەش دوای جەنگی یەکەمی جیهانی و دابەشکردنی کوردستان، هەوری نائومێدی باڵی بەسەر کوردستان کێشاوە، کۆمەڵگای کوردی لە هەموو بوارەکانی ئابووری و ڕامیاری و ڕۆشنبیری و مرۆڤایەتی و ئایینی و ژیارییەوە بەرەو کزبوون و پەککەوتن ڕۆیشتن، بارودۆخی کوردستان لە بارێکی زۆر خراپ و نائاساییدا دەژیا. بەشێوەیەك ڕادەی زۆرداری و چەوسانەوە و هەژاری و قات و قڕی و نەهاتی و کوێرەوەری هێندە زۆر بوو، نەك خەڵکی چاوساغ و هۆشیاری مارانگاز کردوە، بەڵکو خەڵکی کوێر (نابینا)شی هەژاندووە. هەربۆیە دڕندەیی و چاو برسیەتی عوسمانییەکان ((بەشێوەیەك بوو کەکاری لە(مەلا حمدون) کردوە کە شاعیرێکی نابینایە و بەم شێوەیەی خوارەوە دەست بەچامەکەی دەکات و دەڵێت:-

**ئەم ڕۆژە چ ڕۆژێکە کـــە دنیا شـــــڵە ژاوە**
**هەرکـــەس بە جەغارێ جیگەری قیـــمە کراوە**
**دنیا پڕی ئاشـــــــووبە خەلایق بە عموومی**
**ئاســـــایشی لێ مەنعە ئەڵێی جونبوشی ئاوە**
**ژەندرمە ئەســـــوورێتەوە وەك واشەیی برسی**
**بۆ لاشـــــــەیی میللەت بەفڕو فێڵی غەزاوە**
**فەوتاوە لەبەر ســـــوخرەی کەر و قاتر و یابۆ**
**وشتر ســـەقەت و شەل بووە گا پشتی شکاوە**[(١)].

(١) خورشید رەشید ئەحمەد، ڕێبازی ڕۆمانتیکی لەئەدەبی کوردیدا، چاپخانەی بەغداد، ١٩٨٩، ل٥٣.

ئەمە دیمەنێکی بچووکە لەو هەزاران دیمەنەی کە شاعیری نابینا (مەلا حەمدون) دەربارەی ڕەوشی ژیان و گوزەرانی خەڵکی کوردستان پێشانمان دەدا، ئەوەب وو لە ئەنجامی ئەو بارودۆخە ناهەموارەی کوردستان کە هەموو بەشەکانی ژیانی گرتبۆوە. گۆڕانکاریەکی گەورە لە کوردستان و چەمکی ئەدەبی کوردی ڕوویدا و سیمایەکانی تازەگەری و ڕۆمانسیزم بەدەرکەوتن.

((ئەدەبیاتی کوردی لە ژێر کاریگەریی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی ئەو مۆدێرنیزمە ئەوروپاییەدا کەوتە خولیای تازەکردنەوە و کەڵکەڵەی نوێگەرییەوە))[1].

((ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی) ساڵی ١٩١٨ لە ژمارەی (٢٣،٢٤)دا بایەخێکی تایبەت دەداتە بیری نوێخوازی لە شیعرنووسیندا، بۆ یەکەمین جار وشەی (نوێخوازی — تجدید) بەکار دەهێنێت)، بۆ نموونە لەبارەی شیعرەکانی حاجییەوە دەڵێ ((حاجی قادری کۆیی لە شاعیرە موجەدیدەکانی کوردە))[2].

دەکرێ مەولەوی و حاجی قادری کۆیی بەشاعیرانی بەر لە ڕۆمانسیزمی کوردی دابنرێن، کە ڕۆڵیان هەبووە بۆ سەرهەڵدانی ئەم ڕێبازە. مەولەوی بەشیعرە جوان و ناسك و ئاوازدارەکانی کە لە قاڵبێکی ڕۆمانسیانەوە لە سەر کێشی پەنجەو بەزمانێکی کوردیی پەتی و ڕەسەن شیعرەکانی دەربارەی جوانیی سروشت داڕشتووە و، هەموو ڕەگەزەکانی ڕۆمانسیزمی تێدایە. ((حاجی قادریش لەم قۆناغە شیعریەدا، واتە قۆناغی کلاسیزمی نوێ توانیی گۆڕانکاریەکی گەورە بەسەر شیعردا بهێنێت، بەتایبەتی لە ڕووی ناوەرۆکەوە))[3].

کەواتە لەم بارەیەوە ((ئەوەی پەیوەندیی بەگۆڕینی ڕۆمانتیکی ئەدەبیاتی جیهانییەوە بێت رووکردنە ناوەرۆك و پشتکردنە ڕووخسارە. ڕەگی قووڵی ئەم مەبەستە لەم دێڕە شیعریەی حاجی قادری کۆییدا (١٨١١ — ١٨٩٧) دەبینین کە دەڵێ:-

بەیتەکان عەیبی مەکەن خوار و کەچن

---

(١) د.فەرهاد پیر باڵ، شیعری نوێی کوردی (١٨٩٨ — ١٩٥٨)،چاپ و بلاوکردنەوەی دەزگای کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٥، ل١٩.

(٢) هەمان سەرچاوە، ل٢٥.

(٣) یادگار رەسول بالەکی،سیماکانی تازەکردنەوەی شیعری کوردی (١٨٩٨ — ١٩٣٢)، چ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر،٢٠٠٥، ل٦٤.

مەقسەدم لەو بەند و باوە دەربچن[1].

((لەگەڵ ڕاپەڕینی ڕۆمانتیکی ماوەی نێوان دوو جەنگدا، زمانێکی تازە هاتە ناوەوە، گۆران خۆی باشی ناو ناوە، بەزمانی کوردیی عوسمانلی. ئەو زمانە تەواو لە ژێر تەئسیری تورکە ڕۆمانتیکەکاندا بوو)) [2].

لەهەمان کاتدا کاکەی فەلاحیش دەڵێ:- ((دەکرێت نێوان ساڵەکانی (١٩٢٠ — ١٩٣٠) مەیدانی تاقیکردنەوەی سەرکەوتوانەی ئەم ڕاپەڕینە شیعریە بێت))[3].

((گۆران کە باسی تازەکردنەوەی شیعری کوردی ئەکات، باس لە تەئسیری شاعیرانی (فەجری ئاتی) تورك دەکات، بەسەر شاعیرانی کوردەوە، ئەوەش دەستنیشان دەکات، کەئەم تازەکردنەوەیە لە تورکیا لە ژێر کاریگەری شۆڕشی فەڕەنسی و تەوژمی ڕۆمانتیکی شیعری ئەوروپادا بووە کە هەموو لایەنێکی ناوەڕۆك و ڕوخساری گرتبۆوە. لەو کاتەدا شاعیرانی کورد لاسایی تەواوی ئەوانیان نەکردەوە. بەڵکو بۆ دەربڕینی بیری خۆیان هاتنە سەر کێشی خۆماڵیی شیعری فۆلکلۆری کوردی و سامانی وشەی کوردیان هێنایە کایەوە)) [4]. دەربارەی ئەم نوێخوازییە گۆرانی شاعیر دەڵێ:- ((نووسەر و شاعیرانی ئەوسا بەتایبەتی شێخ نووری و رەشید نەجیب و من پێکەوە بە ئەدەبی تورکی موتەئەسیر بووین، پێکەوە ئەمان نووسی، بەلاّم تەنیا (شێخ نووری) شیعرەکانی بلاّو دەکردەوە، من بلاّوم نەئەکردەوە، ئەم لەم بارەیەوە نیشاطی دەرئەکەوت و ئەدەبی تورکی قوتابخانەی شیعری تازەی تیادا پەیدا بووبوو. کە پێیان ئەوترا (ئودەبای فەجری ئاتی) لەوان (تۆفیق فیکرەت) و (جلال ساهر) بوون. ئەدیبێکی تر کە ناوی (عبد الحق حامد)ە ئەگەرچی ئەم کۆمەڵە نەبوو، بەلاّم دیسان هەرپێی موتەئەسیر بووین کەوابوو هەمووومان بەیەکەوە ئەمان ڕوانییە یەك کلاّوڕۆژنە، بەلاّم دەتوانین بەشێخ نووری بلێین سەرۆك بەهۆی:

---

(١) د. عیزەدین مستەفا ڕەسول، ئەدەبیاتی نوێی کوردی،چاپخانەی خوێندنی بالاّ،هەولێر، ١٩٨٩،ل٤٢.

(٢) هەمان سەرچاوە، ل٦٤.

(٣) کاکەی فەلاح، کاروانی شیعری نوێی کوردی، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٧، ل٣٠.

(٤) د. عیزەدین مستەفا رسول، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، ل٣٩.

١- زۆریی بەرهەمی.
٢- بلاوکردنەوەی بەرهەمەکەی کە بێگومان تەئسیری ئەبەخشییە ئەدەبی کوردی)) [١].
هەرچەندە زۆربەی نووسەر و لێکۆڵەرانی ئەدەبی کوردی ڕەخنەیان نەبووە لە وتەکەی گۆران سەبارەت بەو قوتابخانە تازەیەی کە لە تورکیا پەیدا بووە، بەلاّم (ئەحمەد تاقانە) دەڵێ: ((ئەو قوتابخانە شیعرییەی مامۆستا گۆران باسی لێوە دەکات، پێی دەوترێ (ئەدەبیاتی جەدیدە)، نەك (ئودەبای فەجری ئاتی)، چونکە هەرچی (تۆفیق فیکرەت)ە سەر بە (ئودەبای فەجری ئاتی) نەبووە، بەڵکو (ئەدەبیاتی جەدیدە) بەگشتی دوو قۆناغ یان دوو لقە ڕێبازی ئەدەبی بەخۆوە دەگرێ، یەکەمیان: کۆمەڵەی (سەروەتی فنوون — سامانی هونەر)ەوە بەناوی شاعیرەکانەوە ناو دەبردرێت و گەورەترین شاعیریان (تۆفیق فیکرەت) بووە. قۆناغی دووەمی (ئەدەبیاتی جەدیدە).............
(ئودەبای فەجری ئاتی)یە کە (تۆفیق فیکرەت) پەیوەندیی پێوەی نییە)) [٢]
((لە شۆرەسوارانی کۆمەڵەی سەروەتی فنوون — سامانی هونەر)) ی ئەدەبی تورکی ئەمانەمان بەرچاو دەکەوێ: ((تۆفیق فیکرەت، سلێمان نەزیف، حەسەن جاهد، محەمەد رەئووف)) [٣]. دیارە وەك زانیمان نووسەرانی تورك لەژێر کاریگەریی ئەدەبیاتی فەڕەنسی توانیان ڕێبازێکی نوێ لە ئەدەبیاتی خۆیاندا بهێنە کایەوە، دوای ئەوەی لای ئێمەش(ئەو نوێخوازییەی ئەدەب بەگشتی و شیعر بە تایبەتی بەخۆیەوە دیوە، بەرهەمی گەشەی ئەو بزووتنەوە ئەدەبی و شیعرییە بووە کە وڵاتانی دراوسێی کوردستان بە تایبەتی تورکیا بەخۆیەوە دیتووە. ئەو وڵاتەی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا لەژێر کاریگەری بزووتنەوە نوێخوازی و ئەدەبی و ڕووناکبیرییەکانی ئەورووپادا بووە) [٤]. دیارە سەرهەڵدانی ڕۆمانسیزم لەژێر هەر بارودۆخ و کاریگەری و هۆکارێکدا بێت، لەووڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەگۆڕێت.

---

(١) کاکەی فەلاح، کاروانی شیعری نوێی کوردی، بەرگییەکەم گ بەیان،ژ ٢، ١٩٧٧، ل٢٧.
(٢) ئەحمەد تاقانە، تۆفیق فیکرەت و شاعیرە نوێخوازەکانی کورد، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردەی هەولێر، ٢٠٠١،ل ١٧ — ١٨.
(٣) ئەحمەد سەلام، بەشێك لە ئەدەبی هاوچەرخ و نوێی تورکی، وەرگێڕان، گ بەیان، ژ٧٩، ١٩٨٢، ل ٥٩.
(٤) د. کمال معروف، الحرکة التجدیدیة في الشعر الکردي المعاصر (١٩١٤ — ١٩٦٥)، جزء الأول، مطبعة ازاد، ستوکهولم، ١٩٩٢، ص ١٦٩.

بۆیە دەبینین (ڕۆمانسیزم)ی کوردیش ئەگەرچی لەژێر کاریگەریی (ڕۆمانسیزم)ی ئەورووپیدا سەری هەڵداوە، بەڵام قۆناغی سەرهەڵدانی ڕێبازی (ڕۆمانسیزم)ی کوردی هەمان ئەو قۆناغە مێژووییەی نییە کە (ڕۆمانسیزم) تێدا سەیری هەڵداوە و لەئەدەبی ئەورووپەیدا بوو))[1].

کوردیش لەڕێگای ئەم شاعیر و نووسەر و ئەدیبانەی لە شارە گەورەکانی تورکیا دەژیان، یان زمانی تورکیان دەزانی، ئاشنایەتیان بە ئەدەبی تورکی هەبوو و ڕەنگدانەوەیەك لە ئەدەبەکەیدا سەری هەڵدا،بەمەش بزووتنەوەیەکی ڕۆشنگەری دروست بوو، شەپۆلێکی نوێخوازی کوردستانی باشور و هەندێك لە نووسەرانی باکوور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای کوردستانی گرتەوە. لەسەر دەستی شاعیرانی وەك ((شێخ نووری و گۆران و ڕەشید نەجیب)) لەئەنجامی ئەوەشدا ڕۆمانسیزم پێشکەوتن و سەرکەوتنی گەورەی بەخۆوە دی و، کلاسیکیەتیش ریسواو تێك و پێك شکێنرا.

لەم بارەیەوە گۆران دەڵێت:- ((شێخ نووری سەر امەدانی ئەم ڕێبازە نوێیە بوو، بێگومان ئەویش لەئەنجامی ئەو هەوڵ و کۆششە ئەدەبیە بێوچانە بوو، کە شێخ نووری وەك ئەدیبێکی شۆڕشگێڕ و چاونەترس بەبێ سلەمینەوە لەسەر ئەم نوێخوازیە ڕۆیشتووە، بێ ئەوەی گوێ بداتە توانج و پەلاری ئەو خوێنەر و ڕۆشنبیرانەی کە تەنیا گوێچکەیان بە مۆسیقای ئەدەبی کلاسیك ڕاهاتبوو))[2].بەم شێوەیە دەبینین ((ئەدەبی تازەی کوردی لەسەر دەستی شێخ نووریی نەمردا، یەکەم هەنگاوی ئەوە بوو، کێشە عەرووزیەکانی ڕەت کردەوە، هیجای لە فۆلکلۆری کوردیەوە هێنایە کایەوە، ئەمە لەلایەکەوە ڕەسەنایەتیەو لە لایەکیشەوە، خاڵی نییە لە تاقیکردنەوەی دەورووبەر)) [3]. دیارە هیچ گومانی تێدا نییە، شێخ نووری ڕابەر و سەرقافلەی ئەو شاعیرانە بووە، کە بانگێشەی تازەکردنەوەی شیعری کوردییان کردووە، بۆیە (شێخ نووری

---

(١) ڕێزان محەمەد غەفور، ڕێبازی ڕۆمانسیزم لە شیعری کوردیدا (١٩١٨ – ١٩٤٥)، نامەی ماستەر، کۆلێژی پەروەردە، زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٥، ل ٣٦.

(٢) خورشید ڕەشید ئەحمەد، هەمان سەرچاوە، ل ٧١.

(٣) ئەژی گۆران، شێخ نوری شێخ سالح و چەند بیروڕاو سەرنجێکی ڕەخنەگرانە، گ بەیان، ژ٧١، ١٩٨١، ل٧٧.

بەپێچەوانەی سەلەفی و ئەکادیمییە توندڕەوەکان دەردەکەوێت، کە باوەڕی وا بووە پێویستە تۆ جەنگێك دژی کۆن بەرپا بکەیت و تۆپ بە ڕابردووی شیعرەوە بنێیت)[1].

ئەگەرچی لەئەدەبیاتی کوردیدا ئاسان نییە سنووری نێوان ڕێبازە ئەدەبیەکانی کلاسیك و ڕۆمانسیزم و ڕیالیزم جیا بکرێتەوە، لەبەر ئاوێتەبوونی ئەم ڕێبازانە لەنێو یەکتریدا. لەگەڵ ئەوەش دەکرێ ماوەی نێوان هەردوو جەنگی جیهانی بکرێت بەسەردەمی داهێنان و نوێخوازی، چونکە لەم کاتەدا کۆمەڵگای کوردی لە هەموو بوارەکانی ژیانیدا لە قەیراندا دابوو.بەشێوەیەك لەوپەڕی خراپی و ناهەمواریدا دەژیا. ئەمەش پێویستی بەئەدەبی تایبەت بەخۆی بوو، چونکە هەموو زەمەن و سەردەمێك تایبەتمەندیی خۆی هەیە و ئەدەبی تایبەت بەخۆشی دەوێت، کە دەبێ جیاواز بێ لە ڕووی چەمك و ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە و ئەمەش کاریگەریی خۆی هەیە لە سەوزبوون و گەشەسەندنی ئەدەبێکی نوێ، کە لە دووتوێی بەرهەمەکانی پیرەمێرد و شێخ نووری و گۆران و دڵدار و هەردی و هەندێ شاعیرانی تری ڕۆمانسیزمی و نوێخوازیدا خۆی دەنوێنێ.

---

(١) د. فەرهاد پیر باڵ، شێخ نووری شێخ ساڵح و بەرگری کردنێك لە شاعیرانی نوێخوازی ئەمڕۆ، گ.ڕامان، ژ ٢٤، ١٩٨٨، ل١١٧.

## هۆكارەكانی سەر هەڵدانی ڕۆمانسیزم لە ئەدەبی كوردیدا:

١. ئەنجامەكانی ((جەنگی جیهانی یەكەمی(١٩١٤ — ١٩١٨). جەنگ وەك كارەساتێكی ناخۆش و جەرگ بڕ و كاولكەر سەرەنج و هەستی شاعیری كوردی ڕاكێشاوە و خۆی پێوە خەریك كردووە))[١].

٢. كاریگەری ئەدەبیاتی ئەوروپا و وڵاتانی تر بەتایبەتی ئەدەبیاتی توركی و ڕۆڵ و كاریگەریی هەندێ لە شاعیرانی تاراوگە.

٣. ڕووداو و گۆڕانكاریەكانی ناوخۆی كوردستان، لە بوارەكانی ڕامیاری و ئابووری و كۆمەڵایەتی و زانستی و ڕۆشەنبیری وكەلتوریدا.

٤. زۆربوونی ڕكەبەرایەتی كۆت و بەندەكانی كلاسیكیەت و فراوانبوون و گەشەسەندنی هەوادارانی تەوژمی ڕۆمانسیزم.

٥. بووژاندنەوەی هەستی نەتەوەیی و بەكارهێنانی زمانی كوردی و فەرهەنگی گوندەكان[٢].

## هۆكارو ڕێگاكانی هاتنەناوەوەی ڕێبازی ڕۆمانسیزم بۆ ناو ئەدەبی كوردی:

١. بەهۆی شاعیرە نوێخوازە توركەكانی (شعرای فەجری اتی) وەك:- نامق كەمال، تۆفیق فكرەت، عبدالحق حامد كە لە دەرەوەی كۆمەڵەكە بوو، شاعیرانی كورد ناراستەوخۆ ڕۆمانسیزمیان لەوانە وەرگرت، نمونەی هەكاری و پیرەمێرد و شێخ نووری و گەلێكی تر.

٢. لەڕێگای ئەدەبی عەرەبییەوە بەتایبەتیش (شعراء المهجر)و كۆمەڵەی (دیوان) و (ئەپۆڵۆ). كە(دەستەی كۆمەڵەی دیوان ئەمانە بوون:(عبدالرحمن شكر و ابراهیم عبدالقادر المازنی و عباس محمود العقاد) كە داوای ڕزگاربوونیان دەكرد لە ڕێبازی كلاسیكی، بەلاٌم كۆمەڵەی ئەپۆڵۆ لەساڵی ١٩٣٢دا لە قاهیرە دامەزرا، بەڕابەریی ئەحمەد زەكی و ئەبو شادی

---

(١) د. مارف خەزنەدار، لەبابەتی مێژووی ئەدەبی كوردییەوە، چاپخانەی (المؤسسة العراقیة)، بەغدا، ١٩٨٤، ل١٣١.

(٢) د. هیمداد حوسێن، هەمان سەرچاوە، ل١١٠.

که پێك هاتبوو لە ئیبراهیم ناجی و عەلی مەحمود تەها و گەلێکی تر)) [1].کە کاریگەریی هەبوو بەسەر هەردی و گەلێك شاعیری تر.

٣. بەهۆی کاریگەریی بەرهەمی شاعیرە ئینگلیزەکانی وەك :-

(شیلی و کیتس و بایرۆن و ورد زۆرث)لەسەر کامەران و بەدرخان و گۆران و ڕەشید نەجیب و هەندێ شاعیرانی تر.

٤. بەهۆی ئەدەبی فەڕەنسی و کاریگەریی لەسەر قەدری جان و گەلێك شاعیرانی تر[2].

## خەسڵەت و تایبەتمەندییەکانی ڕۆمانسیزمی کوردی:

١- بەکارهێنانی کێشی پەنجە و وازهێنان لە یەکێتیی سەروا ((ئەگەرچی لە سەردەمی ڕۆمانسیەتدا هەندێ لە شاعیرانی کورد لەپاڵ کێشی خۆماڵی کێشی عەروزیشیان بەکار هێنا، لەوانەش کێشی دەریای (رەمەل و هەزەج)[3].

٢- سادەیی و ڕەوانی لە زمانی شیعری دا، ڕوونی و ئاشکرایی لە واتادا و جوانی لە ئاوازدا.

٣- بەکارهێنانی وێنەی شیعریی تازە.

٤- یەکێتیی بابەت. واتە هەموو شیعرەکە بەیەکەوە بابەتی شیعری دروست دەکات.

٥- سروشت ((گەڕانەوە بۆ سروشت مامەڵەکردنی نوێیە لەگەڵ ڕەگەزو دیاردەکانی)[4].

٦- ئافرەت و جوانی و خۆشەویستی.

٧- نیشتمانپەروەری و ئازادی.

٨- ئەندێشەو خەون و خەیاڵ.

---

(١) د. علي علي مصطفى صبح، من الأدب الحديث في ضوء المذاهب الأدبية والنقدية، مطبعة منيمة الحديث، دار المريخ، سعودية،١٩٨١،ص٢٤.

(٢) د. سەردار گەردی، موحازەراتەکانی خوێندنی باڵا، بەشی کوردی، کۆلێژی زمان، زانکۆی کۆیە، ٢٠٠٧/١/٣١.

(٣) حەسەن عەلی عومەر، ڕۆمانسیەت لە هۆنراوەکانی پیرەمێرددا، نامەی ماستەر، ل ١٨.

(٤) کوێستان جەمال سەلام، سروشت لە شیعری نوێی کوردیدا ١٩٣٠ – ١٩٦٠، نامەی ماستەر، کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٩٦، ل٤٩.

٩- هەست و سۆزو بەزەیی ((لە ڕێبازی ڕۆمانسیەتدا هۆنراوە بریتی بوو لە دەربڕینی هەست و سۆزی کەس و ڕەنگدانەوەی جیهانی ناوەوەی شاعیر))[١].وێڕای ئەمانەش ڕۆمانسیزمی کوردی گەلێك خەسڵەتی تری وەك بایەخدان بەخودیەتی و تاکیەتی و گەڕانەوە بۆ ڕابردوو و منالّی و غەمگینی و تەنیایی و گۆشەگیری و نامۆیی و دلّەڕاوکیّ و ڕەشبینی بەخۆوە گرتووە.

## پێشەنگەکانی ڕۆمانسیزمی کوردی:

### ١- مەولەوی (١٨٠٦- ١٨٨٢)

ئەگەر چاوێك بەشیعر و ئەدەبیاتی ناوچەی گۆراندا بخشێنین، ئەوە پرشنگی ئەستێرەی گەشی شیعری مەولەوی دەبینین. ئەو شیعرانەی حەز و تاسە ئەبزوێنن و تینوێتیی مرۆڤ دەشکێنن. لە شیعرەکانیدا چەشەی ئەدەبی و داهێنان و تازەگەری و ناوەڕۆکێکی بەرزو فۆڕمێکی جوان ئەدرەوشێتەوە. مەولەوی شاعیری سروشت و جوانیپەرست ، زۆر جوان و وەستایانە کەرەستە و بابەتی جوانی هەڵبژاردووە بۆ خولّقاندنی شیعری جوان. لە هۆنراوەیەکی ئەم دێرە شیعری بەنمونە دەهێنێتەوە کە دەلّیّ:-

**گـــــــولّ چوون ڕووی ئازیز نزاکەت بۆشان**
**وەفراوان چوون سەیل دیدەی مـــن جۆشان[٢].**

ئەوەی بەلای منەوە جێی ئاماژەپێکردن و گرنگە و، پێویستە هەڵوێستەی لەسەر بکرێت ئەوەیە زۆربەی شیعرەکانی مەولەوی کەشوهەوایەکی ڕۆمانسیانەی پڕ سۆز و ئەندێشەیان هەیە و هەموو ڕەگەزەکانی ڕۆمانسیزمی تێدایە. هەرچەندە مەولەوی هەر لە خۆیەوە ئەم شێوە شیعریەی خولّقاندوە، بەپێچەوانەی شاعیرەکانی دیکە کە لەژێر کاریگەریی ئەدەبیاتی ئەوروپاو تورکیا پەیڕەوی ڕۆمانسیزمیان کردووە، چونکە لەسەردەمی ئەودا ئەم ڕێبازە لە کوردستان هێشتا نەناسرابوو.

---

(١) دلشاد عەلی محەمەد، بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا، نامەی ماستەر، بەشی کوردی،کۆلێژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٨، ل١٠.

(٢) کەریم مستەفا شارەزا، جوانی لە شیعردا، گ کاروان، ژ ٧٩، ١٩٨٩، ل٣٧.

شاعیر بەپێچەوانەی شاعیرانی ڕۆمانتیکی ئەورووپی و خۆمان لە وەسف کردنی وەرزەکانی ساڵ وەك یەك بەشێوەیەکی جوان و قەشەنگ را زانیویەتییەوە[1]. مەولەوی بە شێوەیەکی خەیاڵی و بەرز و ئیستاتیکیەتێکی بێهاوتا لە قالبێکی ڕۆمانسیانەی پڕ هەست و سۆزەوە، وەستایانە وێنەی شتەکان دەکێشێ. مەولەوی ئەگەرچی پیاوێکی خواناس و ئایین پەرست بووە بەدانانی شیعری تەسەوف و تێڕوانین و لێکدانەوە فەلسەفیەکانی گەیشتۆتە ئاستێکی بەرز. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا دیمەنی جوان و پاك و بێگەردی ئافرەت، بەم هەموو مانا و دڵگیری و ڕاستی و شۆخی و شەنگییە بێ خەوشەوە سەرنجی ڕادەکێشێ و، گۆمی خەون و خەیاڵ و هەست و سۆزی دەشڵەقێنێت، وەك لەم شیعرەیدا وەسفێکی هونەریی نازدارێکی (جاف) ی کردوە، لەم دیوی ڕەشماڵەکەیانەوە نیگای داختووە دەڵێ:-

**چـوون چیهرەی خەیاڵ ڕووخسـارەکەی وێش**
**ئـــەتۆی پەردەی دڵ مەعدوومی دڵ ڕێش[2].**

## ٢- پیرەمێرد (١٨٦٧ – ١٩٥٠):

پیرەمێردی شاعیر یەکێکە لە ئەستێرە گەشەکانی ئاسمانی شیعری ڕۆمانسیزم و، دەریایەکە لەهەست و سۆز و هەڵچوون و خەیاڵ، وێنەی شیعری باخچەیەکی ڕازاوەیە لە وشەی ڕەسەن و ناسك و جوانو تەڕو پاراو، خەرمانێکە لە بیر و هزری پاکی مرۆڤانە، شاعیر تا بڵێی لێهاتووە بە توانا و خاوەن ئەزموون و دەسەلاّتدار بووە لە هۆنینەوەی شیعردا، کاتێ پێویستیەکی دەروونی یان مرۆڤایەتی بووبێ. هەر بۆیەمامۆستا ڕەفیق حلمی دەڵێ:- ئەگەر ڕۆژهەلاّتناسان چاویان بەشیعری پیرەمێرد بکەوتایە، شکم نییە ئەویان لە ڕێزی یەکەمی شاعیرەکانی خۆرهەلاّت دابنایە. شیعرەکانی تا بڵێی بەردار و بەهیوایە [3].

---

(١) خورشید رەشید ئەحمەد، هەمان سەرچاوە، ل ٩٠.

(٢) مەولەوی، دیوانی مەولەوی، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوە، مەلا عبدولکەریمی مودەریس، چ ١، چاپخانەی نجاح، بەغدا، ١٩٦١، ل٨٨.

(٣) رەفیق حلمی، شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی خوێندنی بالاّ، هەولێر، ١٩٨٨، ل ٨٣.

ئەمەش دیاردەیەکی ئاشکرایە وەك لە هۆنراوەکانی (وەفدی کوردستان، ئای نائومێدی، شیوەنی شەهیدانی کورد، خاکەکەمان، نەورۆز، ئەستێرەی بەختم، من و ئەستێرەکان، کوردی ڕەوان، کزەی دەروون، پایزی دڵتەنگ، لانەی دلأن، ناڵەی دڵتەنگی)گەلێکی تردا دەردەکەوێت. شاعیر لەم هۆنراوانەیدا دەچێتە ناخی ڕووداوەکان و قووڵایی و ڕاستی و کاریگەریی ڕۆمانسیزمەوە. لەگەڵ فڕینی پەپوولەی وشەکان تك تك ئەسرین لە چاوە ماندووەکانی دێتە خوارێ کە کۆت و دیلی بێ خەوین. شاعیر لە هۆنراوەی (من و ئەستێرەکان)دا نموونەیەکی بەرزی شیعری ڕۆمانسیزمان پێشان دەدات کە دەڵێ:-

**ئــەستێرە بەرزەکان ئەدرەوشـــــــــێنەوە بەشەو**

**وەك مــن بەداخەوەن نە ســــــرەوتیان هەیە نە خەو**

**چەند ســــاڵە ئاشنای شـــــەوی بێداریی یەکتر ین**

**وەك ســەرسەرین شەوێ سەر ناکەینە سەر سەرین**(1).

دوای سەرهەڵدانی ڕۆمانسیزم وەك ڕێبازێکی ئەدەبی، پیرەمێرد کەوتۆتە ژێر کاریگەریی ئەدەبیاتی فارسی و عەرەبی و تورکی و ئەورووپی و، توانیویەتی لە ئەزموونی شیعری خۆیدا سوودیان لێ وەربگرێت. لەهەمان کاتدا ڕۆڵی سەرەکیی هەبوو لە پاککردنەوەی زمانی کوردی لە وشەی بێگانە و تازەگەری و گۆڕانکاری و، داهێنان لەشیعردا بکات لە گەلێك لایەنەوە، بەتایبەتی لە ڕووی ئەندێشە و زمانی شیعرییەوە، ((خەیاڵە ڕۆمانتیکیەکەی دەربڕی ئەو ڕاڕایە بوو لە نێوان هیوای ڕۆمانتیکی شۆڕشگێڕی و ڕوو کەرە دوا ڕۆژو نائومێدی ڕۆمانتیکی کۆنە پەرستی ڕوو لە ڕابردوو کردوو، بەلاَم لەهەردوو بارەکەدا پیرەمێرد دەربڕی کلۆڵیی گەلەکەی و باری ئازار و چەوساندنەوەی بوو)) (2).

---

(١) پیرە مێرد، دیوانی پیرەمێرد، کۆکردنەوەو ساغ کردنەوەی فایق هۆشیار و هاوڕێ یانی، چاپخانەی زەمان، بەغداد، ١٩٩٠،ل ١٩١.

(٢) د. عیزەدین مستەفا رەسول، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، ل٧٦.

### ٣- شێخ نووری شێخ ساڵح (١٨٩٦ – ١٩٥٨):

((شێخ نووری شێخ ساڵح ساڵانی (١٩٢٠-١٩٣٠) دەنگێکی ڕەسەن و دەگمەن بوو لەمەیدانی نوێخوازیی شیعری کوردی. ڕۆڵێکی بنەڕەتیی هەبوو سەبارەت بە بەڕێوەبردن و ڕابەرایەتیکردنی ئەم بزووتنەوەیە و ئەم ڕێبازە هاوچەرخە))[١]. ((شێخ نووری بە پێشەنگ و سەرئامەدی تازەکردنەوەی ڕۆمانسیزمی کوردی دادەنرێت و، لەم بوارەدا توانیی گۆڕانکاری و داهێنانی گەورە بێنێتە ئاراوە. بەتایبەتی (لە قۆناغی دووەمی شیعریدا لە ژێر کاریگەریی ئەدەبی تورکی،دا دەستی کرد بەنوێکردنەوەی شیعر، ئەمەش لەبەرئەوەی تورکییەکی باشی زانیووە و کاریگەر بووە بە ئەدەبیاتی تورکی. توانیویەتی سوودێکی زۆر لەم ئەدەبیاتە وەربگرێ لە تازەکردنەوەی ئەدەبی کوردیدا[٢]. بەشێوەیەك(شیعری فیکرەت ئەوەندە کاری لێکردوە تەنانەت هەندێك لە شیعرەکانی دەقاودەق کردووە بەکوردی)[٣]. شاعیر وێنەی شیعری بە ڕادەیەکی زۆر بەکار هێناوە کە قووڵی و جوانی و کاریگەریی بەشیعرەکانی بەخشیووە. بێگومان ((شێخ نووری زانیویەتی مەسەلەی مۆسیقا یان ئاهەنگ بنەمایەکی بنچینەیی شیعری نوێیە، بۆیە بایەخێکی زۆری بە ئاهەنگ و وەزن یان مۆسیقای شیعری داوە))[٤].

هەروەها ڕەفیق حلمی لە باسی شێخ نووری شێخ ساڵحدا نووسیوییە:

((بەتایبەتی لە ئەدیبەکانی دەوری وریابوونەوەی تورك زۆر سوودمەند بووە و لە دانانی شیعری کوردیا پەیڕەوی (تۆفیق فکرەت)ی کردوە، کە یەکێکە لە شاعیرە بەرزە نیشتمانپەروەرەکانی ئەو دەورە، لە وەزن و قافیە و شێوە ئاهەنگا ڕێگایەکی تازەی داناوە بۆ شیعری کوردی)) [٥]. شاعیر کاتیك دەکەوێتە بەر تەوژمی گەردەلوولی ڕۆژگار و هەوری ڕەشی بارانی مەینەتی بەسەردا ئەبارێنێ و خەزانیش خونچە و چڵ و پۆپەی باخچەی ژیانی

---

(١) د. كمال معروف، الحركة التجديدية في الشعر الكردي المعاصر (١٩١٤- ١٩٦٥)، الجزء الأول، ص ١٨٦.

(٢) ئاسۆ عومەر مستەفا، بەها ئێستاتییەکانی شیعری لای (پیرەمێرد،شێخ نووری شێخ سالح،گۆران) نامەی ماستە ر، زانکۆی سەلاحەددین،کۆلێژی پەروەردە،٢٠٠٣، ل٦١.

(٣) ئەحمەد تاقانە، تۆفیق فکرەت و شاعیرە نوێخوازەکانی کورد، چ ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل٦٧.

(٤) د. فەرهاد پیر باڵ، شیعری نوێی کوردی (١٨٩٨ – ١٩٠٨)، ل ١٠٠.

(٥) د. عیزەدین مستەفا رەسول، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، ل٤٧.

ئەشێوێنێ، خەون و خەیاڵ و پەپولەی شیعرەکانی ئەفڕێنێ. ڕەشبینی باڵی بەسەردا دەگرێ و، هەستی خۆی بەشێوەیەکی ڕۆمانسیزمی بۆ مردنی هیوا و ئاواتەکانی دەردەبڕێ و لە پارچە شیعری (ڕەخنە لە خۆ و سکالاٚ)دا دەڵێ:-

**بگری ئەی شاعیری ناتەوان بگری**

**مرد لە ڕۆحی منا هەموو ئامال**

**بـــــێ خودان کفن بدوش ملال**

**ئاگری ســـەرســـەری پڕ خەیاڵ[2].**

## ٤- گۆران (١٩٠٤ – ١٩٦٢):

کاتێ باس لە شیعری ڕۆمانسیزمی کوردی دەکرێ، شیعرەکانی گۆران ڕاستەوخۆ لە ناخەوە هەست و دڵ و دەروغان دەورووژێنێ و، دەمانباتە جیهانێکی تازەی خەون و خەیاڵەوە، شاعیر ((لە ساڵی(١٩٣٠) بەدواوە ئیتر لەسەر ڕێبازی ڕۆمانسیزمەوە هۆنراوەی نووسیوە، بەهۆیەوە چەندەها هۆنراوەی زۆر جوانی لەبارەی سروشت و جوانیی ئافرەتەوە هۆنیوەتەوە)) [1]. ئەویش وەك زۆربەی شاعیرە چەوساوەکانی کوردستان لە ژێر زەبری زوڵم و زۆری ئاغایەتی و دەرەبەگایەتی و داگیرکەرانی ئەو سەردەمەدا کاریگەر دەبێت و، ویژدانی دەکەوێتە بەر نووکی خەنجەر، ئەمانە و ژیانی پڕ لە ناڵە و حەسرەت و کولەمەرگی و نەهامەتی و پەژارە و ناخۆشی و کلۆڵی یەخەی دەگرێت و، دڵتەنگ و هەناسەسوار و ڕەشبینی دەکات. جگە لەمانەش دیمەنە جوان و دڵڕفێنەکانی قەرەداغ و هەورەمان و قژکاڵ و لێوئاڵ و بزەی ئازیزان، گۆران دەخاتە دەریای قووڵ و بێ بنی خەون و خەیاڵ و ئەندێشەی جوانی سروشت و خۆشەویستی ڕۆمانسیزمیەوە، لەهەمان کاتدا لە ژێر کاریگەریی ئەدەبیاتی ڕۆژئاوایی و تورکیدا توانیی گۆڕانکاری و داهێنانی مەزن و بێنێتە کایەوە. چونکە ((گۆران توانیی گۆڕانی ڕیشەیی خۆی لەسەر بناغەی کێش و سەروا و بڕگەی خۆماڵی و گۆڕینی ڕەنگ و ڕووخساری شیعر و سیمای

---

(١) موسلیح مستەفا جەلالی، شێخ نوری دەنگی ڕەسەنی شیعر، چاپخانەی (دار الحریة)، بەغداد،١٩٨٤، ل١٣٠.

(٢) حەسەن عەلی عومەر، ڕۆمانسیەت لە هۆنراوەکانی پیرەمێردا،نامەی ماستەر، ل ٥٣.

ڕووکەش و دیاری شێوە نووسین بکات))[١]. وێڕای ئەمەش سوودی لە ئەدەبیاتی ئینگلیزی بینیوە و (توانیی سەرکەوتوو بێت لە وەرگرتنی شتە شاراوەکان و ڕەهەندەکان و گەوهەری گیانی ڕۆمانسیەت لە ئەدەبی ئینگلیزی دا ، ئەمەش بووە هۆکاری دامەزراندنی کۆڵەگەی ئەدەبی نوێی کوردی و، بەدیهێنانی بە گۆڕانکاریی ڕیشەیی لەنێو شیعری کوردیدا))[٢].

دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسول دەڵێ:- ((ڕەنگە هەموو شاعیرە سەرکەوتوو بەخشندەکانمان پێش من دان بە مامۆستایی و ڕابەریی گۆران دا بنێن و، بڵێن ئێمە گۆرانمان تێدا نابێ، بەڵام گۆران لای من و لای ئەوان تەنیا شاعیر و مرۆڤێك نییە، بەڵکو دیارە کەسێکی بلیمەت بوو کە توانیی پیویست و حەتمیەتی مێژوویی بەجێ بهێنێ کە تازەکردنەوەی شیعری کوردیی دەیەویست))[٣]. ((کەواتە چ لە ڕووی ناوەڕۆك و چ لە ڕووی ڕوخسارەوە بەرهەمی پاش گۆران لە ئەدەبیاتی کوردیدا لە بەرهەمی گۆران و سەردەمی ئەو جیا ناکرێتەوە ، بەڵکو هەموو کارێکی ئیبداعی و بەرز بەردەوامی و جوانیی ئەو ڕێبازەیە لەسەردەمی خۆیدا))[٤]. ((گۆران شاعیری سروشت و جوانی ، زۆربەی هەرە زۆری شیعرەکانی لە جوانییەوە دەدوێت، کەرەستەی شیعرەکانی جوانن و بەهرەی شاعیر گەلێ گەورە و بەرزە))[٥].

لە ڕووی زمانی شیعرییەوە ((زۆربەی شیعرەکانی گۆران زمانێکی کوردیی پەتییان تێدایە بەکار هاتووە و، شاعیر ڕۆڵێکی کاریگەری بینیوە لە پەرەسەندنی زمانی شیعری نوێی کوردیدا))[6]. مۆسیقای شیعرەکانی تابلێی جوان و بێ هاوتا و ئاوازدار و سەرنجڕاکێشە، لە

---

(١) عبدولقەهاری شێخ، ئەزموونەکانی شیعری کوردی، چاپخانەی پاك، هەولێر، ٢٠٠١، ل ١٠٧.

(٢)د.کمال معروف, دراسة عن اعمال گۆران الأدبية، الطبعة الأولى, مطبعة گەنج، منشورات دار ڕێینما،سليمانيية، ٢٠٠٥، ص ٦٤.

(٣) د. عیزەدین مستەفا رەسول، چاوپێکەوتن و ئەنجام دانی : فوئاد حسین، گ بەیان، ژ ١٦٥، ١٩٩٠، ل ٩٣.

(٤) د. عیزەدین مستەفا رەسول، شیعری تازەی کوردی،گ ڕۆشەنبیری نوێ، ژ ١٥، ١٩٨٥،ل ٢٠١.

(٥) کەریم مستەفا شارەزا،جوانی لەشیعردا،گ کاروان، ژ٧٩،١٩٨٩،ل٣٨.

(٦) ئاسۆ عومەر مستەفا،بەها ئیستاتیکیەکانی شیعری لای پیرەمێرد و شێخ نوری شێخ سالح و گۆران،نامەی ماستەر، ل ١٠.

ڕووی کێش و سەرواوەش سەرەتا بەکێشی عەروزی عەرەبی دەستی پێ کردوە، پاشان بەیەکجاری هاتۆتە سەر کێشی پەنجە، لە هەڵبژاردنی بابەتیش ((شیعری گۆران هەمیشە لەگۆڕان و نوێ بوونەوەیدا بووە و بەشێوەی هەمەڕەنگ بوو))[1]. وەك دەزانین وێنەی شیعری لە شیعری تازەدا پانتاییەکی فراوان و دیاری داگیر کردووە و، گرنگییەکی گەورەی هەیە، بۆیە دەبینین گۆران لەم بوارەدا ئەوپەڕی سەرکەوتوو بووە و لەزۆربەی شیعرەکانیدا وێنەی تێکەڵاوی بەکار هێناوە. لایەنی سروشت و جوانیش لە شیعری گۆراندا سیمایەکی زەق و بەرچاوە. شاعیر بەجۆش و پەرۆشێکی زۆرەوە دەست لەملانێی سروشت بووە و، بەهرە و خورپەی پێ بەخشیوە و، هەست و سۆزی ناسکی بزواندووە، لەسروشتی بێگیاندا، ئاسمان و مانگ و ئەستێرە، چیا و گرد و دەشت و ڕووەك و درەخت و گوڵ و دەریا و کانی و ڕۆبار، لە وەرزەکانی ساڵیشدا پایز مەودایەکی گەورە و بەرینی بەخۆوە گرتووە، شاعیر وا دەبینێ کە جوانیی سروشت بێ جوانیی ئافرەت بەهایەکی ئەوتۆی نییە، وەك ئاسمان بێ مانگ و ئەستێرە و ڕۆژە بۆیە دەڵێت:

**بەڵام تەبیعەت هەرگیزاو هەرگیز**

**بــێ ڕووناکییە، بێ بزەی ئازیز[2].**

بۆیە (یەکێك لەم بوارانەی کە کەسیەتیی شیعری گۆران ئێجگار بەگەشی تێدا دەردەکەوێت و دەدرەوشێتەوە ئافرەتە، ئافرەت هەوێنی گەلێ چامەی سەرکەوتوانەی گۆرانە)[3].

لە بەرئەوەی شاعیرانی نوێ لەشی جوانی ئافرەتیان لە دیاردەکانی سروشت بەجوانتر زانیوە، بەلایانەوە مرۆڤ بەنرخترین سەرمایەیە)[4].

---

(١) د. عیزەدین مستەفا رەسول، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، ل ١٤٩.

(٢) گۆران،دیوانی گۆران کۆکردنەوەو ئامادەکردنی: محەمەدی مەلا کەریم،چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق, بەغداد، ١٩٨،ل ١٠

(٣) فازل مەجید مەحمود، سروشت لەشیعری گۆراندا چاپی یەکەم،دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٣٧.

(٤) د. کمال معروف, ئەدەبیاتی کلاسیکی و نوێخوازی کوردی، چاپخانەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل ٣١.

((لەکاتێکدا لە شیعری کلاسیکیدا یاری هەموو شاعیرێك بالاٚ بەرزە، بەژن زەرافە، ناوقەد باریکە چاوی گەشە، برۆی کەوانە، برژانگ تیرە، هەر لەو کاتەدا شاعیری تازە وەك گۆران هەموو تەشبیهەکانی ناو شیعری کلاسیکی لائەدا و جوانی لە ئافرەت خۆیدا دەبینیٚ و دەڵیٚ:- [(١)].

**کام ئەستێرەی گەش کام گوڵی کێوی**

**ئاڵە وەك کوڵمی، گۆی مەمکی لێوی؟**

**کام ڕەشـــــــی ئەگا بەڕەشی چاوی؟**

**برژانگی، برۆی، ئـــەگریجەی خاوی؟[(٢)].**

شاعیر وەك سیمایەکی ڕۆمانسیزم هێندە تەنیا و نامۆ و کز و مات و خامۆش و ڕەنگ زەرد و بیٚ ئارام و هەناسەسارد و ڕووت و ڕەجاڵ و زیز و داماو و گۆشەگیر و چاو پڕ ئەسرین و دەردەدارە یان هێندە ئاوێتەو هاوخەسڵەت و هاوشێوە و هاودەنگ و هاودەمی پایز بووە بەیەك تابلۆ خۆی دەنوێنیٚ، لەیەکتری جودا نابێتەوە، بۆیە لە هۆنراوەکانی (پایز) و(هەوری پایز)دا، تەمی ڕۆمانسیزم بەتەواوی دادەپۆشیٚ و، غەم لە دڵ و دەروونیدا پەگ دەخواتەوە و، حەز دەکات وەك هەوری پایزان بەگوڕ بگری و دەڵیٚ:-

**بــــەڵیٚ بگری، بـــەکوڵ بگری، هەتا ئاخر دڵۆپ بگری**

**بــــــــەگریەی هەوری پایز با نقوم بیٚ ســـینەیی کزری**

**بــــــەفر ئاســــــۆی بڵند بگرێتە چوار چێوەی بلوورینی**

**لــەچەم هەڵسیٚ خوڕە و هاژەی شەپۆڵی ئاوی خوێنینی[(٣)].**

## ٥- دڵدار (١٩١٨ – ١٩٤٨):

دڵدار لە قۆناغی یەکەمی شیعریدا، سەرەتا ((وەك شاعیرێکی کلاسیکی لە ناوەڕاستی سییەکاندا سەری هەڵدا، بەلاٚم وەك ڕۆشەنبیرێکی زیرەکی سەردەمی خۆی، هەردەم تێنووی زانستی نویٚ و بیری تازە بوو. بۆیە دەبیٚ ئەو ڕاستیە بڵێین، کە دڵدار لە قۆناغێکی گەلیٚ ئاڵۆز

---

(١) د. عیزەدین مستەفا رەسول، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، ل ٤٠.

(٢) گۆران، دیوانی گۆران، کۆکردنەوەو ئامادەکردنی محەمەدی مەلا کەریم، ل ١٠.

(٣) هەمان سەرچاوە، ل ١٦٥.

و پڕ لەتەنگ و چەڵەمەی کۆمەڵی کوردەواریدا ژیاوە ، ئەم ئاڵۆزیە لەناو بەرهەمی شاعیردا ڕەنگی داوەتەوە)) [1]. ((دڵدار بەقۆناغی دوای گۆران و پیرەمێرد دەژمێردرێت، لە بەردەوامبوونی لەسەر ڕێبازی ڕۆمانسیەت. هەروەها لە هۆنراوەکانیدا کێشەکانی (هەزج) و (ڕەمل)ی عەرووزی عەرەبیی هەر بەکار هێناوە، لەسەردەمی نوێی هۆنراوەی کوردیدا))[2].

دکتۆر مارف خەزنەدار سەبارەت بە دڵدار دەڵێ:- ((من زیادەڕۆیی ناکەم ئەگەر بڵێم کە دڵدار بە یەکێك لە ڕابەرەکانی شێوازی ڕۆمانسیزم و ڕیالیزم لە ئەدەبی کوردیدا دابنرێ))[3]. چونکە دڵدار زوو خۆی لە کۆت و بەندی یاسا و دەستوورەکانی کلاسیکیەت ڕزگار کردوە و، ڕووی کردۆتە ڕۆمانسیزم و، چەندەها شیعری جوان و ناسك و بەرز و کاریگەری ڕۆمانسیانەی نووسیوە. ((ئەم هەنگاوی تاقیکردنەوە و بەرهەمە نوێیانەش زۆرتر لە شیعرەکانی (منداڵی هیوا، گوڵی سور، ئەی بای شەماڵ، خەندەکەی بایی، کوردستان)دا لەناو هەموو ئەوانەشدا (خەندەکەی بایی و گوڵی سوور) زۆرترین هەوێنی هونەری شیعریان گرتۆتە خۆیان و زیاتر نیشانەی بەهرە و دەسەڵاتی شاعیریان تێدایە))[4].

خەندەکەی بایی لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە تا بڵێی ڕۆمانسیزمی و جوان و تەڕ و چیژدار و پڕواتا و بەهێز و گەورە و باڵایە، کە تێیداا دەڵێت:

**لـــە ئافاتـــی ژیانی نائومێدیم خەندەکەی بایـــــی**
**فریشتەی پـاکی هیوامی نیشـــــــاندام وا کە بیدوێنم**
**پڕیشکی تیشکی ئەسـتێرەی جوان ئیمشەو بە ئاسپایی**
**بەســــــۆزێ هاتە نێو کونجی دڵی تاریکی پڕ خوێنم**[5].

## ٦- هەردی (١٩٢٢- ٢٠٠٦):

هەردی یەکێکە لەو شاعیرانەی کە پانتاییەکی گەورە و فراوانی لە شیعری ڕۆمانسیزمدا داگیر کردوە و جێگایەکی دیار و بەرزی هەیە و، خاوەنی سیمایەکی تایبەت و دەنگی ڕەسەنی خۆیەتی.

---

(١) کەریم مستەفا شارەزا، دڵدارو شیعری ڕۆمانسیزمی، گ کاروان، ژ ٢٥، ١٩٨٤، ل ١٩.

(٢) حەسەن عەلی عومەر، ڕۆمانسیەت لەهۆنراوەکانی پیرەمێرد، نامەی ماستەر، ل ٥٦.

(٣) د. كمال معروف، الحركة التجديدية في الشعر الكردي الحديث،(١٩١٤ – ١٩٦٥)، ص ٢١٨.

(٤) عبدالخالق علاءالدین/ دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد، چاپخانەی (دار آ فاق العربية) بەغدا، ١٩٨٥، ل ١٦٨.

(٥) هەمان سەرچاوە، ل ١٦٩.

شاعیر ((دامەزرێنەر و ڕێبەری ڕاستەقینەی بەشێك یان جۆرێکی گرنگی قوتابخانەی ڕۆمانتیکی شیعری نوێی کوردییە ))[1]. لەهەمان کاتدا ((بەقۆناغی دوای گۆران و پیرە مێرد دادەنرێت لە پەیڕەویکردنی ڕۆمانسیەت، هۆنیار لە دەسپێکی هۆنراوەکانیدا بە ڕۆمانسیەت دەستی پێ کردوە، کەچی لەگەڵ ئەوەش هۆنیار چەند هۆنراوەیەکی لەسەر کێشی عەرووزی واتە کێشەکانی (هەزەج) و (ڕەمەل) نووسیوە کە لە هۆنراوەکانیدا بەکاری هێناوە))[2]. هەردییەکێکە لە ئەستێرە گەش و پڕشنگدارەکانی ئاسمانی ڕۆمانسیزم، شیعرەکانی لە ناخی ڕاستی و کاریگەریەکی فراواندا خۆیان دەنوێنن و شەپۆل دەدەن. جگە لەمەش ماکی غەم و ناخۆشی و تەنیایی و سکاڵا و گریان و نائومێدی بۆ ئافرەت و دڵداریی گرتۆتە خۆ. شیعری (دڵێکی تێکشکاو) نموونەیەکی بەرزە لە شیعرەکانی هەردی، کە هەندێ لە نووسەر و لێکۆڵەرەوان پێیان وایە لە ژێر کاریگەریی شاعیرانی (کۆمەڵەی ئەپۆڵۆ)دا هۆنراوەتەوە. واتە شاعیر کاریگەر بووە بەشاعیرانی ئەم کۆمەڵەیە. بەتایبەتی شاعیرانی وەك ئیبراهیم ناجی و عەلی مەحمود تەها، ئەمەش نموونەی ئەم شیعرەیە کە دەڵێ:

**بە سەرسامی لەسەر لوتکەی بڵندی گەنجی وەستاوم**
**شریتی عومـری ڕابردووم وەکو خەو دێتە بەر چاوم**
**شـــــریتی چی سەراپا سەر گوزشـــــتەی نائومێدیمە**
**فلیمی پـــڕ لـــە ناســـــــۆر و هەرەسهێنانی لاویمە**
**تروسکەی تیا بـــەدی ناکەم ســـــەرنجم چەندە لێ داوە**
**لــە تاپۆی نامرادیم و تەمی ناسـۆری بـــــەولاوە [3].**

جێی ئاماژەکردنە شیعرەکانی هەردی لەو شیعرانەن، بەرگی نەمرییان پۆشیووە و تەمەنێکە پیر نابێت و کاتێکە بەسەر ناچێت، هەست و سۆزێکە ون نابێت. وەك درەختە هەمیشە سەوزەکان دەشنێتەوە. گەرچی لەنێو گەردەلوولی نائومێدی و شەستەبارانی ئازاردا لە پایزێکی پایزدا تەنیا بژی.

---

(١) کمال میراودەلی, هەردی و ڕۆمانسیزمی خود، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، سلێمانی- لندن، ٢٠٠٧ ل ٣.

(٢) حەسەن عەلی عومەر، ڕۆمانسیەت لە هۆنراوەکانی پیرەمێردا، نامەی ماستەر، ل ٥٩.

(٣) ئەحمەد هەردی، ڕازی تەنیایی،چاپی دووەم، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەددین، ١٩٨٤، ل ٥٨- ٥٩.

# تەوەری یەکەم

# بەهای جوانی و ئازادی لای شاعیران، هێمن و محەمەدی نووری

## أ: بەهای جوانی لای شاعیران (هێمن و محەمەدی نووری):

جوانی ژێدەری ژیانە و پاڵنەری بوون و بەردەوامییە، هاندەری گشت چالاکیەکانی مرۆڤە و، ئاوێنەی ڕەواو و ڕاستییە، ئەگەرچی بنەمایەکی چەسپاوی هەیە، بەلاّم لە هەمان کاتدا بەپێیی دیدی کەسەکان ڕێژەی جوانییەکە و پێوانەی تایبەتی دەبێت. لە دیرۆکی زۆر کۆنەوە ((بیرمەند و فەیلەسوفەکان تێڕوانینی هزریان بۆ جوانی هەیە و، پێیان وایە کە بەهاکانی جوانی ڕەهان و، ناگۆڕێن و، خێر و جوانیش دەستکردی مرۆڤ نین ، بەڵکو بەشێکن لە پێکهاتەی بوونەوەر)) [1] لەم بارەیەوە ئەفلاتوون دەڵێ: ((دەبێ لەسەرەتای بوونی هەموو جوانییەکەوە جوانی هەوەڵی هەبێ، کە ئەو شتانە جوان دەکا کە پێیان دەڵێن جوان و، تەنیا بە ئامادەبوونی ئەو جوانییە هەوەڵییە بە هەر جۆرێ ئەو شتانە جوان دەبن)) [2] دواتر فەیلەسووفی بەناوبانگ ((ئەرستۆ بە جۆرێکی تر دەڕوانێتە جوانی و، سێ مەرجی سەرەکیی بۆ داناوە کە ئەمانەن: یەکێتی، ڕێکخستن، ڕێژە)) [3] هەروەها سەبارەت بە جوانی هیگڵ دەڵێ: ((ئێمە هەبین و نەبین، هەستی پێ بکەین و نەکەین پەڕی تاوس جوانە، گوڵ دڵگیر و جوانە، بەلاّم بە باوەڕی من شتەکە نسبیە و بەپێی هەڵوێستی خەڵکی و دۆخ و کات و شوێن ئەگۆڕێ و، هەندێ شت بەلای منەوە جوانە و هەندێکی تر بەلای خەڵکی وا نییە))[4]. لەم بارەیەوە ((کانت گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە لەزەتی جوانی بەستراوە بە خودی سەرنجدەرەوە،

---

(١) محمد جلوب فرحان، دراسات في فلسفة التربية، مطبعة التعليم العالي، موصل، ١٩٨٩، ص٤٩.

(٢) کەمال مەمەند میراو دەلی، فەلسەفەی جوانی و هونەر (ئیستاتیکا)، چاپی دووەم، ل١٤.

(٣) ليلى عثمان عبدالله، شعر الطبيعة بين ابراهيم ناجى و گوران، رسالة الماجستير، كلية اللغات، جامعة سليمانية، ٢٠٠١، ص٢٩.

(٤) حمید عزیز، سەرەتایەك لە فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان، چاپی دووەم، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل٧٤.

نەك بابەتەوە)[1]، بەم شێوەیە دەبینین گەلێ خوێندنەوە و تێڕوانینی جیا جیا بۆ جوانی هەیە، هەروەك شاعیری بەناوبانگ بۆدلێر بەم جۆرە گوزارشت لە جوانی دەکا و دەڵێ: ((ئایا لە ئاسمانەوە هاتوویت یان لە دۆزەخەوە ئەمەیان بایەخی نییە، ئاخ ئەی جوانی........!)) [2]بێگومان هەریەکە لە جوانی و ڕاستی لە بۆتەیەکدا تواونەتەوە و وەها ئاوێتەی یەکتر بوون، کە هەرگیز توانای لێك جیاکردنەوەیان نییە، بۆیە شاعیری فەرەنسی ((ئەلفرێد دی مۆسیە)) دەڵێ:((ڕاستی نییە بێ جوانی بێ، جوانیش نییە بێ ڕاستی بێ))،[3] بەلاّم ئەمە واتای ئەوە نییە کە جوانی لە هەموو شتێکدا هەبێت و لای هەموو کەسێك وەك یەك بێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە جوانیی شتەکان و پێوەری ئەو جوانییە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە و دەگۆڕێت، هەروەك (((دێڤید هیوم) حوکمی ئەوە دەدات، کە جوانی لە چاوی وەرگرەکە، یا بینەرەکە دایە))[4]. هەندێك لە فەیلەسوف و ڕووناکبیرانی تر، جوانی بەهەستەکانی مرۆڤەوە دەبەستنەوە، بۆ چێژوەرگرتن لە جوانی. مارکس دەڵێ: ((هەستەکانی ئێستاتیك وەها هەستێکن، دەبنە سەرچاوەی چێژوەرگرتن))[5] ئەمەش تەواو لەگەڵ بۆچوونی دەروونزانەکان یەك دەگرێتەوە کە (دەڵێن ئەو هێزەی کە جوانیی دەقی ئەدەبی پێ دەپێوین، پێی دەوترێت ((چێژ))، کە مرۆڤ هەست بە خۆشی و چێژ دەکات لە دەقە هونەریەکاندا و ئەم پێوەرە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت))[6] لە نێوان مرۆڤ و جوانیدا هێزێکی موگناتیسی بەهێز هەیە، کە وای لە مرۆڤ کردووە لە سنووری ئەم خولگەیەدا بسووڕێتەوە و نەتوانێ خۆی لێ دەرباز بکات. ((جوانی ئەو ڕاستیەیە جەخت لەسەر کێشکردنی هونەرمەند بۆ لای خۆی دەکات، لە هەمان کاتدا لە سەرووی خێر و ڕەوادایە، چونکە خێر و ڕەوا هەمیشە جوانە،

---

(١) کەمال میراو دەلی، فەلسەفەی جوانی و هونەر، ل٢١.

(٢) کەریم دەشتی، ئەدەب و فەلسەفە، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل٤٥٢.

(٣) د.محمد عنیمی هلال، الرومانتیکیة، ص١٧.

(٤) چارلس برێسلێر، ڕەخنەی ئەدەبی و قوتابخانەکانی، و: عبدالخالق یعقوبی، چاپییەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢، ل٣٣.

(٥) ئیحسان تەبەری، ئیستاتیك و هونەر، و: هێدی، چاپییەکەم، ئەڵمان، ١٩٩١، ل١١.

(٦) ئامانج عوسمان محەمەد، سایکۆلۆژیەتی دەقی ئەدەبی، گ. ڕامان، ژ ٢٠، شوباتی ١٩٩٨، ل٢٦.

هونەرمەندی داهێنەر بەدوایدا دەگەڕێ))[1] جوانی پێویستیەکی ژیان و هونەرە، بێ جوانی هیچ کام لەمانە دروست و تەواو نابن و پرۆسەی داهێنان و گۆڕانکاری ڕوو نادات، ((بەهای جوانی ئامانجی هێنانە کایەی گونجان و ڕێکخستن و جوانییە لە کاری هونەری دا)) [2] بەم شێوەیە بڕیاردانی جوانی و دزێوی شتەکان دەگەڕێتەوە بۆ ئادەمیزاد خۆی و جۆری هەڵسوکەوتکردنی لەگەڵ بابەتەکەو هەڵوێستی تایبەتی خۆی بەرامبەری. لێرەوە زۆر جار هونەرمەند بابەتی ناشیرین و دزێویش دەکات بە بابەتی هونەرەکەی و لە بۆتەی جوانیدا دای دەڕێژێت. (نالی) دیمەنی خێلیی چاوی دڵدارەکەی کە بەلای خەڵکەوە شتێکی دزێوە، بەم جۆرە باس دەکات:

**پێم دەڵێن مەحبووبە خێل و قیچە مەیلی شەڕ دەکا**
**خێل و قیچە یـا تەرازووی نازی نەختێ سەر دەکـا**[3]

مەرج نییە هەموو شتێك جوانییەکی ڕاستی و ڕەهای هەبێت بۆ ئەوەی سەرنجی شاعیر یان هونەرمەند ڕابکێشێت، یان بەشێوەیەکی زەق و دیار و ئاشکرا جوانیی خۆی بنوێنێ، بەڵکو ((زۆر جار وادەبێ شاعیر لە شتی کەمنرخ و کەمبایەخ جوانی دەردەبڕێ، نەوەك بچێ لە شتی جوان و ڕازاوە و بەنرخ ئەم کارە ئەنجام بدات. هەروەك گۆران کردوویەتی)) [4].

**کـــانییەکی ڕوونی بەر تریفەی مانگە شەو**
**لــــە بنیا بلەرزێ مرواریی زیـــخ و چـــەو**
**جوانترە لــە لای من لـــە دەریای بێ سنوور**
**شەپۆلی باتە بەر تیشکی خۆر شلێپ و هووڕ**[5]

---

(١) علی عبدالرزاق محمود، النقد الادبي الحديث، دار الحكمة للطباعة و النشر، بغداد، ١٩٩١، ص٣٠.

(٢) د.محمود عبدالله الخوالدة، د.محمد عوض الترتوری، التربية الجمالية علم النفس الجمال، ط ١، دار الشروق للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٦، ص١٣٨.

(٣) کەمال میراودەلی، هەمان سەرچاوە، ل١٦.

(٤) کەریم مستەفا شارەزا، جوانی لە شیعردا، گۆڤاری کاروان، ژ ٧٩، ١٩٨٩، ل٣٤.

(٥) گۆران، دیوانی گۆران، ل٤٦.

ئەوەی لێرەدا جێی ئاماژە پێکردنە ئەوەیە کە بەهای جوانی لای هەریەکە لە هێمنی شاعیر و محەمەدی نووری گلۆڵانی سیما و تایبەتمەندی و جوداکاریی خۆی هەیە و ئەم ڕاستیەش لە دووتوێی شیعرەکانیاندا بەڕوونی بەدەر دەکەوێت و خۆیان دەنوێنن.

هێمن توانیویەتی بە سەلیقەیەکی جوان و تێڕوانینێکی وردی فەلسەفیانە ناخی جوانی بخوێنێتەوە و زیرەکانە هەموو تەم و مژێك لە ڕووی شتە جوانەکان بڕەوێنێتەوە، وەك مەلەوانێکی شارەزا بە قووڵایی دەریای ڕاستی و کاریگەری جوانیدا بچێتە خوارەوە. بەشێوەیەك گیان و جەستەی وەها لە گەڵ جوانیدا تواندۆتەوە و ئاوێزانی یەکتر بوون و ڕەنگ و بۆنی یەکتریان گرتووە، هەر ئەم پەیبردنەی شاعیریشە وای کردووە کە شیعرەکانی جوانی و ناسکیان لێ بباریٚ. ((ئەو دنیایەی لە شیعر و هەڵبەستەکانی هێمندا دێتە وجود، زۆر لە دنیای واقیعەکە جوان و دڵگیر و ڕازاوەترە، یا لانی کەم مرۆڤ بەهۆی ساز و ئاهەنگی ئەم شیعرانەوە پەی بە ڕادەی جوانیی ئەو دنیایە دەبات)).[1] هێمنی شاعیر هێندە تامەزرۆ و شەیدای جوانی بووە، تا ڕادەی سۆفیەتی و توانەوە و فەنابوون بەتایبەتی لە بەرامبەر جوانیی ژندا، دەڵێ: ((من تا ئێستاش جوان پەرستم و هیچ جوانییەکیشم پێ لە کچ جوانتر نییە بەلاٚم لە تەواوی ژیانمدا، هەرگیز هیچ جوانییەك نەیتوانیوە، زەوقی من ڕازی بکا، چونکە پێم وایە لەویش جوانتر هەیە و جاریٚ تووشی نەهاتووم)) [2] لێرەدا لە خوێندنەوەی وردی ئەم وتەیەی شاعیرەوە دەگەینە ئەو ڕاستیەی کە جوانیی ڕەها لای شاعیر نییە و لەهەمان کاتدا هەست بە بوونی بۆشاییەك لە دەروونیدا دەکرێت، کە هەرگیز توانای پڕکردنەوە و تێربوونی نییە. ئەمەش بە تەواوی لە ژیانی ماسی دەچیٚ هەرچەندە لەناو ئاوە، کەچی هەمیشە تێنووە.

بەڵیٚ شاعیر جوانی لە ئاسمان و خۆی لە زەویدا دەبینیٚ، بۆیە بەشێوەیەکی ڕۆمانسیزمانە هەستی خۆی دەردەبڕیٚ و دەڵیٚ:

**هـــونەر ناتوانیٚ جوانیی تۆ بەهیچ شێوەیێکی بنوێنیٚ**
**لە مەڕمەڕ چۆن دەتاشریٚ هەیکەلی ئەم بەژن و بالاٚیە[3]**

---

(١) عوسمان دەشتی، هێمن دەربارەی ناوەرۆکی سیاسی و کۆمەلاٚیەتی شیعرەکانی، ل٩٨.

(٢) د. شوکریە ڕەسول، دوو نامەی (هێمن)ی شاعیر بۆ شوکریە ڕەسول، گۆڤاری ڕامان، ژمارە (٥٢)، ٥ تشرینییەکەم (٢٠٠٠)، ل٢٩٩.

(٣) هێمن، تاریك و ڕوون، ل١٣٣.

بەلاّم سەبارەت بە بەهای جوانی لای شاعیری هەست ناسك محەمەد نووری گلۆلاّنی، دوای خوێندنەوەیەكی ورد دەگەینە ئەو ڕاستیەی، كە بەهای جوانی لای ئەو جۆر و شێوازێكی ترە و لە ڕەنگ و بەرگێكی تردا خۆی نیشان دەدات. ئەمەش بەتەواوی لەگەڵ ئەم بۆچوونەی (هیگڵ) یەك دەگرێتەوە، كە لە پێشەوە ئاماژەمان پێ كردووە. چونكە محەمەد نووری شاعیر، زیاتر بەهای جوانی بەتایبەتی سروشتی گیاندار دەبەستێتەوە بە ئاستی پایە و پێوانە و بەها ئایینی و كۆمەلاّیەتیەكان كە لە خوو نەریت و هەڵسوكەوتی مرۆڤ و ئەركە مرۆڤایەتیەكاندا خۆی دەدۆزێتەوە، هۆكاری ئەمەش لەوانەیە بگەڕێتەوە بۆ ئەو ژینگە و بارودۆخ و كات و شوێنەی شاعیر و، جیاوازیی هەڵوێست و ڕەوشی دەروونی و فیكری و باكگڕاوندی ڕۆشنبیری و ئەزموونی شیعری.

## ١- جوانیی سروشتی لای : هێمن و محەمەدی نووری.

سروشت دایكی هەموو شتێكی جوانە. هەموو جوانییەك لە سروشتەوە هەڵدەقووڵێ و چاوی هەڵدێنێ، بۆیە هەر لە سەرەتاوە بۆتە جێگای سەرنج و تێڕامان و بیركردنەوە و ورووژاندنی هەست و نەستی ئەندێشەی مرۆڤ و، شوێنەواری ئەم كاریگەریەی لەلا دەركەوتووە. هەرچەندە ڕادەی ئەم كاریگەریەش لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی تر بەپێی بارودۆخ و كات و شوێنەكان دەگۆڕێ، بەتایبەتی لای شاعیرانی ڕۆمانسیزم و ئەوانەی هۆگر و هاودەم و تامەزرۆی سروشتن، خەون بە دیمەنەكانی سروشتەوە دەبینن و، نهێنییەكانی ئەو جوانییە سەرسوورهێنەرانەی كە سروشت هەیەتی، مەلی خەیاڵ و ئەندێشەیان دەفرێنێ و ڕامان و لێكدانەوەیان لا دروست دەكات و، زۆر جاریش لای مرۆڤی هەستیار و شاعیر و فەیلەسوفەكان دەبێتە هەوێنی خورپە و بەهرەی گەورە بۆ خولقاندنی بەرهەمی پڕ داهێنان و گۆڕانكاری. بۆیە ((ڕۆسۆ)) هەمیشە داوای ((گەڕانەوەی بۆ باوەشی سروشت))[1] دەكرد و، بەلانەیەكی جوان و پاك و ئارامی دادەنا. ((كانت)) جوانیی سروشت وا پێناسە دەكات، وەكو دیاردەیەك كە سەرنج كێش دەكات بە بێ چەمك. دەبێت بینەر بە شێوەیەكی بالاّ و ئەبستراكت تێی بڕوانێت. بەلاّم هیگل هەوڵ دەدات بەڵگە لەسەر ئەوە بەدەست بێنێت كە جوانیی هونەری بالاّ

(١) ليليان فيرست، نفس المصدر، ص١٥.

دەستترە.[1] دیارە جوانیی سروشت وەك هەر هەموو جوانییەك لە دیدی مرۆڤەکاندا ڕێژەییە و لە گۆڕاندایە، کە ئەمەش بۆ گەلێ هۆی خودی و بابەتی دەگەڕێتەوە. واتە ئەو شتەی کە لای من جوانە لەوانەیە لای کەسێکی تر جوان نەبێت و، هەمان ئاست و ژمارەی پێوانەیی نەبێت. بە پێچەوانەوەش لەوانەیە کاریگەری و ورووژاندنێکی ئەوتۆ دروست بکات، کاردانەوەی هەبێت. ((بەلای کرۆچێوە، ئەوشتەی لە سروشتدا جوانە مانای ئەوە نییە کە لە هونەریشدا جوان بێ. هەروەها شتێ کە لە سروشتدا دزێو بێت، مانای ئەوە نییە کە لە هونەردا ناشێ جوان بێت))[2] پایە و ئاستەکانی جوانیی سروشت هێندە بەرزە و ڕووبەرێکی وەها گەورەی لەسەر هۆش و دەروونی مرۆڤ هەیە کە سەدان خوێندنەوەی بۆ دەکرێ وەك دەبینین ((لای کیتس keats- سروشت سەرچاوەی جوانی و هەموو بەهایەکی خێر و شەرەف و چاکەیە. بەلاّم لای (شیللی – shelley) سروشت هێمای ڕاستگۆیی و دڵسۆزی و تێگەیشتن و گونجانێکی تەواوە. سروشت لای (ۆردز ۆرث – words worth) شتێکی پیرۆزە و چاوگەی هەموو شتێکی چاك و دادپەروەرانەیە))[3]. سروشت تەنیا ڕووبەرێکی دیاریکراو نییە. بەڵکو پەناگەیەکی ئاسوودە و دایکێکی دڵسۆزە لەو کاتانەی غەم و ناخۆشی و مەینەت و ئێش و ئازار هێرشمان بۆ دێنن و دەمانخەنە دڵڕاوکێ و بێزاری و نیگەرانییەوە. هەرچەندە ئەو سروشتە بیابانێکی لماوی و گەرمەسێری سەخت و دژوار و ناخۆش بێ، یان دەشت و شاخ و گرد و چیاو ناوچەیەکی جوان و ڕازاوە و سەرنجڕاکێش و دڵڕفێن بێت. بۆیە ((ولیەم بلێك) وای بۆ دەچێ کە سروشت هەر هەمووی واتای خودی خەیاڵە. ئەو جوانیی جیهان لە دنکە لمێکدا و جوانیی ئاسمانیش لە گوڵێکی کێوی دا دەبینێ))[4]. بەم شێوەیە گەلێك بیروڕای جۆراوجۆر دەربارەی جوانیی سروشتی هەیە ((هەندێك پێیان وایە سروشت هەر لە خۆڕا جوانە، بۆیە سەرچاوەی ئەم جوانییە هەر سروشتە، هەندێکی تریش پێیان وابوو کە جوانی لەلایەن مرۆڤەوە ئاشکرا

---

(١) بیرڤی. زیما، هەڵوەشاندنەوەی گەرایی، و: ڕێبین ڕەسول ئیسماعیل، چاپییەکەم، دەزگای ڕێبین بۆ چاپ و پەخشی کتێب، هەولێر، ٢٠٠٤، ل١٢.

(٢) کەمال میراودەلی، هەمان سەرچاوە، ل ١١٠.

(٣) د.کمال معروف، الحركة التجديدية في الشعر الكردی المعاصر (١٩١٤ – ١٩٦٥)، ص١٩١.

(٤) روبرت جلكنر و جيرالد انسكو، نفس المصدر، ص٢٨٩.

کراوە، دەربڕاوە))[1] بەمەش دەگەینە ئەو ڕاستییەی ئەگەرچی ((سروشت جوانە، بەلاّم دەق هۆیە، وەسیلەیەکە بۆ دەربڕین)) [2]. چونکە سروشت هێندە فراوان و پڕ نهێنی یە، هیچ کەسێك ناتوانێت پەی پیّ ببات، مەگەر تەنیا بەخەون و خەیاڵ نەبێت، یان بەهۆی شیعرەوە ڕێنوێینی بکرێت. بۆیە (سولوموس) دەڵیّ: ((سروشت سحر و خەون و جوانی و لار و لەنجەیە و لە هەزارەها سەرچاوەوە هەڵدەقووڵیّ)) [3] ڕۆمانسیزمەکان لەگەڵ سروشتدا وەك ماسی و دەریا و باڵندە و دارستانن، هیچیان بیّ یەکتر هەڵناکەن، ((شاعیری ڕۆمانتیك بەوپەڕی شەیدا و عەشقەوە بە بالاّی جوانی سروشتدا دەڕوانێت و تامەزرۆی ژیانی ئامێزی گەرموگوڕ و پڕسۆزی سروشتە))[4] کەس نییە جوانیی سروشت هەست و سۆزی نەبزواندبیّ و، لە ناخەوە نەی هەژاندبیّ و، تاڕادەی ئاوێتەبوون بەخۆیەوە پەیوەست نەکردبیّ. بەتایبەتی شاعیران و نووسەران و هونەرمەندان پەیوەندیەکی زۆر پتەویان لەگەڵ سروشتدا هەیە. لەگەڵ هەموو دەنگێکی ئەم سروشتە دەیان شیعر و بەرهەم و هەستی جوانی پڕ سۆز و ئاواز. لەگەڵ هەموو ڕەنگێکی دا سەدان وێنە و ڕووخساری ڕۆمانسیزمانەی ناسك و گەش. لەگەڵ هەر تاموبۆنێکی دا بە هەزاران دەربڕین و گوزارشتی نەرم و نیان، لە نەبوونەوە دێتە بوون. شاعیرانی ڕۆمانسیزم بە زۆری سروشتی گۆڕاو و غەماویان پێخۆش بوو، کە لەگەڵ دەرونی گۆڕاو و نیگەران و دوور لە واتا و ئاسوودەیی خۆیان دەگونجا. کە ئەمانەش پەیوەندیان بە بیرکردنەوە و چارەنووسی ڕۆمانسیزمیەکانەوە هەبوو. هەر لەبەر ئەوە دەبینین شاعیرانی ڕۆمانسیزم ئاهەنگ دەگێڕن بە شەوانی تاریك و درێژی پایز و ڕووت و زیز و بەگوڵی هەڵوەریوو و کەوتنەخوارەوەی گەلاّی دارەکان و ڕەنگی زەردی خەرمانەی مانگ و بە شەپۆلە پچرپچر و شێتەکانی کەنار دەریا، گۆرانی دەڵێن بۆ ڕووباری جوان کە بەردەوام دێت و دەڕوات لە پاڵ ئەماندا شاعیر باس لە ئازار و ناخۆشیەکانی دەکات و چیرۆکی هیوا و خۆزگە و

---

(١) سەلیم ڕەشید سالّح، شێواز لە کورتە چیرۆکی کوردیدا، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل١٦.

(٢) ئامانج عوسمان محەمەد، هەمان سەرچاوە، ل٢٦.

(٣) مجموعة من مؤلفين، تأريخ الاداب الاوروبية، القسم الثالث، ت، صباح الجهيم، وزارة الثقافة، سورية، دمشق، ٢٠٠٢، ص٢٢١.

(٤) حەمە سەعید حەسەن، شیعری ڕۆمانتیك، گۆڤاری ڕۆمانسی، ژ ١، بەهاری ٢٠٠٧، ل٦.

ئاواتەکانی بۆ ژیان دەگێڕێتەوە[1]. سروشت بەهەشتی خەونەکانی شاعیران و نووسەرانی ڕۆمانسیزم بوو، چونکە ئەوان لە هەموو تەنگانە و سەختی و دژواری و ناخۆشیەکدا خۆیان دەخستە ئامێزی سروشت و پێیان وابوو تەنیا بە نزیکبوونەوەی سروشت پرۆسەی پاکبوونەوەی دەروونی جێبەجێ دەبێت. هەموو ئەو ڕاستی و پاك و بێگەردیە بێهاوتایە و ئەو جوانییە خواییەی کە لە باوەشی ئەوە دا لە نێو جیهانی بالاّ (میثالی)دا هەیە دێتە دی. بۆیە دەیانویست لە ژیانی ئالۆز و پڕ ئاریشەی شار دوور بکەونەوە و، ڕوو بکەنە چیا و شاخ و دەشت و چۆم و دارستان و سەرکانیلە و کەنار دەریا و ڕووبار و دۆڵ و کەند و پێ دەشتەکان و لە لادێ کان بەسادە و ساکاری بژین، چونکە ڕۆمانسیزمییەکان ملکەچی هەست و سۆز و ئەندێشەن و تامەزرۆی دیمەنە جوانەکانی سروشتن ((جبران خلیل جبران سالّی ١٨٨٣ — ١٩٣١ کە زۆربەی تەمەنی لە ولاّتێکی وەك ئەمریکادا بەسەر بردووە، دوور بوو لە باخ و بێستان و دولّ و دەشت و تاڤگە جوانەکانی لوبنان لە نامەیەکدا بۆ میخائیل نەعیمەی هاوڕێی ناردووە دەڵێت: هاوڕێم تۆ بلّێی ئەو کاتە بگات کە هەناسەیەکی ئۆخەی لە دارستانە چڕەکەی دۆلّی ((دیرمار سرکیس))دا هەلّکێشم. تۆ بلّێی ڕۆژگار بمهێنێتەوە بۆ باوەشی گوندی ((بوشرێ)) زستانان لە ناو بەفرەکەیدا بتلێمەوە)) [2] شاعیری ڕۆمانسیزم لە میحرابی جوانی سروشتدا بە سەرسامی دەوەستێت و هانای بۆ دەبات و ستایشی دەکات. تا لە بەردەم گەردەلوولی بێبەزەییانەی ڕۆژگاری ڕەش و ژیانی تاڵ و ئالۆزی پڕ ئێش و دەرد و ئەشکەنجە فریایان بکەوێ. شاعیرانی کوردیش، ئەوانەی هەمیشە قەلّغانی تیری غەم و ناخۆشی و مەینەت و دەردەسەری و هەژاری و ژێردەستی و کوێرەوەری و ئاوارەیی و دەربەدەری و نامۆیی و دوورە ولاّتی بوون، هەرگیز بۆ ساتێکیش جوانیی سروشتیان فەرامۆش نەکردووە، تەنانەت ((زۆربەی هۆنەرانی کورد ئەو سروشتە جوانەی کوردستان کە لە هەر وەرزێکدا بەشێوەیە خۆی دەنوێنی و خۆی دەڕازێنێتەوە، کارێکی زۆری تێکردوون و هۆنراوەی جوانیان بۆ هۆنیوەتەوە))[3].

---

(١) طلعت عبدالعزيز أبو العزم، الرؤية الرومانسية للمصير الانساني لدى الشاعر العربي الحديث، الهيئة المصرية العامة لكتاب، قاهرة، ١٩٨١، ص١٠٥.

(٢) ئومێد ئاشنا، دەربارەی ئەدەب و مێژوو، چاپخانەی داناز، سلێمانی، ٢٠٠١، ل٢٨٨.

(٣) حوسێن محەمەد عەزیز، یاقووت و زمرۆتی کوردی(سروشتی جوانی)، بەرگی سێیەم، چاپخانەی سیما، کوردستان، سلێمانی،٢٠٠٧، ل١٦

ئەگەر شیعر زادەی خەندەی شیرین و فرمێسکی گریانی تاڵ بێ، ئەوا لای هێمن و محەمەدی نووری، جودایی لە سروشتی دڵگیر و ڕەنگین و نەخشین بووە، لە کوێستان و کێو و بەندەن و پێ دەشت و هەوراز و تەلان و مێرگ و نەواڵە و دەریا و ڕووبارەکان و کێڵگە و بەیار و بژوێن و زەبەند. جودایی لە ڕەشماڵان و کیژۆڵەی چاوکاڵ و گەردن بەخاڵ و چاو بەکل و گوێ بەگوارە و ناسك و نەرم و نۆڵ و خاوێن و سپی و سۆڵ و بەلار و لەنجە و توندوتۆڵ و شۆخ و شەنگ و بەژن ڕێك و خڕوپڕ و نەشمیل و دەم بەخەندە و نازەنین و چاومەست بووە. بۆیە دەبینین هەریەکە لە شاعیران هێمن و محەمەدی نووری بۆ مەرهەمکردنی دەروونی پڕ لە ناسۆریان و چارەسەری دەردی دڵیان و پتەوکردنی هێزی ئەژنۆیان و بەتینکردنی سۆمای چاویان و خۆشی بەخشی و، ئارامی دەروونیان پەنایان بردۆتە بەر ڕەگەزەکانی سروشت و هانایان بۆ ڕۆژ و شەو و مانگ و ئەستێرە و چیا و گرد و دەشت و دۆڵ و شاخ و ئەشکەوت و دەریا و ڕووبار و دارستان و باخ و بێستان و درەخت و گوڵزار و چیمەن بردوە، لەگەڵ وەرزەکانی ساڵ دا ئاوێتە بوون و دواون ٠ هێمن لە کاتێکدا شاعیرێکی لێهاتوو و بێ وێنە بووە لەهەست و سۆزی ناسکی ڕۆمانسیزمیدا لە هەمان کاتیشدا وەك فەلەکناسێکی بەتوانای شارەزای گەردوون. وەك مەلەوانێکی بێهاوتا لە قووڵایی دەریادا وەك دوڕناسێك زیرەکانە پەی بە نهێنییەکان بردووە، توانیویەتی هەموو ئەو شتە جوان و شاراوانە بدۆزێتەوە، کە هەست پێکردن و بینینیان لە لایەن کەسانی ترەوە ئاسان نییە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دووربینی و گەورەیی و فراوانی ئەزموونی شیعری و خەیاڵ و ئەندێشەی شاعیر و ناسکی و نەرمونیانی هەست و نەستی و پاکی و ڕاستگۆیی دڵ و دەروونی. بۆیە دەبینین شاعیر وەستایانە باسی زۆربەی ڕەگەزەکانی سروشتی کردووە، یان ((ئەگەر هەڵبەستی جوانی بۆ کوردستان نووسیبێ ئەوا بەهەق مافی وێچوو سروشتی خۆی داوەتێ و وەك ئەوین بەسەریدا هەڵگوتووە و، پێداهەڵگوتنێکی ڕاستەقینە و ڕۆمانسیانە)) [2]. بەم شێوەیە هێمنی دڵناسك و جوانپەرست، هەست دەبزوێ و لە باسی وەرزی بەهاردا لە قاڵبێکی ڕۆمانسیزمیدا لە هۆنراوەی (بەهاری کوردستان) وێنەی جوانی و ڕازاوەیی سروشتی کوردستانمان بۆ دەکێشێ و دەڵێ:

---

(١) سوارە قەڵادزەیی، دیالۆگێك لە دیداری (هێمن)ی گەورەدا، گ کاروان، ژ٢١٣، ٢٠٠٧، چاپخانەی منارە، هەولێر، ل٣٤.

شـەماڵ هات بــە گاڵە گاڵ
هــــەور بوون گەواڵ گەواڵ
پشکووت گوڵی گەش و ئاڵ
بلبل کـــــەوتە ناڵــە ناڵ
***

بــــــە لەنگێزە بە باران
بـــــــە شنەبای بەهاران
تـــــوانەوە وەك جـــاران
کـــــــەوی بەفری نســاران

{ تاریك و ڕوون ل ١٠٤ }

لێرەدا هێمن وێنەیەکی فۆتۆگرافی وەرزی بەهاری کوردستانمان لە چوارچیوەیەکی ڕۆمانسیزمیانەدا پێشان دەدات و، بە تەواوی بەناخی جوانیی سروشتدا شۆڕ بۆتەوە و، بە هەموو کون و کەلەبەرێکی ئاشنا بووە و، لە هەموو نهێنییەکانی گەیشتووە و، زۆر بە وردی شتە جوان و پڕ نرخ و بەهاکانی تێدا دۆزیوەتەوە و لێ ورد بۆتەوە و قسە و لێکدانەوەی لەسەر کردووە. پەیوەندیی ئەو بە سروشتەوە دەروێشانەیە بۆیە دەبینین زۆر وەستایانە و لێزانانە و هونەریانە جوانی سروشت لە بۆتەی شیعرەکانی تواندۆتەوە و جوانترین و نایابترین نیگاری سروشتمان بۆ دەکێشیت و دەیخاتە بەرچاومان.

هێمن لە وەسفی وەرزەکانی ساڵدا زیاتر باسی زستان و پایزی کردووە. بەتایبەتی وەرزی پایز لای شاعیرانی ڕۆمانسیزم بە گشتی و لای هێمن بەتایبەتی بەشی شێری وەرگرتووە و پانتایەکی فرەوان و گەورەی هەیە، چونکە ڕەنگ و ڕوخسار و سیماکانی ئەم وەرزە کۆك. تەریبە لەگەڵ دەروونی تاریك و خەماوی شاعیر. ((شاعیر لە گێژەڵووکەی بەسام و توندی خەزان دەسڵمێتەوە و بەوە تاوانباری دەکات کە پەلاماری باخ و ڕەز و نەمامی شلك و تەڕو گوڵی بۆنخۆش بەرامبەر پەڕەپەڕە دەکات و جوانی سروشت ئەشێلێ و خەنەی بووکی سروشت دەشواتەوە)) (١).

---

(١) هیوا عومەر ئەحمەد، دینامیکی و بیرۆکە و شاعیری لە نێوان هێمن و هەڵمەت دا، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ٦٦، ئاداری ١٩٧٨، ل٨.

بەم شێوەیە دەبینین هێمن بەشێوەیەکی کارامە و هونەرمەندانە هەڵسوکەوتی لەگەڵ دیمەنەکانی وەرزی پایز کردووە، جیهانبینینی خۆی بەشێوەیەکی ناسك و جوان پێشانداوە. شاعیر لە هۆنراوەی (ئێوارەی پایز) هەناسەی پڕ خەم و ئێش و ناسۆری خۆی لە تابلۆی ئێوارەیەکی پایزدا بە ڕەنگ و ڕوخسارێکی کز و ڕووت و مات و زەردی خەزانە دەربڕیوە. گوزارشتی لەو پایزە ڕەش و شوومە کردووە و لە فرمێسکی گەش و پەڵە هەورێکی چڵکن و شەوگاری تەنیایی و دوور و درێژی نائومێدی شیعرێکی ڕۆمانسیزمیانەی داڕشتووە و وشەکانی لە ڕەنگی گەڵای سیس و ژاکاوی ئەو گوڵ و گوڵزار و درەختانە پێك دێت کە سەرما و تۆفان و ڕەشەبای بێبەزەییانەی ڕۆژگار هەڵیوەراندوون و بەرەو ئۆقیانوسێکی بێ ئومێد و نادیار ڕاپێچی کردوون. ڕستە و دێڕی شیعرەکان بۆن و بەرامی پایزیان لێدێت و ئاوێتەییەکترن و بوون بە یەك شت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دژواری و ناخۆشیی ئەم کات و شوێن و بارودۆخەی هێمنی شاعیر کە تێیدا ژیاوە، بۆیە دەڵێت ((چ بکەم !! وەختێکی من شاعیری نەتەوەیەك بووم کە هەمووی بۆ خۆی غەم و داخە، منیش هەر غەم و داخم دیووە، لەبەروەی شیعرەکانم هەمووی بۆنی غەمی لێ دێ)) [1].

شیعری ((ئێوارەی پایز)) نموونەیەکی بەهێز و کاریگەر و، ڕەنگدانەوەی غەم و مەینەت و ماتەمی و دزێویی وەرزی پایزە، بەسەر شاعیرەوە و، ڕاستیەکی بەڵگە نەویستیشە بۆ سیحری توانا و دەسەڵات و لێهاتوویی شاعیر بۆ مامەڵەکردنی لەگەڵ سروشتدا و دەڵێت:

**لە ئاسۆیەکی دوورە دەست**
**ئـــاوابوو زەردە پــــــایزی**
**دەتــگوت بووکێکی بێ نازە**
**پـــەردە جێ دێڵێ بە زیزی**

**{ ناڵەی جودایی ل ٣٦ }**

هێمنی شاعیر وا دەبینێت لە ژیانێکی دوورە دەست و پڕ لە ئاسۆ و ڕووناکیدا کاتێ پایز ئاوا دەبێ، کۆچ و باری بەرەو هەوارێکی تازە دەبات. وەك ئەو بووکە بێ نازە وایە کە لە ژێر فشاری توندوتیژی و ناخۆشیدا بێ حەز و خواست و ویستی خۆی، بە ناکامی و غەم و کز و

(١) هێمن چەپکی گوڵ و چەپکێ نێرگز، چ ٢، چاپەمەنی و ئینشاراتی ڕەهرو، مهاباد، ١٩٩٩، ل١١٥.

پەرۆشەوە و بە چاوانی پڕ لە فرمێسك و گریانەوە و بە هەناسەیەکی ساردەوە پەردەی بووکێنی بە جێدێڵێ و بەرەو چارەنووسێکی نادیار هەنگاو دەنێ.

پاشان شاعیر کە دەزانی، ناتوانێ بگاتە ئامانج و بووکی خۆزگە و مەبەستەکانی لە ئامێز بگرێ، بەرچاوی تەنگ دەبێت و، ڕەشبینی بەسەریدا زاڵ دەبێت. هەموو شتێکی ئەم جیهانەی بەشووم و دزێوی دێتە بەرچاو و دەڵێت:

**تــەماشای هەر شتێ دەکەم**

**ڕەنـــــگی پـــایزی گرتووە**

**جوانی خۆی لێ شاردوومەوە**

**دزێـــــــوی ریــــزی گرتووە**

{ ناڵەی جودایی ل ٣٩ }

هێمنی شاعیر کە دەبینێ ژیان وەها زاڵمانە دەستی مەرگ بۆ گەرووی ئازیز و خۆشەویستانی ڕادەکێشێ دەیانخاتە ئامێزی گێژەڵووکەی خەزان لە ناخەوە دەورووژێ و هەست و سۆز و دڵ و دەروونی دەکەوێتە جۆشوخرۆش و لە شیعرێکی وەك (گێژەڵووکەی خەزان)دا کولۆکۆی خۆی هەڵدەڕێژێ و دەڵێت:

**گێژەڵووکەی بەسام و توندی خەزان**

**کـــــە پەلاماری دایە باخ و ڕەزان**

**دەشـــــــکێنی نەمامی شلك و تەڕ**

**گـولّی بۆنخۆش و تەڕ دەکا پەڕ پەڕ**

**{ تاریك و ڕوون ل١٤٠ }**

هێمن جگە لە باسکردنی وەرزەکانی ساڵ لە دوو توێی شیعرەکانیدا باسی گەلێك ڕەگەزی تری سروشتی بێگیان دەکات، وەك ڕەگەزەکانی ئاسمان و ڕۆژ و مانگ و ئەستێرە و چیا و شاخ و دۆڵ و زێ و ڕووبار و کانی و دارستان و دار و درەخت و چیمەن و ڕەیحانە و گوڵ و بولبول و پەپوولە و ئێوارە و شەو، بەڵام ئێمە لێرەدا تەنیا باسی هەندێ لەو ڕەگەزانە دەکەین کە بە ڕادەیەکی زەق و گەورە و دیار لە شیعرەکانیدا ڕەنگیان داوەتەوە، ڕاستیان وتووە کە مشتێك

نموونەی خەروارێکە. با بزانین شەو لای هێمن چی دەگەیەنێ؟ چۆن دەڕوانێتە شەو؟ چۆنی پێناسە دەکات؟ چەندەی هێمن ورووژاندبێ و کاری تێکردووە؟

شتێکی ئاشکرایە شەو هۆکارێکە بۆ دوور خستنەوەی مرۆڤ لە جەنگەڵستانی پڕ کێشە و ئاڵۆزی و واژە واژا و ململانێ و بگرەوبەردەی مانەوە و ئاخ و داخی بێزاری و گیروگرفت و ئێش و ئازارەکنی ژیانی ڕۆژ و، نزیکبوونەوە و خستنە ئامێزی شەوی ئارام و بێدەنگ و خەوی قووڵی بێ ئاگایی. شاعیرانی ڕۆمانسیزم شەویان خۆش دەوێ، چونکە پێیان وایە شەو پڕە لە ئارامی و بێ دەنگی و نهێنی و بێ ئاگایی. باڵی ڕەش خۆی دەکێشێ بەسەر ئەو شتە دیار و دزێوانەی کە لە ژیانی ڕۆژدا هەیە، ڕەشیان دەکاتەوە بۆ ئەوەی نەبێتە هۆی ئەشکەنجەدانی دڵ و دەروون. شەو لای شاعیر تاکە هاوڕێیە کە راز و نیازەکانی شاعیر رادەژەنێ و بە هێمنی غەم و خەون و خەیاڵەکانیان لەباوەش دەگرێ. بۆیە شاعیر لە ((گریانی نیوە شەو))دا هەست و نەستی خۆی لە چوارچێوەی شیعرێکی ڕۆمانسیزمیانەی پڕ هەست و سۆزی بێ پایان و ئەندێشەیەکی جوانی بێ سنوردا دەردەبڕێ و دەڵێت:

**تـــــــەك و تەنیا بە ئـــــارامی دەچم بۆ گردەکەی بەر دێ**
**بـــــەدڵتەنگی و کـــــز و خەمناکی ڕادەکشێم لەسەر بەردی**
**دەکەم جا ســـــــــــەیری ئەستێران و هەڵدەمژم شنەی شەوبا**
**شـــەو و بێ دەنگی چەند خۆشە، هەمیشە خۆزگە هەر شەو با**

{ تاریك و ڕوون ل١١٦ }

شاعیر لە (گریانی نیوە شەو)دا زنجیرە وێنەیەکی ڕۆمانسیزمی و پڕ هەست و سۆزی ناسك و ئەندێشەی چڕ و فراوانی نیوە شەومان پێشان دەدات و، لەگەڵ شەودا دەستەملان دەبێ و ڕاز و سکاڵای ڕۆژان و غەم و دەردی زەمانەی خۆی دەردەبڕێ، بەرامبەر ئەو زەمەنە ستەمکارەی کە بۆتە مایەی گریان و خەوزڕاندن و بێزاری. شاعیر جیهانێکی بێ دەنگ و خامۆش باڵی بەسەردا کیشاوە، جگە لە شەوقی ئەستێرەکان و کزەی شنەی شەوبا هیچ دەنگ و ڕەنگێك و چرپە و سیمایەك نابیسترێ و بەدی ناکرێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئاوات و خۆزگەی ئەوە دەخوازێ هەر لە شەودا بێ تا لە شەوستانی بێ دەنگیدا چاوی ئومێد قوفڵ بدا، نەبادا غەمەکانی ڕۆژگار لە پڕێکدا.

بۆیه حەزدەکا پەنا بەرێتە بەر سروشتی جوان و ببێتە هاودەمی مانگە شەو و هەڵدێر و نشێو و شاخ و کەند و خۆزگە بۆ بیستنی دەنگی بلوێری شوان و دیتن و ئاوێتەبوونی تەبیعەت بخوازێ. هەروەك لە (بلوێری شوان)دا بەم شێوەیە هەستی خۆی دەر دەبڕێ و دەڵێ:

**هــەزار خۆزگم بە خۆت شوانە**

**کــــــە بەو مانگەشەوە جوانە**

**دانیشـــــتووی لە ڕژدو هەڵدێر**

**پـــــــــەنجە دەبزێوی لە بلوێر**

**دەگــــــــەڵ تەبیعەت هاودەمی**

**شــــادی، بەکەیفی، بێ خەمی**

{ تاریك و ڕوون ل٨٩ }

- ئاسمان، وەك ڕەگەزێکی دیار و زەق و بەرچاو و سەرەکیی سروشتی بێ گیان هەر لە کۆنەوە بۆتە جێگای سەرنج و تێڕامانی خەڵك بەتایبەتی کەسانی هەستیار، وەك شاعیر و نووسەر و هەنەرمەندان. کەم کەس هەیە شەوانی هاوینان، ئەو ساتانەی دەچێتە سەر جێگای نووستن لە جێگایەکی ئاوەلاَ، سنگ و بەرۆکی ئاسمان کە بە مانگ و ئەستێرەکان ڕازاوەتەوە و هەروەکو بووکی تازە یەك شەوە سەرنجی ڕانەکێشی و، نەیخاتە دەریای بێ بنی سەر سووڕمان و بیرکردنەوە و خەیاڵ و ئەندێشەی قووڵەوە و، لە ناخەوەی دەیان پرسیار و لێکدانەوەی جۆراوجۆر دروست نەکات. ئەمەش وای کردووە کە شاعیران و هونەرمەندان بۆ گوزارشتکردن لە غەم و ئێش و ئازارەکانیان ڕەنگ بداتەوە و، ببێتە بابەتی باسەکانیان. هەرچەندە ئەم ڕەگەزە، واتا (ئاسمان) بەدەگمەن بە تەنیا باس کراوە، بەڵکو هەمیشە لە پاڵ خۆر و مانگ و ئەستێرە هاتووە، هێمن لە شیعری (شەو و شەیتان) بەم شێوەیە ڕاز و نیازی خۆی دەر دەبڕێ و دەڵێ:

**ئەستێرە یەك یەك راخوشین**

**ڕەش هەڵگەڕا ئاســمانی شین**

**هەورێك شـــۆرابەی بەرداوە**

**دەڵێی لـــــە قیریان وەرداوە**

{ تاریك و ڕوون ل١٨٠ }

لێرەدا شاعیر بە بۆنەی لە سێدارەدانی پێشەوای نەمرەوە ئەم شیعرەی نووسیوە. ئەستێرە و ئاسمان و هەوری کردۆتە پۆشاك و هاوڕێ و هاوڕازی ڕەشبینی و خەم و ماتەمی پرسەوە.

- ڕۆژ، کە جوانترین و دیارترین سروشتی بێگیانە، لە دێرزەمانەوە سەرنجی مرۆڤی بۆ لای خۆی کێش کردووە، هێمای جوانی و خۆشەویستی بووە، گەلێ جار نەك شاعیران، بەڵکو خەڵکی ئاسایش لە کاتی تەنگژە و قەیران و نائومێدیدا پەنایان بۆ بردووە و، بەسەرچاوەی هێز و دەسەلأتی بەردەوامی ژیانیان زانیوە. ئەمەش لە شیعری هێمندا ڕەنگی داوەتەوە، کاتێ دەگاتە ئەو ڕاستیەی کە شەو پەنای نادات و ئێش و ئازارەکانی ڕاناژەنێ و، لە ئاست حەز و خواست و هیواو ئاواتەکانی لاڵ و کوێرە. خۆزگە و مەبەست و ئامانجەکانی تێدا نادۆزێتەوە و ڕێگای خەباتی بۆ ڕووناك ناکاتەوە و لەسەفەردا لەگەڵ غەم و تاریکیدا بەتەنیایی بەجێی دەهێڵێ. بۆیە ناچار ڕووی پێ وەردەگێڕێ بۆ لای ڕۆژ و لە شیعری (خۆزگە)دا دەڵێ:

**خۆزگە وەك خۆر نەمدیبایە شـــەوی تار**
**خۆزگە تـــــاوێ ڕام نەبواردایە بـــێ یار**
**خۆزگە پیری کـــــــــەلەلای نەدەکردم**
**خۆزگە لـــــە یەکـــەم ژوانگەدا دەمردم**

**{ ناڵەی جودایی ل٥٩ }**

دیارە کاتی وتنی ئەم شیعرە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٧٧ ئەو دەمانەی تەمەنی شاعیر بەرەو کزی و ئێوارە و شەوی تار دەڕۆیشت و، لە ڕۆژگارێکدا کە لە ئاوارەیی و دوورە ولأتی و دوور لە باوەشی خێزان و ماڵ و منداڵەکانی ژیاوە. بۆیە دەکەوێتە ژێر فشاری بەهێز و کارانگەزی ئەمانەوە و بۆتە خورپەی هێنانە کایەی شیعری (خۆزگە)و گەڕاوەتەوە بۆ هەواری ئەوین و ژوان و لاوێتیی جارانی.

- مانگ، لە ڕەگەزە جوانەکانی سروشتی بێ گیانە و خاوەنی خەسڵەت و تایبەتمەندیی خۆیەتی لە جوانی و دڵگیریدا، لای شاعیرانی ڕۆمانسیزم خۆشەویستە و پانتایەکی فراوان و مەزنیشی لە شیعرەکانیاندا داگیر کردووە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆ:

یەکەمیان ئەوەیە کە مانگ خاوەنی هێزێکی موگناتیسی سەرنجڕاکێشە، لەگەڵ دڵ و دەروونی پڕ غەم و ئازار و ڕەنگ و سیمای زەرد و ژاکاوی شاعیرە ڕۆمانسیزمەکان دەسازێ.

دووەمیان: ڕەنگ و ڕووخسار و پڕشنگ و جوانی و شۆخ و شەنگی مانگ لەیەك ئاستی چەسپاو نییە، لە هەڵکشان و داکشان و گەشی و کزی دایە، بۆیە شاعیران بە پێی گۆڕانەکان

له گەشبینی و ڕەشبینی دا ناوەرۆك و ڕوخساری خۆیانی پێ دەچوێنن. هێمن لەم بارەیەوە له شیعری (پەری شیعر)دا دەڵێت:

**شیعرێك وەك سێبەری بژانگ**

**وەكو خەرمانەی دەوری مانگ**

**{تاریك و ڕوون ل١٥٨}**

لێرەدا شاعیر بە شێوەیەكی ڕۆمانسیزمانە و هونەریانە و بە جوانی و ناسكی هەستی خۆی دەربڕیووە دەیەوێ وێنەی شیعرێك بكێشێ كە وەك سێبەری بژانگی چاو جوانان جوان بێ و هەست و نەستی مرۆڤ ببزوێنێ.

- ئەستێرە: لەگەڵ ئەوەی توخمێكی تا بڵێی شۆخ و شەنگ و پرشنگدار و جوان و ڕازاوەی ئاسمان و سروشتە. له هەمان كات دا جێگای بایەخ و تێڕامانی مرۆڤ بووە، تەنانەت ئەستێرەناسی وەك زانستێكی گرنگیش سەیر دەكرێ و، بە هۆكارێكی سەرەكی دادەنرێت لەسەر ئەو گۆڕانكاریانەی پەیوەندییان بە چارەنووسی مرۆڤەوە هەیە، هەر ئەمەش وای كردووە شاعیران پەنای بۆ ببەن تا ڕاز و سكاڵای خۆیان دەر ببڕن، هێمنی شاعیر ئاخافتن دەكات و دەڵێ:

**وەكـوو ئاواڵی چـــاك ئەستێرەكان گوێ ڕادەدێرن بـۆم**

**هەتا بۆیان بەیان كەم موو بە موو ڕازی دەروونی خۆم**

**{ تاریك و ڕوون ل١١٦}**

هێمنی شاعیر كاتێك بەتەنیایی و كز و دڵتەنگ و خەمناك دەمێنێتەوە شتێك نییە ببێتە ئارامی دڵ و دەروونی، تا له شیوەن و ناڵەی گریانی نیوەی شەو ڕزگاری بێت و كوڵوكۆی دامركێ. بۆیە هانا بۆ ئەستێرەكان دەبات و هەگبەی ڕاز و سۆز و سكاڵای خۆی لای ئەوان دەكاتەوە.

- چیا، ئەگەر لای هەندێ كەسان و كۆمەڵ و نەتەوە تەنیا وەك ڕەگەزێك یان دیاردەیەكی ڕووتی سروشتی بێ گیان سەیر بكرێت ئەوا لای كورد زیاتر له واتایەك و زۆرتر له نیشانه و هێمایەك دەگەیەنێ و وەك شتێكی پیرۆز سەیر دەكرێت و بووە بەرەمزی خەبات و تێكۆشان و شۆڕش و بەرگری لە دژی داگیر كردن و زوڵم و زۆرداری و چەوسانەوە. چونكه هەمیشه پاڵپشت و لانە و پەنای كورد بووە بەتایبەتی لە كاتی تەنگانە و ڕۆژانی سەخت و دژواردا. شاعیرانیش وەك تاكێكی كۆمەڵی كورد بەدەر نەبۆتن لە وانەی ڕوویان لە چیا كردووە و كردۆتیانە سەنگەری بە

دیهێنانی هیوا و ئاواتەکانیان یان بۆتە هەوێن و ئیلهامی ئەو شیعرە جوان و ناسك و بەرزانەی کە بۆ سروشت گوتراون. هێمنی شاعیر لە (بەهاری کوردستان) بەم شێوەیە باسی چیا دەکات و دەڵێ:

**دیسان لە چیا و لە ڕازان**
**دێ سیرەی سەقر و بازان**
**پێم خۆشـــترن لە سازان**
**لـــــە ئاهەنگ و ئاوازان**

**{ تاریك ڕوون ل١٠٥ }**

جگە لەمانەش زۆر جار شاعیر کاتێ پەست و بێزار و نائومێد دەبێ لە ژیان، ڕەشبینی دای دەپۆشێ و دەکەوێتە باڵەفڕکێ بەرەو چیا، بەڵام لەوێش ڕەشەبا و بەفر و زریان و سەرماو سۆڵی تووش، دەبنە ئاستەنگ لە پێش ئامانجەکانی بۆیە دەڵێ :

**شـــەڕەبایە لـــــە چیاکان و هـــــەوا تووشە دەنا**
**وەکو شێتان دەمەویست ڕوو لە چیای ئەستەم کەم**

**{ تاریك و ڕوون ل ١٦١ }**

- لادێ، جوانی و خۆشەویستی سروشت وای لە زۆربەی لە شاعیرە ڕۆمانسیزمەکان کردووە کە لادێ بەشوێنێکی پیرۆز بزانن و بەکانگای ئەوین و پاکی و وەفا و ڕاستی و دڵسۆزی لە قەڵەمی بدەن ((لێرەدا دەتوانین مەسەلەیەکی زەقی شیعری هێمنی وەك پەنا بردنەبەر لادێ و ژیانی سادە و ساکاری ئارایشی لادێ و گفتوگۆ لەگەڵ تەبیعەت و پێهەڵگۆتن بە کەژ و چیا و فەسڵ و گوڵ و گیای چیاکان باس بکەین کە شوێنی ڕۆمانتیسمی تێدا بەدی دەکرێ))[1] هێمنی شاعیر لە (ناڵەی جودایی)دا بە شێوازێکی ڕۆمانسیزمی باس لە ژیانی لادێ دەکات و دەڵێ:

**دێم بەرەو هۆبە و هەواری باسەفا**
**دێم بەرەو لادێ بەرەو کانگای وەفا**

**{ ناڵەی جودایی ل٣٢ }**

---

(١) خالید ئەحمەد شەریف، شیعری هێمن، گۆڤاری سروە، ساڵی سییەم، ژمارە (١٠)، بانەمەڕی، ١٩٨٧، ل١٤.

هێمن لەبەر ئەوەی کوڕی لادێ بووە و زۆر لە لادێ ژیاوە، بۆیە دەبینین بەشێوەیەکی وەستایانە شیعرەکانی لە ڕەنگ و بۆیەکی ڕۆمانسیزمیدا دا دەڕێژێ و ((بەزمانێکی دەوڵەمەند و و پاراو و بە قەڵەمێکی سیحراوی و هونەرێکی بەرز، دیمەنە جوانەکانی کوردستان و ژیان و خەباتی کۆمەڵی کوردەوارمان نیشان دەدا)) [٢]. هەروەك لە شیعری (بەهاری لادێ)دا بەشێوەیەکی جوان و دڵگیر و فۆتۆگرافی وێنەی ژیانی لادێمان بۆ دەکێشێ و دەڵێ:

**نییە داوێن و دەستی خەڵکی لادێ پیس و ئاڵوودە**

**لەدەستی ناچێ وەخت لێرە بە خۆڕایی، بەبێهوودە**

**{ تاریك و ڕوون ل ٦٠ }**

(**محەمەدی نووری**) یش وەك شاعیرێکی جوانناس و هەست ناسك و لێهاتوو لە وێنەکێشانی دیمەنە جوان و ڕازاوەکانی سروشتی کوردستان دەستێکی باڵای هەبووە. توانیویەتی بە شێوەیەکی زۆر هونەرمەندانە و بە هەست و سۆزێکی بەرز و ئەندێشەیەکی فراوان دیمەنە دڵڕفێنەکانی ژیانی لادێمان پێشان بدات. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو خۆشەویستیە زۆرەی کە شاعیرانی ڕۆمانسیزم بۆ لادێ و خەڵکی جوتیار و ڕەمەکی هەیانە. بۆیە دەبینین ژیانی لادێ و بار و گوزەرانی خەڵکی جوتیار و سادە و ساکاری و ئەو خوو و نەریتە جوانانەی کە لادێیەکان هەیانە لەگەڵ شۆخ و شەنگیی دیمەنە جوانەکانی سروشت بە ئاوێتەیی ڕەنگ دەداتەوە. **محەمەدی** نووری زۆر بە قووڵی چۆتە ناخی سروشتەوە و پەی بە واتا و چەمکەکانی سروشت بردووە. هەمیشە وەك هاودەم و هاوڕازێك لە گەڵیدا ژیاوە و دەستەملانێی بووە و هەرگیز نەی ویستووە لێی دوور بکەوێتەوە. شاعیر سروشت بە خەمڕەوێن و لابەری ئێش و ئازارەکانی خۆی دەزانێ. بۆیە لەم ڕووەوە ئازایانە ئەسپی خۆی تاوداوە ئەو شیعرانەی کە بۆ سروشتی نووسیون و لەم خولگەیەدا دەسووڕێنەوە، تابڵێی شیعری بەرزو جوانن و بەهرەیەکی گەورەی لە لای شاعیر دروست کردووە، بۆیە لە شیعری (خوا گیان) ڕوو دەکاتە پەروەردگار و هەستی خۆی بەرامبەر سروشتی بێ گیان و گیاندار ڕۆمانسیزمانە دەردەبڕێ و دەڵێ:

---

(١) کەریمی حیسامی، شاعیری ناوداری کورد هێمن، گۆڤاری پەیڤین، ساڵی یەکەم، ژمارە (٢)، مەڵبەندی ڕۆشنبیری کورد، لەندەن، ١٩٨٦، ل١٤١.

**هەرچەندی دیمەنە ڕوانیم لــــــە ژیندا**
**لــە هــەوراز و نشێوی ڕووی زەمیــندا**
**هەموو جوانن دەڵێم گیاندار و بێ گیان**
**شەپۆلێکن لــە نــاو دەریــای ئەویندا**
**{ دیوانی محمەد نووری، پستوی ژیان ل١٣ }**

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە **محەمەدی** نووریی شاعیر، تا ڕادەی توانەوە و گومان بۆیە تامەزرۆ و خۆزگەخواز و بەهیوای بینینی دیمەنە سەرسووڕهێنەر و سیحراویەکانی سروشت بووە، لە دەریای ئەوینی ئەودا سەرسام بووە و هەر هەموو ڕەگەزەکانی سروشتی بە هەردوو جۆری گیاندار و بێ گیانەوە بە جوان و دڵگیر دەزانێ و، دەکەوێتە باوەشی خۆشەویستی پاك و بێگەردی جوانی سروشتەوە. **محەمەد** نوریش وەك شاعیرێکی ڕۆمانسیزم، زۆر لە ڕەگەزەکانی سروشتی بێ گیانی وەرگرتووە و باسی لێکردووە، بەتایبەتی ئەو ڕەگەز و دیمەنانەی کە لەگەڵ باری دەروونیی خودی شاعیر خۆیدا دەگونجێ.

گوڵ و پەپوولە و چیا و دەشت و هۆبە و هەوار و لادێ، لەو ڕەگەزانەن کە شاعیر بەڕادەیەکی زۆر فراوان بەکاری هێناون. ئەوەی پێویستە لێرەدا هەڵوێستەی لەسەر بکرێت ئەوەیە کە شیعرەکانی ئاماژە بە هەڵوێستێکی شڵەژاو و هەست و سۆزێکی پەرێشان و هیوا و ئومێدێکی ناکام دەکەن و، فرمێسکی غەم و مەینەتیان لێ دەتکێ و بۆنی کابووسی مەرگیان لێوە دێت. **محەمەدی** نووری هەست جوان و دڵناسك لە باسی دیمەنی بەهاردا لە شیعری (من و گوڵە سوێسنێك) بەو پەڕی جوانی و هونەری ڕۆمانسیزمیەوە گرێی دڵ و دەروونی خۆی دەکاتەوە دەڵێ:

**بە سۆزە پێی گوتم، بۆ بەختی ســـەختم**
**بـــــــۆ هاوێر و ڕەفیق و پەڕ بڵاوی**
**بــەهاری جوانی بۆ من زەوقی چی بوو؟**
**بـــــــەغیری دوور لەگەڵ ڕۆڵەی بڕاوی.**

{ دیوانی **محەمەدی** نووری، بستووی ژیان ل١٢٦}

شاعیر کاتێ لەگەڵ گوڵە سوێسنێکی بەهار دەکەوێتە گفت و گۆ و گوێ بۆ ئەو گوڵە شەنگەی بەهار شل دەکات کە پەراوێز و هاوێر و سەرگەردان و دابڕاو بووە لە دۆست و

هاوڕێیەکانی، بەدەست گەردەلوول و ڕەشەبا و زریانی ڕەش و شوومی ڕۆژگارەوە سیس و ژاکاوە و دەناڵێنێ و ڕەنگی پایزی گرتووە.

- زستان، بۆ خەڵکی ستەمدیدە و هەژار و زەحمەتکێش وەرزی بەفر و باران و سەهۆڵبەندان و ساردی و سڕی و ڕەشەبا و زریان و قات و قڕی و فەوتان و ڕەشبوونەوە و گومنا بوونە. لەم وەرزەدا ژیان لە هەموو جوانی و خێر و بێر و خۆشی و ئاسودەیەکە ڕووت دەبێتەوە و گشت هیوا و ئاوات و ئامانجێك دادەماڵرێ، شەنگەستەکانی بزاڤی گەشەسەند ن و بەرەو پێشچوونیش دەوەستێت و، سست و بنبەست دەبێت. محەمەدی نووری لە چوارینەیەك دا دەربارەی ڕەش و شوومی و بێبەرهەمی و تەمومژی زستانی هۆنیوەتەوە، بەشێوەیەکی ڕۆمانسیزمی کاریگەر هەست و نەستی خۆی پێشان دەدات و دەڵێ:

**هێندە هیوا هات و ڕۆیی بێ سەمەر**
**چـاوەڕێی داهــاتی دوور و بەربلاو**
**وەك هەناسەی ساردی زستان بەسۆز**
**بـــۆ سەهۆڵی بێ بزەی لێوی هەتاو**
**{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل١١٩}**

لێرەدا شاعیر لە چوارچێوەی ئەندێشەیەکی فرەاوان و ناسك و ڕۆمانسیزمیدا ڕەشبینانە وێنەی ئەو زستانە دەکێشێ کە هیوا و ئاواتەکانی تێدا بێ بەرهەم دەڕۆن و گۆڕ غەریب دەبن، چاوی پڕ چاوەڕوانیش بە ناکامی قوفڵ دەدات. کاتێك دەزانێ تروسکاییەك تیشکی بزەی خۆرەتاوی پێ ڕاناگات، تاکو چرۆی هیوای شین بێ.

- شەو، لای شاعیرانی ڕۆمانسیزم، نرخ و بەها و واتایەکی تایبەتی خۆی هەیە، چونکە شەو لانەیەکی ئارام و بێ دەنگە بۆ شاعیران و لە هەمان کاتدا پۆشاکێکی نایابیشە بۆ شاردنەوەی ڕووت و ڕەجاڵی و هەژاری و داماوی. شەویش بە پێی بارودۆخ و ڕادەی پێویستی بۆ شاعیر بەهاکەی دەگۆڕێت. محەمەد نووری تاك و تەنیا وەك گوڵێکی بێ گەڵا و لق و پۆپ سیس و ژاکاو باوەش بە شەودا دەکات، بۆ ئەوەی لە ئامێزیدا خۆی لە دەستی ڕۆژگاری ڕەشی بێ وەفا بشارێتەوە. شاعیر لە شیعری ((لەسەر بستووی ژیان)) بەشێوەیەکی ڕۆمانسیزمانە ڕاز و سکاڵای خۆی دەردەبڕێ و لەگەڵ شەو دەکەوێتە گفتوگۆ و دەڵێت:

**شەوی تاریك وەرە بکشیَ بەسەرما**
**کـــە ئامێزت پەنای ڕۆژگار ڕەشانە**
**وەکـــو ژێنەی چـرای ئەستێرەکانت**
**کـــە ڕوو زەردیم لەبەر تالیع گەشانە**

{دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل١٦ }

دواتر شاعیر لە هەمان شیعردا، کە دەزانیَ لە شەودا ناگاتە هیواو ئاواتەکانی، بۆیە لێی یاخی دەبێت، داوا لە ڕۆژ دەکات کە پاڵپشت و ڕووناکیی ڕێگای ئامانجەکانی بێت لە جیهانی تەمومژ و تاریکیدا دەری بێنیَ و ئالاَی ئازادی بەرز کا و دەڵێ:

**برِۆ ئەی شەو وەرە ئەی ڕۆژی هیوا**
**لـــــــە چالاَوی بەلاَی دیلیم دەرێنە**
**لـــــــەسەر قسنی فەنای ئاواتەکانم**
**پـــــــەڕۆی ئالاَی هومێدم ڕاوەشێنە**

{دیوانی محەمەدی نووری، بستتوی ژیان ل١٦ }

- چیا و هەرد و شاخ لەو ڕەگەزانەیە کە شاعیرانی ڕۆمانسیزم بە تایبەتی شاعیرانی ڕۆمانسیزمی کورد، وەك پشت و پەنا و هاوڕێیەکی بەوەفای خۆیانی دەزانن، محەمەدی نووری شاعیریش کاتیَ لە ژێر سیبەری چیا و شاخە سەختەکانی کوردستان چاوی هەڵدێنیَ و گەورە دەبیَ و ژیان بەسەر دەبا، دەکەوێتە دەریای خۆشەویستیی ئەمانەوە، لە کانگای دڵ و دەروونییەوە کانیاوی شیعری جوان هەڵدەقووڵیَ و، لە شیعری ((کاوێژی دوورە پەرێزێك))دا دەڵیَ:

**لە مەڵبەندێکی تێی دا بووم و گوورام**
**لـــــەویَ پاراو بوو گیان و هۆش و بیرم**
**دڵـــــــــم هەر ئۆگری شـــاخی ولاَتە**
**هـــــــەوای هێلانەمە لەم هەردە گیرم**

{دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل٧٤ }

- گوڵ نیشانە و هێمای هەموو شتێکی جوان و پاك و نەرم و نیان و ڕاستی و خۆشەویستییە و، یەکێکە لە ڕەگەزە هەرە جوانەکانی سروشتی بێ گیان، هیچ شاعیرێکی ڕۆمانسیزم نییە لە شیعرەکانیدا باسی جوانی و پاکی و ناسکی و خۆشەویستی گوڵی نەکردبێ و بەکاری نەهێنابێ ئینجا چ لە وێنەیەکی ڕشبینی یان گەشبینیدا بێت.

محەمەدی نووریی شاعیر، یەکێکە لەو شاعیرە هەست ناسك و جوانپەرستانەی کە بە ڕێژەیەکی زۆر بۆ مەبەستی جیا جیا لە هەردوو باری ڕەشبینی و گەشبینندا باسی گوڵی کردووە، لە کۆمەڵە وێنەیەکی لێك چوونی یەك بەدوای یەك و سادەدا لەگەڵ گوڵ دواوە و خۆی تێدا دۆزیوەتەوە و لە شیعری ((لە کوێ یادم کە))دا

**گوڵی من کوڵی دڵ بوو فرمێسکی چاو**
**لە دیدەم دەڕەخسێنن نە گوڵزار و ئـاو**
**ئـــــــــــەوانەم لەوان پاك و داوێنترن**
**لـــــــە سروەی بەیان خاس و خاوێنترن**
{دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل١٧ }

لێرەدا شاعیر بە شێوەیەکی هونەرمەندانە و لە چوارچێوەی هەستێکی ناسك و کاریگەردا باسی ئەو گوڵەمان بۆ دەکا کە بە کڵوکۆی ئاوی دڵ و فرمێسکی چاوەکانی ڕەخساندوویەتی کە لە خاس و خاوێنی و پاکیدا هاوتای نییە. دواتر شاعیر بەشێوەیەکی گەشبینی باسی جوانیی گوڵ دەکات لە شیعری (دڕوو هەر دڕووە)دا دەڵێ:

**گـــــوڵ جوانە لە هەر وڵاتێ شین بێ**
**سەر شاخ و ڕەوەز بێ یان زەوین بێ**
{دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل١٢٠ }

لەم وێنەیەدا شاعیر ئەوە دەردەخات کە جوانی و پاکی و ڕاستی لە نێو دڕك و داڵی ژیاندا وون نابێت، هەر بەگەشی و زیندوویی دەمێنێتەوە، جا لەهەر جێگا و شوێنێك بێت. لەگەڵ

ئەوەی شاعیر دەرك و هەست بە پیرۆزی و بەرزیی بەهای جوانیی گوڵ دەكات و نرخ و بایەخی دەزانێ، بەڵام خۆی بە داماو و هەژار و بێ دەسەڵات و بێ دەستمایە دەزانێ، ناتوانێ بچێتە بازاڕی چەمەن و ببێتە كڕیار و داواكاریی گوڵان. لە شیعری ((من و گوڵە سوێسنێك))دا وێنەیەكی ڕەشبینی و ڕۆمانسیزمیانەمان پیشان دەدات و دەڵێ:

**لە بازاڕی چەمەن كڕیاری گوڵ بووم**

**بـــــەبێ مایە گوتم چۆن بچمە ناوی**

{دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل١٢٦ }

- پەپوولە: ئەو گیاندارە جوان و وردیلە و ئێسك سووك و باڵ نەخشینەیە كە بۆتە ڕەمزی جوانی و پاكی و بێگەردی و خۆشەویستی . بۆیە شاعیرانی ڕۆمانسیزم هەردەم لەم سیفەتانەدا خۆیان بە پەپوولە دەچوێنن. بەتایبەتی لەو وێنانەدا كە پەروانە باڵەكانی بەگڕی شەم هەڵدەدپڕوكێ لەپێناوی ئیشق و ئەویندا.

محەمەدی نووریی شاعیر، لە شیعری (ئەمن و پەپوولە))دا جوانترین و ناسكترین دیمەنی سروشتی گیاندارمان بۆ دەكێشێ و قووڵی و ڕاستی و كاریگەریی هەست و دەروونی شاعیری تێدا دەردەكەوێ، ئەم شیعرە لە تەڕ و پاراویی زمان و جوانی و ناسكی و فراوانیی ئەندێشە و وێنەی هونەری و مۆسیقا و ئاوازی شیعریدا لێهاتوویی و گەورەیی ئەزموونی شیعری خۆی دەنوێنێ و وەك شاكارێك داهێنان و ئەفراندنی تێدا بەرجەستە بووە. لەم ڕووەوە شاعیر دەڵێ:

**پـــــــەپوولە چووكەی پەڕ و باڵ تەلا**

**هەســتی نەسرەوتووی گوڵ و گیا و گەلا**

**هێدی بــــــــەسپایی وەكــــو پەڕی قوو**

**دەكـــــــــــــەویە هەوا بە هالاوی هوو**

**دیێ و تێدەكشێی وەك بزەی منـــــــاڵ**

**لـــــــــەسەر تریفـــــەی كانیلەی خەیاڵ**

{دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل٥٢ }

- لادێ و ژیانی سادە و ساكاری یەكێكە لە خەسڵەتە زەق و دیارەكانی ڕۆمانسیزم، كە شاعیرانی سەر بەو ڕێبازە هەمیشە خۆشیان وویستووە و پەنایان بۆ بردووە، چونكە پێیان وابووە لادێ كانگای وەفا و جوانی و پاكی و ڕاستییە. بۆیە دەبینین ژیانی لادێ لە شیعری شاعیرانی ڕۆمانسیزمیدا ڕەنگی داوەتەوە و بۆتە تەوەری بابەتەكانیان. محەمەد نووریی

شاعیریش بەدەر نییە لەم کاریگەریانە و ڕەنگدانەوانەی دیمەنە جوانەکانی لادێ کاری تێ کردووە هەبووە. ئەم ڕاستییە لە شیعری (یادێك لە زادگا)دا بە ڕوونی و ئاشکرایی دیارە کە دەڵێ:

**زەردەی ڕۆژهەلأت، کـــاتێ خۆر هـــەڵدێ**

**لە لووتکەی ((سەراج)) دە پڕژێتە ناو دێ**

**کـــــــێوی (کوڕە گیسك) هـــەروا چەقیوە**

**بـــــــۆ ڕۆژئاوای دێ پەنا و پەســـــیوە**

{دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل١١١}

شاعیر کاتێ کوڕی لادێ و دەشت و شاخ بووە، دەبێ گەلێ بیرەوەری و یادگاری و دیمەنی جوان و شیرین سەرنجی ڕاکێشابێ و هەست و سۆزی لە ناخەوە ورووژاندبێ. ئینجا لە کازیوە و تاریك و لێڵی بەیانییەوە بگرە، تا ئێوارە و دووا تەمەنی شەو، وە یان لە گابەردی زلەوە بگرە تا شاخ و کێوە بەرزەکان و چاوبڕکێی کچ و کوڕی دێ لە کووچە و کۆڵانەکان بوونەتە کەرستەی ئەو وێنانەی دەربارەی ژیانی لادێ لە شیعرەکانیدا ڕەنگیان داوەتەوە و دەڵێ:

**کـــــاتێ ئێواران ڕۆژپەڕی هەتاو**

**بەســـەر چاواندا هەر داوێن هەنگاو**

**ژوان و چاوبڕکێ و بزەی سەر لێوان**

**هەروەك خۆی بووە لای نوێژی شێوان**

**ســــەیزادە کەوێ و خاتوو پەریخان**

**لـــە کوچـەی دێدا کۆڕن ئێواران**

{دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل١١٢}

## ٢- جوانیی ئافرەت لای: هێمن و محەمەدی نووری:

جوانیی ئافرەت لە دیدی زۆربەی شاعیران و نووسەرانەوە، نرخ و بەهاو تایبەتمەندیی خۆی هەیە و پایە و پێگەیەکی دیار و فراوانی داگیر کردووە، کە زۆر جار دەکەوێتە سەرووی

سروشتی بێگیانەوە، وەیان لە ئاستی ئەودا دەوەستێت. هەروەك گۆرانی شاعیر لەم بارەیەوە دەڵێ:

**بەڵام تەبیعەت هەرگیزا و هەرگیز**
**بـــــێ ڕووناکیە بێ بزەی ئازیز**[1]

جوانیی ئافرەت هۆکارێکی بەهێزە بۆ ئەوەی هەستی مرۆڤ بە شێوەی هەڵچوونێکی ئاسوودەیی بورووژێنێت. ئافرەت ڕووبەرێکی گەورە و بەرزی لە شیعری شاعیران داگیر کردووە، بەتایبەتی شاعیرانی ڕۆمانسیزم. ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جیهانە بێسنوورەی ئافرەتان لە جوانی و خۆشەویستی و سۆز و بەزەیی و میهرەبانی. ئەفلاتوون دەڵێ: ((ئەگەر گوڵێکی جوان یان ئینسانێکی جوانت خۆش ویست، ئەوا لە حەقیقەتدا فکرەی خۆشویستنی جوانییەکەت لە سەردایە، کە ئینسانەکە یان گوڵەکە تەمسیلی کردووە)) [2] ئەمەش واتای ئەوەیە کە لە پێش هەموو شتێکدا سیفەتی جوانی زاڵە بەسەر سیەفەتەکانی تردا، هەرچەندە ئەمەش بۆچوونێکی ڕەها نییە لە ڕووی ڕاستیەوە بەڵکو ڕێژەییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تا ڕادەیەکی زۆر خۆی سەپاندووە زۆر لە (شاعیرانی ڕۆمانسیزم وای دادەنێن کە ژن فرشتەیە و لە ئاسمانەوە هاتۆتە خوارێ و دڵمان پاك دەکاتەوە و سۆز و خۆشەویستیمان لا زیاد دەکات و هەستمان هۆشیار دەکاتەوە و، هانمان دەدات بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی ڕەوشتی و ڕامیاری و نیشتمانی)[3]. شاعیرە ڕۆمانسیزمیەکان بە پێچەوانەی شاعیرە کلاسیکیەکان، بە تێڕوانینێکی تازە و بابەتیانە و سەردەمیانە مامەڵەیان لەگەڵ ئافرەت کردووە، توانیویانە لە وەسف و ستایشکردنیدا جگە لە لایەنی ڕووکەش و ڕوخساری دەرەوە، ڕووی ناوەوە و ئێش و ئازار و غەم و ئەندێشە و گیروگرفتە دەروونی و کۆمەڵایەتیەکانیان بخەنە ڕوو و بە ناخیاندا شۆڕ بنەوە. ئەگەرچی زیاتر ئافرەت هەوێن و ئیلهامی شیعری خۆشەویستی و دڵداریی شاعیران بووە، لەوەی کە تەوەر بێ بۆ ورووژاندنی بابەتی تر.

---

(١) گۆران، دیوانی گۆران، کۆکردنەوەی: محەمەدی مەلا کەریم، بەرگی یەکەم، ١٩٨٠، ل١٠.

(٢) ئاسۆ عومەر مستەفا، هەمان سەرچاوە، ل٢٥.

(٣) محمد عنیمی هلال، نفس المصدر، ص١٩٠ – ١٩١.

دکتۆر عێزەدین مستەفا ڕەسول دەڵێ: ((شیعری دڵداری گەورەترین شوێن و قەوارە و هەمەڕەنگترین لایەنی ئیبداعی لە شیعری جیهانیی هەموو سەردەمێك و هەموو وڵاتێك و قوتابخانەیەکدا گرتۆتەوە)) [1].

هەریەك لە هێمن و محەمەدی نووری وەك دوو شاعیری لێهاتوو بە توانا و خاوەن ئەندێشەی داهێنەرانن، بەبیری ورد و هەستی ناسك و پڕ چێژ و خۆشەوە شیعرەکانیان داڕشتووە. هێمن یەکێکە لەو شاعیرە بەدەسەڵات و بێ هاوتایانەی بەکامێرای هەست و نەستی چاوەکانی زۆربەی شیعرەکانی بە تابلۆی جوان و ئاڵاو واڵای ئافرەتان ڕازاندۆتەوە. تەنانەت لە باسی خۆشەویست و وەسف و ستایشی عەشق و ئەوینی جوانی ئافرەت دا وەستایەکی بێ هاوتا بووە. بۆیە زۆر لەو شیعرانەی کە بۆ ئافرەتی نووسیوە لە لووتکەدان لە ڕووی بەرزی و وردی و قووڵیی بیر و فراوانیی خەیاڵ و ئەندێشە کاریگەری و بەتینیی هەست و سۆز و نەرمونیانی و ناسکی و تەڕ و پاراویی زمانەکەی. بەمەش شێوازێکی تایبەتی بە خۆیەوە گرتووە، کە خاوەنی خەسڵەت و سیمای تایبەتی خۆیەتی و شێوازێکی هێمنانەیە و دەچێتە خانەی جوداکاری و داهێنانەوە.

هێمن ((تاکی لە جوانپەرستیدا کەمە، وشە لە دەستیدا وەك مێو وایە، دڵ تەڕە، خۆش خەیاڵە و ناسك بینە، بەهونەرە و شارەزا و وشە ڕەنگینە)) [2].

هێمن شاعیرێکی دڵ تەڕ و جوان پەرست و ئاشق بووە، جوانیی ئافرەت زۆر کاری لێکردووە بۆیە (لە کوێوە بۆ کوێ)دا دەڵێ: ((جوانییش زۆر تەئسیری لەمن کردووە، جوانی دیارە بە هەموو مەعنای کەلیمەوە، بەڵام جوانترین شتیش لە نەزەر مندا ژن بووە، یانی ئینسان بووە کە دیارە جنسی موخالیفە)) [3]. هەر ئەم کاریگەریەی ئافرەتیش بوو، کە زۆر بە توندی شاعیری هەژاندووە و خستۆتیە جۆش و خرۆش، بوڕکانی شیعری تەقاندۆتەوە، هەروەك خۆی دەڵێت: ((جوانی یەکێك بووە لەو شتانەی کە منی هان داوە بۆ شیعرگوتن....جوانیی تەبیعەت بەڵام پتر لە جوانیی تەبیعەت، جوانیی ئینسان... ئینسانی

---

(١) د. عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، ئەدەبیاتی نوێی کوردی، چاپخانەی خوێندنی باڵا، هەولێر، ١٩٩٠، ل٦٢.

(٢) کەریمی حیسامی، یادی هێمن، لە بڵاوکراوەکانی سەردەمی نوێدا، سوئێد، ١٩٨٧، ل٤.

(٣) هێمن، چەپکێ گوڵ و چەپکێ نێرگز، چاپی دووەم، چاپەمەنی و ئینشاراتی ڕەهرەو، مهاباد، ١٩٩٩، ل١٢٩.

جینسی موخالیف)) [1]. هێمن ئەگەرچی شاعیرێکی پاك و بێگەرد و بێ فڕوفێڵ بووە و دەستی دەستیی بە ئافرەت نەکردووە. هەر ڕۆژێ دەستی بە ئافرەتێك گەرم نەکردۆتەوەن، بەڵام حەز و خولیا و تامەزرۆیی بۆ ئافرەت بەدەر نەبووە لە حەز و ئارەزووی سێکسی لە پاڵ حەز و ئارەزووەکانی تر. لەم ڕووە وە شاعیر خۆی دان بەم ڕاستیەدا دەنێت و دەڵێت: ((من زۆر بڕوام بە ئیشقی ئەفلاتوونی نییە)) [2]. پاشان شاعیر زیاتر جەخت لەسەر ئەو ڕاستیە دەکاتەوە و دەڵێ: ((من پێم وایە دڵداری لەگەڵ سێکسدا پەروەردە دەبێ دەڕواتە لای سەروو)). هەرچۆنێك بێت هێمن لە دەریای جوانی و ئەوینی ئافرەتدا تواوەتەوە و هەرگیز توانای لێ جیا بوونەوە و دابڕانی نەبووە. وەك هەندێ لە شاعیرە ناودارەکان دەڵێن: ((باشترین شیعری جوان، ئافرەت و خۆشەویستییە))[3]. کە ئەمەش بێ یەك و دوو بەسەر شیعرەکانی هێمن پراکتیزە دەبێ، چونکە لە هیچ کات و شوێن و بارودۆخێکدا ئافرەت و جوانیی خۆشەویستیەکەی و (ئیشق و ئازادی) لە شیعرەکانی هێمن نەخراوەتەوە پەراوێز و کەنارگیر نەبووە، بەڵکو هەموو بابەتەکانی تری شیعری لای ئەو بە ئافرەتەوە گرێ دراوە، ئەمەش لە شیعرەکانی هێمندا دیاردەیەکی زەقە. بە پێچەوانەوە ئەم دیاردەیە لە لای شاعیرانی تر کەمتر بەرچاو دەکەوێ، بۆیە ئەوەی لەم بوارەدا شاعیر کردوویەتی دەچێتە جۆرێك لە گۆڕانکاری و داهێنان.

چونکە بەراستی کەم شاعیر هەیە بتوانێ بەم شێوەیە بە زمانێکی تەڕ و پاراو و دەوڵەمەند بە هەست و نەست و ئەندێشەیەکی سیحراوی لە چوارچێوەیەکی هونەریی بەرزدا

بڵێسەی کوورەی خەبات و ئاگر و ئاسنی مەتەرێزی بەرگری ببەستێتەوە بە نەرم و نیانی و لارو لەنجەی شۆخ و جوانیی ئافرەتەوە. مەگەر هەر هێمن بتوانێ، کە ئەمەی کردووە.

دکتۆر عەبدولڕەحمان قاسملو لەو پێشەکییەی کە بۆ شاعیری نووسیوە دەڵێ: ((ژن لە شیعری هێمن دا ڕۆڵێکی زۆر گرنگی هەیە، جوانیی ژن ئیلهامدەری شاعیرە، سەرانسەری دیوانی هێمن ئەو ڕاستیە دەردەخا کە وێڕای تەبیعەت و ژیان و خەباتی گەل، ژنە کە هێمن بۆ شیعرگووتن هان دەدا، شیعرەکانی هێمن لە سەر ژن نموونەی بەرزی شیعری کوردین)) [4].

---

(١) هەمان سەرچاوە، ل١٣٠.

(٢) هەمان سەرچاوە، ل١٣٤..

(٣) کەریم مستەفا شارەزا، جوانی لە شیعردا، ل٣٣.

(٤) هێمن، تاریك و ڕوون، ل(ل).

هێمن لە شیعرەکانی خولیای ئەوە دەکات پیرۆزی بە ئافرەت ببەخشێت و بەرزی بکاتەوە، تا ئەو ڕادەیەی وەك فریشتەیەکی خوا بە بەرگی سپیەوە پاك و بێگەرد و جوان دەبینرێت.

شاعیر تەنیا وەك خواردنێکی بەتام و جەستەیەکی گەرم سەیری ئافرەت ناکات بۆ گەرم کردنەوەی خۆی و تێرکردنی حەزی سێکسی. بەڵکو ئافرەت لای ئەو تیشکی خۆر و تریفەی مانگەشەو و شنەی بایە و، شەپۆلی دەریا و گوڵاڵەی بەهار و نمەی باران و چریکەی نەرم و هێمنە. سیمفۆنیای ئەوین و سۆمای چاو و ترپەی دڵ و هێزی ئەژنۆ و بژێوی ژیانە.

دیارە قووڵبوونەوەی شاعیر بۆ جوانیی ئافرەت بەم ڕادەیە زۆر و فراوان و بێ سنوورە، وزە و هێزێکی بێکۆتایی و لەبننەهاتووی بە شاعیر بەخشیوە. لە ڕووی دەسەڵاتی هونەری و ئەزموونی شیعریەوە. هەروەك لە شیعرەکانیدا ئەم ڕاستیە دەردەکەوێ، بەڵام پەی بردنی شاعیر و تێگەیشتن و چوونە ناخەوەی جوانی، چەندین پرسیاری لە هزریدا ورووژاندووە و بۆشاییەکی گەورەش لە دڵ و دەروونی شاعیر دروست کردووە. بۆیە زۆر جار ڕەشبین دەبێت لە بەردەم هێنانەدیی ئاواتەکان. چونکە دڵنیایە لەوەی پاپۆڕی خولیاکانی لە دەریای جوانیی ئافرەتدا ناگاتە کەناری مەرام. لە شیعری (چارەنووسی شاعیر)دا هەست و نەستی ڕۆمانسیزمی شاعیر لێهاتوویی لە ڕێکخستنی وشەی ناسك و جوان، لە ئەندێشەیەکی فراوان و بێسنوردا و لە کێشانی وێنەی شیعریدا گەیشتۆتە لووتکە و دەڵێ:

**بـە ڕیشی بۆزەوە سوجدە دەبـــــــم من بۆ جەماڵی تۆ**
**ئــەدی بۆچی دەیانگووت دار کــــە پیر بوو تازە دانایە؟**
**بـــــزەت نایێتە سەر لێوو بەزەت نایە بە حـــــاڵم دا**
**ئەگەرچـی زۆر لەمێژ ساڵە لـە دووت دەخشێم وەکو سایە** { تاریك و ڕوون ل١٣٣}

لێرەدا شاعیر مۆمی تەمەنی بەرەو نیوە ڕۆیشتووە. چرای ژیانی بەرەو کزی و نەمان دەچێت و سەر و ڕیشی ماش و برنج بووە و کەچی گوڵی ئەشق و ئەوین لە ناخیدا تازە نەش و نما دەکات و کۆتری دڵی هەر لە تافی لاوی دایە و دەگمێنێ. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە خۆشەویستی سنووری نییە. هەموو بەربەستەکان دەشکێنێ و گوێ بەهیچ پاوانخوازییەك نادات، گشت پرانسیپێك تێك و پێك دەدات و، عەقڵ و مەنتق ڕەت دەکاتەوە و، ڕەچاوی کات و جێگا و بارودۆخەکان ناکات. لێرەدا شاعیر ئەوپەڕی بێهێزی و بێدەسەڵاتی و داماوی و زەلیلی و چەوساوەیی و بێبەشی و شێواوی و بێچارەیی، خۆی پیشان دەدات. ئەگەرچی وەك

سێبەر و سایە، هەمیشە بەدوای بالاّی یارەوەیە و بۆ ساتێکیش لێی دوور ناکەوێتەوە، بەلاّم هەوڵەکانی بێسوود و بێبەرهەمە بەرامبەر ئەو شۆخە دڵ ڕەق و بێ بەزەییەی کە هیچ کاتێك بزەیەکی نایەتە سەر لێوی و گوێ لە چرپەیەکی ڕاناگرێ و ئاوڕێکی لێ ناداتەوە.

پاشان شاعیر لە تێڕوانین و خوێندنەوەی بۆ جوانیی ئافرەت، خاوەنی بیروڕا تایبەتمەندی و دەنگی سەربەخۆی خۆیەتی، ئەو جوانیی ئافرەت و نرخ و بەهای ئەو جوانییە لە چوارچێوەی ئەو داب و نەریتە ڕەسەنەی کوردەواریدا دەبینێ، کە ئافرەتان هاوشانی پیاوان شەرەف مەندانە و بە ئازادی لە هەموو کاروبارێکی ڕۆژانە و مەیدانی خەبات و تێکۆشاندا بەشدار بێت و یاخی نەبێت بەرەو کوێرەڕێی هەڵە و وێڵبوون و تاریکی و نەزانی. بەڵکو دەبێت پێشڕەو بێت بۆ ئەوەی بە پیرۆزی بمێنێتەوە و، ببێتە پەرستگای جوانی. هەروەك لە شیعری (کیژی لادێ)دا دەڵێ:

**مـــــــایەی هومێدی کیژی چاو هەڵۆ**<br>**نــــــــازانی مەکر و جامبازی و درۆ**<br>**چارشـــــێوت نییە ڕووناگری لـــەکەس**<br>**نــــــــامووسی خۆتە پاسەوان و بەس**

{ تاریك و ڕوون ل٦٤}

هەروەها لە شیعری (جوانی بەس نییە)دا شاعیر زیاتر تیشك دەخاتە سەر هەڵوێستی خۆی. پێوانەی جوانی لە ڕوانگەی خودەوە، بە شێوازێکی سادە و ساکار و هەست و سۆزێکی ڕۆمانسیزمی دەربڕیووە و دەڵێ:

**کـــــــچ ئاواتەی پیرۆزمن**<br>**خۆشـــــیی دڵی پڕ سۆزمن**<br>**کـــــچ نووری دیدە و چاومن**<br>**بـــەندی جـــەرگ و هەناومن**

{ ناڵەی جودایی ل٥٨ }.

هێمنی جوانپەرست و دڵتەڕ، دێوانەی کێو و بەندن و دیمەنی جوانی دەشتی و ڕەنگیندا، گرفتاری کوڵمی ئاڵ و چاویکاڵ و سینەی بەفرین و سپیی کچە کوردێکی جوان و نازدارە، کە لە لایەن خۆیەوە پاوان کرابێ و سەربەست و چالاك و وریا و زانا و چاوکراوە بێ و، لە ژێر

ڕووپۆشی کۆنەپەرستی و فێڵ و درۆ و نەزانیدا خۆی نەشاردبێتەوە و، شاعیر لە شیعری (فرمێسکی رنوو)دا بەشێوەیەکی ڕۆمانسیزمانە وێنەی لایەنێکی کۆمەڵایەتیی جوانیی ئافرەتی کورد دەخاتە ڕوو و دەڵێ:

**خۆشـــــەویستی من کچە کوردێکە پاك و نازەنین**

**بـــــاخەوانە پیرەم و بـــــاخی بە پەرژینم دەوێ**

**نامەوێ ڕوو بـــــگرێ تا دەمرێ بە فێڵبازی و درۆ**

**یـاری نازداری لەبــــــاری دیاری شەرمینم دەوێ**

**من تـــەشی ڕێسێکی وەك شیرینی (وەفایی)م بۆچییە؟**

**کـیژی وریای چـــــــاوکراوەی فێرە زانینم دەوێ**

{ دیوانی هێمن موکریانی ل٣٤٦ } .

بەهای جوانیی ئافرەت لە شیعرەکانی محەمەد نووریشدا زۆرن و، بەڵام لە تارمایی و سەراب دەچن و بە زۆر ڕووی خۆیان دەنوێنن و لە دوڕییانی سروشتی گیاندار و بێ گیاندا هەڵبەز و دابەز دەکات و جوانییەکان زەق و ئاشکرا نین، بەڵکو بەشێوەی هێزێکی موگناتیسی شاراوەی گەورە خۆیان حەشار داوە و، جارجارە سەرەتاتکێ دەکەن و، تیشك و پڕشنگی ڕووناکی دەهاوێژن، ئەمەش جۆرێکە لەو تایبەتمەندیانەی بەهای جوانی لە شیعرەکانی محەمەد نووریدا. دیارە هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئاست و پایەکانی سروشتی خود و کەسایەتیی شاعیر لەگەڵ ئەو فشارە کۆمەڵایەتی و ئایینی و کەلتوریەی کە شاعیری کۆتوبەند کردووە و پاشماوەیەکی تفت و تاڵی لەسەر دڵ و دەروونی شاعیر بەجێ هێشتووە، کە لەوانەیە دەربازبوونی کارێکی ئەستەم و دژوار بێ. هەرچۆنێك بێت، وێرای ئەم بارودۆخە ئاڵۆزەی کە شاعیری گیرۆدە کردووە، بەڵام هەرگیز ئەم ڕێیە سەختەی بەرنەداوە، بەڵکو هەنگاوی بەرەو ئاسۆ ناوە. بۆیە دەبینین جوانی لای شاعیر وەك دوڕ و گەوهەر و مەرجانی ناخی دەریاوان، تا لێیان نزیك بێتەوە و زیاتر بەرەو قووڵایی بڕۆی گەشتر و جوانتر دەبن. شاعیر لە شیعری (دڵی نەماو)دا جوانترین دیمەنی ڕۆمانسیزمی ئافرەتمان پیشان دەدات و، دەمانخاتە گێژاوی وروژاندن و بیرکردنەوە و سەرسووڕمانەوە و دەڵێ:

**تـــکەی کوڵی دڵی من فرمێسکی ڕوونی شادی**

**کـــــۆشت وەبەر دەگێڕم کە گیرنابی لە چاودا**

**گەنجی گێژاوی جوانیت بە گیان و دڵ کڕیــارم**
**ئــەگەرچی باسی سەرمە، دڵ و دیدەم بە ئاودا**
**ســەرنجم دا پارێزی دڵی زامـــــــــاری شەوڕۆ**
**هەتــا تیری برژانگت بەشوێن خوێنی تــکاو دا**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل٢٩ }

محەمەدی نووریی شاعیر کاتێ لەبەرامبەر جوانیی یارەکەیدا دڵی، دەبێتە قەترەیەك ئاو و پاشان دەبێتە هەڵم و بەهەوادا دەچێت و نامێنێت، یان کاتێك تکەی خوێناوی دڵی و فرمێسکی شادی لە چاودا قەتیس نابن و دێنە خوارەوە. لە وێنەیەکی هونەریی بەرزدا بەو کۆرپەیەی دەچوێنێ کە لە جێگای خۆی ئۆقرە ناگرێت. بۆیە باخی ئامێزی بۆ والاّ دەکات تا لەوێدا ئارام بگرێ و کڵوکۆی دامرکێتەوە. لێرەدا شاعیر بەتەواوی نغرۆی گێژاوی ئەو جوانییە بووە کە گەنجینەیەکی لە بننەهاتووە. بۆیە ئامادەیە بە گیان و دڵ بچێتە پێشەوە بۆ دەستکەوتنی جا ئەگەر سەریشی تێدا بچێ یان بە ئاویدا بدات.

پاشان شاعیر سەرنج دەداتە ئەم برین و زامە سەختانەی کە خوێنیان لێ دەچۆڕێ، وەك دیوانە مەست و بێ ئاگا و بێ قەرار سەلاّو و تەحیات دەخوێنێ و دەپاڕێتەوە. بەلاّم هەوڵی بێ هوودەیە و وا هەست دەکات گولاڵەی بەهاری ژینی بۆتە پێخوستی یارەکەی و، بێ ڕەحمانە لە ژێر پێیدا پێ پەست و سیس و ژاکاوە و هێز و تینی لێ بڕاوە و باڵندەی دڵی نائومێدی وا خەریکە بەرەو دوورگەی نەمان دەفڕێ.

محەمەدی نووریی شاعیر وەك تەنیا جوانییەکی ڕووت و کەرستەیەك، یان تەنیا بۆ پڕکردنەوەی حەز و ئارەزوو و مەرامی سێکسی ئافرەت نابینێ، بەڵکو ئەو لە ڕوانگەی ئەرك و ڕۆڵ و مافە مرۆڤایەتیەکانەوە تەماشای ئافرەت دەکات و پێی وایە کە ئافرەت بەر لە هەموو شتێك دەبێ ئازاد بێ و خاوەنی مافە سەرەتاییەکانی خۆی بێ لە ژێر چەپۆکی زوڵم و زۆرداری و نەزانی و تاریکیدا دەرباز بکرێت. ڕێزی لێ بگیرێت و بە چاوێکی بەرز و پیرۆزەوە تێی بڕوانرێت. نکە شاعیر ئافرەت بە بناغەی ژیانی ئادەمیزاد دەزانێ. پێی وایە کە ئەرکی ئەو لە دوای ئەرکی خودایە. بەتایبەتی دایکان کە سەرچاوەی گشت جوانی و خۆشەویستی و میهرەبانییەکانە، ئەمەش لە شیعری (سلاّو لە دایك)دا لایەنێکی گرنگ و بە ڕوویەکی

گەشەوە جوانیی ئافرەتمان بە شێوازێکی ناسك و پڕ هەست و سۆز و ئەندێشە وێنەی ڕۆمانسیانە پێشان دەدات و دەڵێ:

**ئـەگەر یەزدانی مەزن، وێنێکی وەك خـــۆی بـایە**
**کــــڕنۆشم بۆ دەکرد و دەمگوت: ئەتۆی ئەی دایە**
**سەرقافڵەی خێڵی خێزان، گەر تۆ نەبای ئەی دایك**
**کـاروانی کـــوڕی خیلقەت دەکشایەوە بۆ دوایــــە**
**نــە فریشتەی، نە وەك پەری، تۆ ژیان وەدیهێنەری**
**بــەشەر بێشکەی لە کوێ بوو کە تۆ ڕات نەژاندایە**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل٣٧ }

لێرەدا شاعیر ئافرەتی هێندە لا گەورە و پیرۆز و جوانە، بۆیە تا ڕادەی ئەوپەڕی بەرزی دەکاتەوە و دەیگەیەنێتە ترۆپکی بەخشندەیی و میهرەبانی، بەشێوەیەك لە بیر و خەیاڵ و ئەندێشەی خۆیدا دەیان وێنەی مەزنی هونەری دەربارەی ئەو مرۆڤە بێ هاوتایە دەخاتە ڕوو کە پێی دەڵێن ئافرەت، نیوەی کۆمەڵ و دایکی نیوەکەی تریشیانە. لە هەمان کاتدا چرای ماڵ و کۆڵەکەی خێزان و چاوگەی ژیان و بێشکەی مرۆڤایەتی و دایەن و پەروەردەکاریەتی. شاعیر هەست بە کێشە و گیروگرفتە کۆمەلاّیەتی و دەروونییەکانی ئافرەتان دەکات. دەبینی کە چۆن بێباکانە و بێپەروا لە شەوانی سارد و سر و تار و ئەرژەنگی ماتەمدا و بەچاوی ماندووی بێخەوی کۆرپەی هیوا لە باوەشی گەرمی خۆیدا بەلای لایە بە گۆرانی دەیخەوێنێ. بەلاّم بەمەش ناوەستێ. دڵی ئۆخەی ناکا بۆیە بە برژانگەکانی تۆزی بەرپێی دەماڵێ و سەریشی دەکاتە بەردەبازی ڕێگای هێنانەدیی ئامانجە پڕشنگدارەکانی و دڵنیایە بەهەشت لە ژێر پێی دایکان دایە کە.

## ب- بەهای ئازادی لای شاعیران هێمن و محەمەدی نووری:

ئازادی پێویستیەکی بوونی مرۆڤە، بوونیش هەردەم پێویستی بە لەدایکبوون و گۆڕانکاری و گەشەسەندن و نوێبوونەوەیە. یەکێکە لە گرنگترین هۆکارەکانی بەردەوامیی ژیان و ململانێی مرۆڤ لە پێناوی مانەوەدا. لەهەمان کاتدا پاڵنەر و هاندەر و پێویستیەکی پڕ بایەخی ئادەمیزادە بۆ بەدیهێنانی هیوا و ئامانج و ئاواتە پیرۆزەکانی. بەشێوەیەك لە خەو و

خۆراك بەنرختره. ژیانی بێ ئازادی وەك ژوورێكی بێ چرا و ئاسمانێكی بێ ڕۆژ و مانگ و ئەستێره و باخچەیەكی بێ دار و دەوەن گوڵ و گوڵزار و گیا و گۆرانیی مەل و باڵندە و كێڵگەیەكی بێ ئاو و شۆڕشگێڕێكی بێ چەك وایه و هیچ بەهایەكی نییه. ڕۆمانسیزم و لیبرالیەت دوو ڕێبازی ئاوێتەیه و ئامانجیان ڕزگاربوون و ئازادیی مرۆڤە یەكەمیان لە بواری ئەدەب و هونەردا، دووەمیان لە بواری ڕامیاری و بەڕێوەبردنی كارگێڕیی وڵاتدا. (ڕۆسۆ) نووسەری بەناوبانگی فەرەنسی دەڵێ: ((مرۆڤ بەئازادی لەدایك دەبێت بۆیه پێویستە بەئازادی بژیت)) [1]. بۆیە ئازادی ئەو دەنگە زوڵاڵ و نەپساوەیه كە هەمیشه وای لە مرۆڤ كردووە، سەر و گیان و ماڵی خۆی لە پێناو بەخت بكات.

١- ئازادیی نیشتمان: ئازادیی نیشتمان كە لە سەرووی هەموو ئازادیەكانەوەیە، چونكە نیشتمان دایك و سەرچاوەیه، هەموو هێوا و ئاواتەكان لەوێدا مەیسەر دەبێت و دێتە كایەوە. (ئەدۆنیس) دەربارەی نیشتمان دەڵێ: ((نیشتمان لە لای من ئەوەیه كە تەواو نابێت، وەك خۆشەویستی، وەك شیعر، بەشێوەیەكی ئەبەدی خۆی تازە دەكاتەوە)) [1]. ئازادیی نیشتمان ترپەی دڵ و هێزی گیان و ڕووناكایی سۆمای چاو و خوێنی جەستە و هەناسەیە و، مرۆڤ ناتوانێ بەبێ ئەو هەڵكا. بۆیە بێ بروسكەی ئازادیی كۆمەڵگا لە قەیران و كێشمە كێشم و ئاریشە و جەنگەڵستانی یاخیبوون دەژی. بۆ ساتێكیش ئۆقرە ناگرێ و چاو لێك نانێ. ئازادیش بۆ شاعیرانی كورد، دەیان واتا و شرۆڤە و خوێندنەوەی هەیە، چونكە شاعیرانی كورد بە پێچەوانەی هەموو شاعیرانی جیهان لە ژێر باری هەردوو چەوساندنەوەی نەتەوەیی و چینایەتیدا دەناڵێنی و، خەون دەبینێ و گۆرانیی ئازادی دەڵێ بۆ غەمە نەمرەكانی نیشتمان، بۆ خۆشەویستی و بیر و بۆچوونە كپكراوەكان، بۆ هیوا و ئاواتە بەندكراوەكان، بۆ ڕاز و نیازە خنكێنراوەكان و هەست و نەستی ناخی وشە لە سێدارەدراوەكان. ئازادیی نیشتمان لە هەریەكە لە شیعری شاعیران هێمن و محەمەدی نووریدا سیمایەكی دیار و زەق و بەرچاوە و ڕووبەڕێكی هەراوی داگیر كردووە، چونكە ((نوسەر و شاعیرانی كورد هەوڵیان دەدا ئەو ڕووداوانە بدۆزنەوە كەنموونەی وێنەی خەباتی كورد بوون لە پێناوی ئازادی و سەربەستی

(١) د. حلمي مرزوق، نفس المصدر، ص١٥.

(٢) ئەدۆنیس، شیعر ئەو ڕەگەزەیە كە دژوارەكان یەك دەخات، وەرگێڕانی لە فەرەنسیەوە: ئارام سعید، گ ئاینده، ژ ٦، ساڵی ٢٠٠٠، ل١٢٠.

کوردستان یان ئازایی و قارەمانییەتی خەڵکی کورد، ئەو ڕووداوانە زۆرن لە مێژووی کۆن و تازەی سەردەمی کوردیدا)) [1]. هێمن وەك شاعیرێکی نیشتمانپەروەر و ئازادیخواز، هەر لە سەرەتاوە کە چاوی بە دیمەنە جوان و دڵڕفێنەکانی کوردستان پشکوتووە و گوێچکەی بە ئاوازی سیمفۆنیای قاسپەی کەو و چریکەی باز و باعەی مەڕ و ورشەی درەخت و هاژەی قەڵبەزەی ئاوی ڕووبار زرینگاوەتەوە و شەیدا و ئاشقی نیشتمان بووە و گۆرانیی بۆ وتووە، دڵی بۆ کردۆتە هێلانە. دیمەنەکانی نیشتمان بە بەهار و پایزیەوە، بەخۆشی و ناخۆشیەوە بە شادی و بەختەوەری و ئێش و ئازارەکانییەوە کاری تێدەکات و وەك هەناسە و خڕۆکە سوورەکانی خوێن، لەگەڵ گیان و دڵ و جەستەی تێکەڵ دەبێ و دەتوێتەوە، کە هەرگیز بۆ تەنیا ساتێ ناتوانێ لێی دابڕێ و لە یادی بچێتەوە، و لە هزر و دڵ و دەروونی دەربچێ. شاعیر لە شیعری ((تۆم هەر لە بیرە))دا بەم شێوەیە هەگبەی دڵی خۆی بۆ نیشتمان دەکاتەوە و دەڵێ:

**لە شاییدا لـــە وەختـی هـەڵپەڕینا**
**لە خۆشیدا لـــە کاتـــی پێکەنینا**
**لە کۆڕی مـــاتەم و گریـــان و شینا**
**ئەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر لە بیرە**

{ تاریك و ڕوون ل٦٢ }

لێرەدا شاعیر ئەوپەڕی دڵسۆزی و خۆشەویستیی خۆی بەرامبەر نیشتمان دەردەبڕێ لە چوارچیوەیەکی ڕۆمانسیزمیانە و ئەندێشەیەکی بێ سنووردا بەرامبەر نیشتمانەکەی دەردەبڕێت، چونکە شاعیر هێندە ئاشق و تامەزرۆی نێشتمانە پێی وانییە بتوانێ چرکەیەك بێ ئەو بژی. ئینجا ئەگەر لە شادی و هەڵپەڕکێ و سەما و گۆرانی و خۆشی و ڕابواردن و کەیف و پێکەنین بێت، یان لە کۆڕی پرسە و شین و شەپۆڕ و قوڕبەسەری و بێ کەسی و پەرێشانی و ماتەم و گریان بێ. نیشتمانی هەر لە بیرە و قەت لە یادی ناچێتەوە، دواتر بۆیە وای بەباش و پەسند دەزانێ کە گیان و سەری لە ڕێی ئەودا ببەخشێ و لە نێو سەنگەری بەرگریدا ڕووبەڕووی دوژمنە سەرسەخت و نامرۆڤەکان ببێتەوە. لە جیهانی خۆشەویستیی ئاو و خاکی نیشتمانەکەی بکەوێتە ئەندێشە و خەون و وردبوونەوە و مەردانە و کوردانە بژی. دیسان دەڵێ:

---

(١) د. مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی شەشەم، چاپییەکەم، بلاّوکراوەی ئاراس، ٢٠٠٥ ل٣٣.

**دەكـــــەم تـــەرخان لە ڕێی تۆدا ژیانم**
**لە سەنگەردا بــــەرەو ڕووی دوژمنانم**
**بــــەخاكی تــــۆ دەمی ئاویلكە دانم**
**ئـــــەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر لە بیرە**

{ تاریك و ڕوون ل٦٢ }

لەگەڵ ئەوەی هێمنی شاعیر بە هۆی خۆشەویستی و ئیشق و ئازادیی نیشتمان دووچاری سەدان گێر و گرفت و ناخۆشی و ئاوارەیی و دوورە وڵاتی و نامۆیی و دەردە سەری بووە، بەڵام هێشتا بەو پەڕی خۆشحاڵی و شانازیەوە سەر و گیانی خۆی دەكاتە كۆچی قوربانی نیشتمان و خۆی دەكاتە باڵا گەردانی. چونكە ((نیشتمان بۆ هێمن سەرچاوەی ژیانە، بەهەشتە، خاو و خێزانە، هەموو شتێكە))[1]. بۆیە وەك ڕۆڵەیەكی ئازا و بەجەرگ و بەوەفا دەچێتە كۆڕی خەبات و تێكۆشانی نیشتمانەكەی، لەگەڵ هاوسەنگەرەكانی بە شێوەیەكی كرداری و واقیعی و راستەقینە، ڕێگای بزووتنەوەی ئازادیخوازی گەلەكەی دەگرێتە بەر. بەمەبەستی پارێزگاری كردن و پاراستنی سنووری نیشتمانەكەی. بەڕادەیەك سینگی خۆی وەك قەڵای (ماژینو) دەكاتە قەڵغان بەرامبەر دوژمنی داگیر كەر و خوێنڕێژ و نائینسانی، چونكە شاعیر پێی وایە لە كاتێكدا نیشتمان و وڵاتەكەی لە ژێر پۆستاڵی داگیركەراندا نارەوا و بێبەزەییانە ناتوانێ دڵشاد و بەختەوەر بێ. بۆیە پرسیار لە خۆی دەكات و دەڵێ: دەبێ ڕۆژێ بتوانم بە ئازادی و سەربەستی بژیم و كۆت و بەندی دیلی بشكێنم و ئازادانە سەیری جوانییە بێهاوتاكانی نیشتمانی خۆم بكەم و بە شادیەوە هەناسەی دڵنیایی هەڵمژم. وەك لە (قەڵای نیشتمان)دا گرێی ئەو هەست و خواستەی خۆی ڕۆمانسیزمیانە دەكاتەوە و دەڵێ:

**وەتەن گیان و ســەر و ماڵم فیدای تۆ**
**وەگیانی مــن كەوێ دەرد و بەڵای تۆ**
**لــــــە پێناوت دەنێم سەر تـا بزانی**
**منم ڕۆڵێكی ئـــــازا و باوەفـــای تۆ**

---

(١) جیهانگیری غەفاری، بەرەو باخی بەهەشت، چاپییەكەم، چاپخانەی گەنج، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل١٢٦.

**لـــــه بۆ پـــاراستن و حیفزی سنوورت**

**لــه بـــاتی (ماژینۆ) سینگم قەڵای تۆ**

{ تاریك و ڕوون ل٥٥ }

هێمن هێندە زەبر و زەنگ و ئاگر و ئاسنی ناپاڵمی دوژمن دیوە، ئەوەندە بە گرمەی تۆپ و شەستیر کۆتری دڵی ڕاچەنیوە و وەها لەنێو شۆڕشی خوێناویدا نغرۆ بووە، خەون و خەیاڵ و واقیعی لێ تێکەڵ دەبێ و زۆر جار دەچێتە ژێر چەتری ڕەشبینی و ئەو نیشتمانە جوانەی کە هاوتا و هاوکوفی نییە لە دڵگیریدا. وەك ژنێکی پیر و ڕەش پۆش و ڕەنگ زەرد و داما و دێتە پێش چاوەکانی و دەیخاتە گێژاوی سەر سووڕمان و ورووژاندنەوە و بەدەیان پرسیاری لا دروست دەکات و لە غەم و حەسرەتی دیمەنەکانی پەشۆکاوی و جلی ڕەش و سەر و شانی و ملی بەقوڕ و بەهەشتی دایکی نیشتمان. کە بە هۆی ڕۆڵەکانییەوە وای لێهاتووە ئەم هەموو ئازارەی چەشتووە، بەڵام شاعیر هێشتا نائومێد نییە بەهیوا و ئومێدەوە دەژی. بۆیە دەبینین لە شیعری (دایکی نیشتمان)دا ئەم وێنە ڕۆمانسیزمیانە بەرجەستە دەبن کە دەڵێ:

**لـــــــەبەرچی وا دژ و داماوی دایە؟**

**چ قەومـــــــاوە کەوا شێواوی دایە؟**

**چیە؟ چـــۆنە لە بەرتۆدا جلی ڕەش؟**

**ســـەر و شان و ملت بۆ ناوەتە هەش؟**

**گوتی نـــــــازانی ڕۆڵەی هیچ نەزانم**

**ئـــەمن کێم؟ ڕۆڵە دایکی نیشتمانم**

**لـــــــە تـــاوی ئێوەیە وا مات و گرژم**

**لـــــــە سوێی ئێوە دەسووتێم و دەبرژم**

{ تاریك و ڕوون ل٨٤ }

بەڵام ئەم ڕەشبینییە بەردەوام نابێت، شەفەقی ڕۆژ لە ئاسمانی شاعیر دا دەردەکەوێت و دڕ بە تارێکی دەدات، تروسکەی ئاسۆ هەموو جیهان دەگرێتەوە، کۆتایی بە زوڵم و زۆرداری دێت و زنجیری کەلەپچە دەپچڕێ و کۆت و بەندی دیواری زیندانەکان دەشکێنرێ و دەڕووخێنرێ، نیشتمان لە ژێر ڕکێفی زۆرداری و ڕەش پۆشی ڕزگار دەکرێ. بۆیە دەڵێ:

**لـــــــەبـــەرخۆت داڕنە دایە جلی ڕەش**

**دڵـــــت ڕوون بێتەوە کولمت ببێ گەش**

**هەنیسکان بەس بدە چیدی مەکە شین**
**ببینە بـــــەیرەقی سوور و سپی و شین**

{ تاریك و ڕوون ل٨٥ }

هێمنی شاعیر چ وەك مرۆڤ یان کورد یان شاعیر، ئازار و ئەشکەنجەی دەروونی و جەستەیی زۆر چێشتووە و کەوتۆتە ژێر باری قورسایی ڕۆژگاری سپڵە و بێوەفا و بێبەزەییەوە و هەرگیز خێر و خۆشی لێ نەدیوە. ئەم چەرخ و سەردەمەی کە لاڵ و کوێرە و نرخ و بەها بۆ هیچ مافێکی مرۆڤایەتی دانانێ و تەنیا هێز و دەسەڵات و ماددە و بەرژەوەندی بە پێوەر دەزانێ. لەم ڕوانگەیەوە شتەکان دەبینێ. بەڵام شاعیر وەك مرۆڤ و کوردێکی دڵسۆز هەرگیز کۆڵ نادات. وەك دێوانە ئاشقی چیا و شاخ و کێو و تەلان و بەندەن و بەرد و خاك و نیشتمانەکەی خۆی دەبێت و لەم پێناوەدا نەك هەرگوێی لە برسیەتی و بێ بەرگی نییە، بەڵکو باکی بە گرتن و لێدان و کوشتن و زنجیر و تەناف و سێدارەش نییە و شاعیر لە شیعری (کوردم ئەمن)دا ئەشقی خۆی بۆ نیشتمان بەم شێوەیە دەردەبڕێ و دەڵێ:

**گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دەردم ئەمن**
**قەت لە دەست ئەم چەرخە سپڵە نابەزم مەردم ئەمن**
**ئـــاشقی چـاوی کەژاڵ و گەردەنی پڕ چــــــاڵ نیم**
**ئـــاشقی کێو و تــــــەلان و بەندەن و بــــــەردم ئەمن** { تاریك و ڕوون ل٤٩}

هێمن لەگەڵ ئەوەی شاعیرێکی جوان پەرست و هەست ناسك بوو. لە هەمان کاتدا شۆڕشگێڕێکی نیشتمانپەروەر و تێکۆشەرێکی دڵسۆز و دەم و دەست و داوێنپاك ڕۆڵەی گەل و وڵاتەکەی بوو. بۆیە شاعیر ((جوانی و ئیشق و ئەوینی ئینسانی لە ئیشق و ئەوینی نیشتمان و نەتەوەکەی جیا ناکاتەوە)) [1]. ئەمەش لە شیعرەکانیدا بە ڕوونی بە دیار دەکەوێ. هێمنی

(١) مستەفا مەعروف، یادێك لە مامۆستا هێمن، ڕۆژنامەی کوردستان، ژ ١٥٨، ٢١ مای ١٩٩٨، ل٣.

شاعیر جگە لە خۆشەویستی نیشتمانەکەی، بە چاوێکی بەرز و پیرۆزەوەش سەیری گەلەکەی کردووە. چونکە دەزانێ گەل و نیشتمان تەواوکەری یەکترن.

((هێمن بە ئەزموونێکی دوور و درێژەوە شارەزای دەروونی گەلەکەیەتی، لەگەڵ ئازارەکانیدا لەگەڵ چرۆی هیوایدا دەژی)) [1]. بەم شێوەیە شاعیر تا سەر ئێسقان کاریگەر بووە بە خۆشەویستیی گەل و نەتەوەکەی و لەو هۆنراوە جوانانەی کە بۆ گەل و نەتەوەکەی هۆنیوەتەوە، وەکو بورکان دڵ و دەروونمان دەخاتە جۆش و خرۆشەوە، لە ناخی خۆیەوە ئێش و ئازاری میلەتەکەی پێشان داوە و باسی کردووە. ((ناڵە ناڵی هێمن مەسەلەی تاکە کەس نییە دەردی بێ دەرمانی دەروونی بێڕوونی تاکە مرۆڤ نییە)) [2]. هەروەها هێمن وێڕای نیشتمان و نەتەوەپەرستی تا ڕادەیەکی بێ سنووریش مافناس و ئازادیخواز بووە تا سەر ئێسقان بڕوای بە مافەکانی مرۆڤ بووە، لەم پێناوەدا دەردەسەری تووش بووە و باجی زۆری داوە. بۆیە ((هێمن نە تەنیا گەل و نیشتمانەکەی خۆی دەپەرستێ و بەپێی توانا هەوڵی ڕزگاربوونیشی بۆ دەدا، بەڵکو فکری هەموو ئینسانێکی ئازادیشی لەبەرە و لە بیریان ناباتەوە)) [3]. وەك دەڵێ:

**شـــــــیوەنی من شیوەنی ئینسانییە**
**بـــــــانگی ئازادی و گرووی کسانییە**
**شـــــیوەنی من شینی کوردی بێ بەشە**
**ئــەو گەلەی حاشا دەکەن لێی و هەشە**        { ناڵەی جودایی ل ٢٧ }

غەمە نەمرەکانی ئازادیی گەل لای هێمن تاکو بڵێی پیرۆزە، هاوڕێی شەو و ڕۆژ و گشت ساتەکانی تەمەن و ژیانیەتی. هەوێنی دەیان چیرۆکی شعری ئامێزی پڕ ناخۆشی و تراژیدیان، کۆڵ و بارێکی گەورەیە بە ملییەوە، لە هەڵدێر و هەوراز و لێژ و نشێو و لە هیچ شوێن و لە هیچ کاتێ داناگیرێ و برینێکە بەردەوام خوێنی لێ دەتکێ و ئازارێکە هەمیشە دەکولێتەوە، بەڵام هێشتا شاعیر چاوی ئومێدی داناخا و چاوەڕوانی بەهار دەکات و لە شیعری (بەهار هەردێ)دا دەڵێ:

---

(١) محەمەد فەریق حەسن، هێمن و یۆنی غەریبی، بەشییەکەم، هەمان سەرچاوە، ل١٢.

(٢) سەلاح شێخ شەرەف، هێمن و ئاوارەیی، گۆڤاری کۆسار، ژمارە (١١)، ساڵی ٢٠٠١، ل١٢.

(٣) هێرش، هێمن و من، چاپییەکەم، چاپخانەی شیرکەتی کتێبی هەرزان، سوێد، ١٩٩٢، ل١٢٣.

**هەتـــــا کەنگێ ســـیاچاڵی بەســـــامی دوژمنی زاڵم**
**پڕاو پڕ بێ لە ڕۆڵەی گەل جەی بێ وا لە دەستبەستان؟**
**هەتـــــاکەی ئەشـکی خوێنینی کچە کوردی برا کوژراو**
**لـەجێی بادە و لە بەزمی دوژمـنان بدرێتە دەس مەستان**

دیوانی هێمن موکریانی ل٣٣٧.

لێرەدا شاعیر دەنگ هەڵدەبڕێ و ڕوو دەکاتە گەلەکەی و ڕۆڵەکانی لە خەوی قووڵ بێدار دەکاتەوە و دەیانوروژێنێ و پێیان دەڵێ هەتاکو کەی کەند و لەند و دۆڵەکان پڕ بێ لە تەرم و دیل و دەستبەستراوەکانی ئەم گەلە و، دوژمنی ڕووڕەش و زۆردار وەك واشە و دالاشی برسی دەم بنێتە جەستەیەوە و ورگی بدڕێ. هەتا کەی کچانی کورد ئاڵوودەی دەرد و مەینەت بن و بەشیان شین و گریان و ڕۆ ڕۆ بێت و چاوەکانیان بە گوڕ فرمێسکی لێ بباریێت و وەکو بادە دوژمنان مەست و سەرخۆش و شاد بکات. بەلاّم ئەم دیمەنە تراژیدی و کاریگەرانە لە هزر و دیدو بۆچوونیدا زۆر نامێنێتەوە، کار لە بیر و باوەڕی ئازادیخوازانەی ناکات و جارێکی تر تین و گڕو بلێسەی خەبات و تێکۆشان و گولاڵەی بەهاری ئازادی گەش و جوان دەبێتەوە و، کۆتایی بە هەوری ڕەش و زریان و سەهۆڵبەندانی سەخت و دژواری زستان دێنێ، هەر لەو شیعرەدا شاعیر تابلۆیەکی پڕ لە گەشبینی و ڕۆمانسیزمی پێشان دەدات و دەڵێ:

**ســـــــەهۆڵبەندانی بێدادی ئــــەگەرچی تووش و دژوارە**
**بەلاّم لێم سوورە وەك ڕۆژی بەهار هەردێ لە دووی زستان**
**بـــــە خەڵکی عـــــالـەمی سەلماندووە تاریخی ئـــازادی**
**دەبـــێ زاڵم لـــــەبــەر تێکۆشەران بـــــەرداتەوە دەستان**

{ دیوانی هێمن موکریانی ل٣٣٧ }

هێمن لەبەر ئێش و ئازار و غەم و دەردەسەری و ناخۆشیەکانی ژیانی نالەباری ئەم ڕۆژگارە چەوت و شوومە، وەکو باڵندە و بولبول و قومری بەسۆز و داخەوە دەناڵێنێ و شیوەن دەکات و فرمێسکی نائومێدی هەڵدەڕێژی بەدیار پەڕوپۆی هەڵوەریوی خۆی و بەدیار ئەو ڕوخسارە زەردو ژاکاوەی کە بە ناکامی لە تافی لاویەتیدا بە ناڕەوا سیس بووە، یان وەك ئەو مەلەی کە فێری دارستان و گوڵ و چیمەن و کەناری جۆگە و جوێبار بێ، لە ئاسۆی پان و بەرینی ژیاندا هەڵفڕێ، باڵی ببزوێ و شنەی شەماڵی کوێستانان هەڵمژێ. ناتوانێت و هەرگیز بەرگەی ژیانی ناو قەفەز

و دیلیەتی ناگرێ، خۆ ئەگەر دارەکانیشی هەرهەمووی زێڕ و گەوهەر بن، لە شیعری بابردەڵەدا چیرۆکی هاودەردیی خۆیی و بولبولمان بەشێوەیەکی ڕۆمانسیزمی بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

**لەبەر ئازاری ژینـــــــی نــالەباری**

**دەنـاڵی بلبلــی شـــەیدا بـــەزاری**

**بەسۆز و داخـــــەوە دەیگوت فەقیرم**

**پـــــــەڕو پۆم هەڵوەری بێوادە پیرم**

**مــەلێکـــی فێـری دارستان و لێڕێ**

**قەفەز پیری دەکا با شووی لــە زێڕێ**

{ تاریك و ڕوون ل١١٢ }

هێمنی شاعیر ئازادیی پێ لە گشت شتێك بەنرختر و خۆشەویستترە. چونکە تامی دیلیی چەشتووە و دەزانێ چەند تاڵە و چ دۆزەخێکە، بۆیە داد و بێداد دەکات لە دەست ژینی بەندیەتی و سەرشۆڕی. وەك گڕکانێکی پەنگخواردو و پڕ دەبێت لە بڵێسەی ڕق و کینە و بێزاری. کاتێك دەبینێت بەو هەموو جوانی و بێتاوانی و دەنگخۆشیەوە دیل و زیندان بکرێت و دوژمنی قەلی ڕوو ڕەشیش سەربەست و ئازاد بێ. دیسان دەڵێ:

**چ تـــــــاڵە کۆیلەتی و دیلی، چ تاڵە**

**بـــــەکەم بێ ژینی وا پڕ ئـــاه و ناڵە**

**مـــن و کونجی قەفەز ئەی داد و بێداد**

**ئەمن دیلم، قەلیش سەربەست و ئازاد**

{ تاریك و ڕوون ل١١٢ }

پاشان شاعیر وەك ئەو بولبولەی کە هێلانەی خاپوور کراوە و پلاری ڕاوکەری دژو نەیاران بێچوەکانی لێ ئەساندووە، دەناڵێنێ بۆ ئاوارەیی و دووری لە باوەشی ماڵ و منداڵ و خاوخێزانی. فرمێسك لە چاوەکانی دەتکێ و گریان لە ناخی هەڵدەقوولێ و دەڵێ:

**منیش ئـــــەی بلبلی بـــەندی وەکو تۆم**

**وەهـــا دوورم لــــــە هێلانە و گوڵی خۆم**

**منیش وەك تۆ لە کیسم چوو گوڵی ســوور**

**منـــــــیش هێلانەکـەم لێ کراوە خاپوور**

{ تاریك و ڕوون ل١١٢ }

بەلاّم شاعیر وێڕای ئەم هەموو مەینەتی و ناخۆشیەی کە ڕووبەڕووی بۆتەوە کەچی هێشتا نەفرەت لە قەل و هاودەمانی دەکات و گۆرانی بۆ گەل و نەتەوەکەی دەڵێ و، دەنگی هەق و ڕەوای ئازادی بەرز دەکاتەوە و بەڵێن دەدات، هەتاکو دوا پشوو و دوا دڵۆپی خوێن و تا ئەو ساتەی لە خوێنی خۆی دەگەوزێ، سەنگەری خەبات و تێکۆشان چۆڵ نەکات و هەر بۆ گەلی خۆی بخوێنێ و دەڵێ:

**بـــــەشەو ژان و پـــــــەژارەم دێنە پاڵێ**
**بـــــە ڕۆژ ئۆقرەم نییە ســـاتێك لە ماڵێ**
**بـــــەلاّم هاودەردی ئـــــــازیزم هەتا هەم**
**وەکـــــو تۆ دەردی دڵ ناکەم لەدەس خەم**
**ئـــــەمن پێم خۆش نییە ئاودەنگی قەل بم**
**ئـــەمن پێم خۆش نییە بێزراوی گـــــەل بم**
**هەتـــا دوژمن نـــــــەگەوزێنێ دەخوێنم**
**دەخوێنم بـــــــۆ گوڵی خۆم، هەر دەخوێنم**

{ تاریك و ڕوون ل١١٤ }

نیشتمان لای محەمەدی نووریی شاعیر تەنیا پارچە زەوییەك، یان ڕووبەرێکی جوگرافی نییە، کە لە کۆنەوە باوك و باپیرمانی لەسەر ژیاوە و لانەی مرۆڤایەتی بووە، بەڵکو زیاتر لە خوێندنەوەیەکی بۆ دەکرێ. شاعیر زۆربەی بابەتەکانی وەرگرتووە، کەوتۆتە بەرزکردنەوەی هەست و سۆزی نەتەوایەتی. بەهۆی زۆرداری و خوێنرێژیی داگیرکەران لە لایەك و ئەو بارودۆخە ناهەموار و دژوارەی کە خۆی و گەلەکەی تێدا ژیاوە، ئەوەش وای کردووە نیشتمان بۆ محەمەدی نووریی شاعیر ببێتە ژێدەری ژیان و هاندەر و پاڵنەری بەردەوامی و گەشەپێدانی درەختی بیر و باوەڕ و خۆزگەکانی لە ڕابردوو و ئێستا و داهاتوودا. بۆیە دەبینین خۆشەویستی نیشتمان لە دڵ و دەروون و خوێن و دەمارەکانی جەستەیدا تواوەتەوە. هەمیشە هەستی نیشتمان پەروەری لەگەڵ ئاوارەیی و سۆز و سکالاّ و ئێش و ئازارە دەروونی و کۆمەلاّیەتیەکان تێکەلاّ و دەبن و وەك سیمایەکی زەق لە شیعرەکانیدا خۆیان دەنوێنن. محەمەدی نووریی شاعیر هەردەم ئاشقی شیعری پڕ سۆز و خرۆشی ئازادی و خۆشەویستیی نیشتمان بووە و، بولبول ئاسا ئەم چڵ و ئەو چڵی کردووە. پاسەوانی گوڵی نیشتمان و زۆرلێکراوی کورد و کوردستانی جوان بووە. ئاوازی بە جۆشی بۆ ژیانی دیلی و ئاوارەیی و دەربەدەری و هەژاریی میلەتەکەی

چڕیوه. به ئامانجی بەدیهاتنی ئازادیی زۆری چێشتووه و چقڵی زۆری دوژمنانی به پێ دا چەقیوه. کەچی هێشتا بێ باك بووه و له خزمەتکردنی گەل و میللەتەکەی کۆڵی نەداوه. هەروەها یەکێکه لەو کەسانەی که خاوەنی ئەزموونێکی دوور و درێژه، لەم بارەیەوه و لەو سەردەمەدا ژیاوه، که زۆربەی گۆرانکاری و ڕووداو و کارەساته گەورەکانی به چاوی خۆی دیوه و قالبووی نێو ئێش و ئازار و غەم و ئەندێشەکانی گەلەکەی خۆی بووه و، بۆ ساتێکیش لێیان دانەبڕاوه. پلەوپایه و دەسەلاتیش لای ئەو چەکێك بووه بۆ خزمەتکردنی گەل و نیشتمانەکەی ئەوەش دەگەڕێتەوه بۆ ئەو هەسته پاك و بێگەرد و جوان و دڵسۆزییەی شاعیر بۆ گەل و نیشتمان و خاکەکەی وەك له شیعرەکانیدا به گەلێك شێوه و لایەنی جیاوازەوه ڕەنگی داوەتەوه، وەك ستایشی جوانی و دڵگیریی نیشتمان و کەڵك و بەهای خاکەکەی و خۆشەویستیی گەلەکەی و گەلێك لایەنی تر.

شایەنی باسه خاك له شیعری محەمەدی نووریدا بەرزترین ئاست و پلەی هەیه و هیچ خۆشەویستیەکی تر نایگاتێ وەك له (سۆزی دەروون) شاعیر بەم شێوەیه هەست و نەستی ڕۆمانسیزمی خۆی بەرامبەر ئەو خاکەی که وەك دایکێکی به وەفا و میهرەبان له باوەشی چاوی هەڵهێناوه و تێیدا دەژی دەردەبڕێ و دەڵێ:

**له ڕۆژی ئـــەوەڵێ دیتم کـــــه ژینی مـــــــن وەتەن ! پاکی**
**دەبــێ قوربـــــانی خاکت بــێ بژی ئـــــــەو دیــده دووربینه**
**که من مەجنوونی سەحرا بووم، ئەتۆش ئەی لەیلەکەی عەقڵم**
**بـــــەسـه قیبلەت مەگۆڕه دڵ مـــەکه ئەو دین و ئـــەو دینه**
**ڕوحـــــم دەرچوو لـــه بێڕەحمی، بکه ڕەحمێ بـــــەمن ئەی دڵ**
**بـــــەسه جەور و جەفا تـــاکەی چیه ئەم ئـــا هو ئەسرینه**
**بـــــەهاران کاتێ جۆبـــاران، وەتـــەن حاشـــا له گوڵزاران**
**کـــه تۆ ڕووبارەکەی مـــن بی، شنەت گوڵزاره نــــــــەسرینه**
**بـــەشەرتێکی وەفـــــاکەی تۆ لـــــه کوێستانت وەتەن تامێك**
**بــــەدەستی خۆت که ژەهریش بــێ، له زارم تــامی هەنگوینه**
**کـــــه من مردم له دووری تـــۆ نەبینم ڕووی وەســــــڵی تۆ**
**چیــــه ئـــەم کێشەیی عومره، نـــەبێ ئــــــــەم ژینه ژەهرینه**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل٢٢ }

لێرەدا و لە کاتی ووردبوونەوە و شۆڕبوونەوە بەناخی شیعرەکانی محەمەدی نووریدا، سیما و خەسڵەتێکی تایبەت نزیك لە شیعرەکانی هێمن بەدی دەکەین. لە ڕووی تێکەڵکردنی نەرم و نیانی و سۆزی عیشق و ئەوین ناسك و تین و تاو و گەرم و گوڕ و توندی و ڕەقی و خەباتی ڕامیاری و بەرگری لە خاك و گەل و نیشتمانەکەیەتی. تا بڵێی لێهاتووانە و زیرەکانە و بەشێوەیەکی هونەریی بەرز وەسف و ستایشی خۆشەویستەکانی دەکات، لە بۆتەیەکدا دەیانتوێنێتەوە. شاعیر هەر لە نووکەوە و لە ڕۆژانی سەرەتای تەمەنییەوە، سەر و ماڵ و دڵ و گیانی دەکاتە قوربانی خاکەکەی و، دووربینانە و ژیربێژانە دەڕوانێتە ڕابردوو و ئێستا و ئایندەی گەل و نیشتمانەکەی. بۆیە دێوانەئاسا وەك مەجنوون وێڵ و ئاوارەی دەشت و بیابان دەبێت. خوازیاری ئەوەیە هزر و هۆشیاریی خۆی لە دەست نەدات و قیبلەگای ئیشق و ئەوین و ئازادیی لێ نەگۆڕێ و لەسەر ئایینی خۆی بمێنێتەوە. پاشان شاعیر بەهۆی دڵڕەقی و هەڵوێستی بێبەزەییانەی زەمانە سکاڵای خۆی لە دڵ دەکات و داوای لێ دەکات کە دەست لە جەور و جەفا و ستەم و چەوسانەوە و ئەشکەنجە و زۆرداری هەڵگرێت و، کۆتایی بە ئاه و ناڵە و شیوەن و گریان و حەسرەت بهێنێ. بەهاران کاتێك سەرچاوە و کانیاوەکان دەتەقنەوە، ڕووبار و جۆباران هەڵدەستن، مێرگ و بەراو دەژێتەوە. تەنانەت ئەو کاتانەش کە گەردوون بە گوڵزاران دەڕازێتەوە، بەلاّم هێشتا ناگاتە شنە و نەسیمی هەواری خشەویستەکەی. چونکە تام و بۆی ئەوینەکەی هێندە خۆش دەوێ، ئەگەر ژەهریش بێ لای ئەو تامی هەنگوین دەدا بەم شێوەیە تەمەن بەلای شاعیرەوە هیچ نرخ و بەهایەکی نییە ئەگەر کورت بێت یان درێژ، کاتێك دوور لە خۆشەویستەکەی ئازیزان و ئاو و هەوای سازگار و دیمەنە دڵڕفێنەکانی نیشتمانی بژێت.

محەمەد نووریی شاعیر هێندە شەیدای نیشتمانەکەی خۆیەتی، هەمیشە گیان لەسەر دەست بووە. بۆیە دار و بەردی نیشتمانەکەی بە هەموو زێڕ و گەوهەری دنیا ناگۆڕێتەوە و لای ئەو بەنرخترین و گرنگترین سەرمایەیە و نرخ و بەهای بە هیچ شتێك دیاری ناکرێت تەنانەت بە خوێنیش. بۆیە شاعیر لە شیعری ((دەکا پیرۆزیی سەربەستی)) هەست و مەبەست و ڕازی خۆی لە دووتوێی شیعرێکی ڕۆمانسیزمیدا دەردەبڕێ و دەڵێ:

**وەتەن گەر خوێنی خۆم نەڕژاند وەکو سێلاو لەبەر پێتا**
**بــە گێژاوی دڵم شین کــە، هەموو شێو و بەیارێکی**
**وەتــەن تا خەڵقی سیسی تۆ نــەبێ پاراو بە خوێناوم**

**لــە باغچۆڵەی ژیانی خۆم، نــەکەم شـــــەرتە بژارێکی**
**کــە تۆ ڕیشــەی ژیانم بی، ئــــــەمن پێوەندی بـــالاٌتم**
**دەبـــێ بڕژێتە بن ڕیشەت لــە چاوانم ڕووبـــــــــارێکی**
{دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل٢٦ }

دیسان شاعیر لەگەڵ نیشتمان دەکەوێتە گفتوگۆ بەو پەڕی ورە بەرزی و سەر بڵندییەوە هەست و نەست و بیروباوەڕی خۆی بۆ دایکی نیشتمان هەڵدەڕێژێ و دووپاتی دەکاتەوە کە گیانی خۆی بەخت بکات و خوێنیشی وەك ڕووبار لەبەر پێیەکانی بڕژێنێ تا ئەو کاتەی لە گێژاوی دڵی هەموو دەشت و شێوەکان دەبێتە گوڵزاری بەهار، هەموو شەتڵ و نەمامێکی دارستانی ئەم نیشتمانە ڕەنگینە تێر ئاو نەخوات و پاراو نەبێ بە خوێناوی ئاوڕ لە ژیانی خودی خۆی نەداتەوە و گشت ئێش و ئازار و ئاواتەکانی خۆی فەرامۆش بکات. بژاری باخی ژیانی خۆی نەکات. بەڵکو خۆی بتوێنێتەوە و ببێتە ئاو یان ڕووبارێك لە فرمێسك دروست بکا و بڕژێتە بن ڕەگ و ڕیشەی درەختی نیشتمانەوە. محەمەدی نووری کاتێ لە ژێر باری غەمە قورس و پیرۆزەکانی دەتلێتەوە و ئێش و ئازار و مەزاری خەڵوەتی پێ دەگرن و بێئومێدی و ناکامی دەست لە بێنە قاقای دەنێت. ڕەشبین دەبێت و بەشێوەیەکی مەنەلۆج لەگەڵ خۆی دەکەوێتە وڕێنە و سەری سوڕ دەمێنێ لەوەی کە دەبێ بۆچی دڵ لێرە بەند بێ. یان سکالاٌ لە ساردوسڕیی دۆست و یاران دەکات کە چۆن وەك بەستەڵەك سارد و بەستراون و جووڵە و گەرمیان تێدا نییە. بەجۆرێك وا دەبینی کە گلۆڵەی کەوتۆتە لێژی. بۆیە جگە لە بێهودەیی، چاوەڕێی هیچی تر ناکات. هەروەك لە شیعری (دزو خاوەن ماڵ) دیمەنەکانی ئەم شانۆ ڕۆمانسیمییەمان پیشان دەدات و دەڵێ:

| | |
|---|---|
| **ســی هەزار ســاڵە نەژادی ئــــاریام** | **لــە ئێران زەمین ئــاریـــــایی ژیــــام** |
| **تۆ رمەی مادم، بەعەسل و رەســەن** | **ترکە پێم دەڵێ ((سەن هاراڵی سەن))** |
| **بـــەدەورم دادێ بـــــەفروفیشـــــاڵ** | **بــۆتە نــــەقڵەکەی دز و خاوەن ماڵ** |
| **جـــاوەرە توخوا چاو نـــــــەبارینێ** | **خلـــە شێوی کـــا، بـــلە دایچێنــــێ** |
| **بێ هۆ ژیانم لە خۆم حەرام کـــــرد** | **کەس گوێی نەدامێ چەندی هەرام کرد** |

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل١١٠ }

پاشان ئەم ڕەشبینی و هەناسەسوارییە لای شاعیر زۆر نامێنێتەوە جارێکی تر ڕۆژی ئومێد و ئازادی پڕشنگی خۆشی پەرش و بلاو دەکاتەوە لە دەیان پەنجەرە و دەرگا و ئاسۆی ئایندەیەکی گەش و خۆش و شادە دەخاتە دڵ و دەروونی شاعیر و ڕوناکایی پێ دەبەخشێت و بە تەوژمێکی گەورەوە بیر و باوەڕی بە خاك و گەل و نیشتمان پتەو دەکا و دەڵێ:

**زۆرن ئەوانەی گیانفیدای گەلـــن دوور لە نیشتمان چاوەڕێی هەلن**

**ڕۆڵەی نەبەزی ئەم ئاو و خـــاکەن وێڵی ئـازادیی ئـەم خاکە پاکە ن**

**ویســت و ئاواتی گەل و نیشتمان ڕادەگـــەیەنن بـــەناو و نیشـــان**

{ دیوانی **محەمەدی** نووری، بستووی ژیان ل١١٠ }

٢- ئازادیی تاکەکەس، ئازادیی ژیانە، بۆیە هیچ شتێك بێ ئازادی نابێ و گەشەکردن و گۆڕانکاریی پۆزەتیڤانە بە خۆوە نابینێ، چونکە کاتێك مرۆڤ خاوەن بیر و باوەڕی ئازادانەی خۆی نەبێت وەك داشی دامەی لێ دێت و هیچ جێگا و پێگەیەکی چەسپاو و وەستاوی نابێت و هیچ شتێکیش دەربارەی ڕابردوو و ئێستا و داهاتووی خۆی نازانێ. ئافرەت وەك دایك وەك نیوەی کۆمەڵ سەرچاوەی ژیان و کۆڵەگەی ماڵ و بناغەی دروستبوونی کۆمەڵگایە و بۆتە میحوەری قسە و باس و لێکدانەوەی بیرمەند و فەیلەسوفەکان و، هەوێنی ئیلهامی شاعیر و نووسەران بۆ بەرهەمهێنانی سەدان شاکاری پڕ داهێنان و گۆڕانکاریی لە هەمان کاتدا هۆکاری هاتنە کایەوەی هەزاران چیرۆکی ئەفسانەیی و داستانی دڵداری و قارەمانی بووە. دیارە ئافرەتیش وەك تاکێکی کۆمەڵگا هەمیشە جێگای گرنگی و بایەخ بووە، بە تایبەتی لە ڕووی ئازادیی تاکە کەسەوە، بووە بە ترۆپکی مەسەلەکان و وەتەرە هەستیارەکانی بابەت و کێشە و ڕووداوەکانی ڕۆژ لە مێژوویەکی زۆر کۆنەوە تاکو ئەمڕۆ. لەم ڕووەوە ((کانت لەو بڕوایە دایە کە لە ڕەوشێکدا کە خەڵك کەلك لە عەقڵ وەردەگرن ئازاد تر دەبن)) [1]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت مرۆڤ چەند بیر بکاتەوە و بە عەقڵ و مەنتق کار بکات، ئەوەندە زیاتر ئازاد دەبێت. دەرگای سەربەستیی لە بەردەم والا دەبێت. بە پێچەوانەش. ((بەلام بە بۆچوونی هیگل

(١) رامین جەهانبە گلو، ئازادی لە ڕوانگەی هیگل و کانتدا، وەرگێڕانی: ئاکار مەریوانی، گ. سەردەم، ژ ٥٢، ئەیلولی ٢٠٠٧، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ل٩١.

ئازادی لە دەوڵەتێکی سەربەخۆدا وەدی دێت، کە نوێنەری بەهاکان و باوەڕەکانی ئەقڵی هاوولاتیان بێت))[٢].

ئافرەت یەکێکە لە ڕەگەزە زەق و گرنگەکانی ڕێبازی ڕۆمانسیزم و، لە هەمان کاتدا لە ئامانجە هەرە بەرز و پیرۆزەکانیشیەتی. کە داوای لابردنی ئەو زوڵم و ستەم و زۆرداریانە دەکات، کە بەسەر تاکەکانی کۆمەڵگا داسەپێنراوە، چونکە تاکەکان بە هەردوو ڕەگەزی مێ و نێرەوە بەتایبەتی ڕەگەزی مێ ڕۆڵێکی سەرەکی دەگێڕێت بۆ بنیاتی کۆمەڵگایەکی دروست و یەکگرتوو. بەم شێوەیە ((ئازادیی بارودۆخێکی چەسپاو نییە، لەگەڵ سروشت لە ململانێ دایە. جیاوازیشە لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر، ئازادی هەمیشە ڕێژەییە و شیاوە لەگەڵ سەرکەوتنی کێشەدا. ئازادی تەنیا بە تێڕامانی یەکێ لە ئاریشەکانی میتافیزیکی و هۆشیاری سروشتی نایەتە دی، بەڵکو دەرئەنجامی ڕێگای ژیانە و لەوێدا دێتە کایەوە)) [١]. بێگومان ئازادی لە دیدی هەموو کەسێك چوون یەك نییە، و بەشێوەیەکی ڕەها نابینرێت. بەڵکو بەهای ئازادی تاکەکەس بەتایبەتی ئازادیی ئافرەت پێوانەیەکی ڕێژەیی هەیە و لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگۆڕێت. بەپێی جیاوازیی ئایدیالۆژیا و کەلتور و داب و نەریتە ئاینیی و کۆمەلأیەتیەکان لەگەڵ ڕەچاوکردنی ژینگە و ئەو کات و شوێن و سەردەم و بارو دۆخەی کە کەسەکان واتە شاعیر و نووسەران تێیدا دەژین و ڕەنگ دەداتەوە. دیارە ئازادیی تاکەکەس بەتایبەتی ئازادیی ئافرەت لە دید و هزری هەریەکە لە شاعیران هێمن و محەمەدی نووری دا ئاست و پایە و نرخ و بەهای تایبەتی خۆی هەیە و لە یەکتری جیاوازن.

ئافرەت لای (هێمن) جیهانێکە لە جوانی و ڕاستی و خۆشەویستی و پیرۆزی و قووڵی و کاریگەری و چەندین واتا و دیوی هەیە. جۆرەها خوێندنەوەی بۆ دەکرێت. هێمن ((باوەڕی پتەوی بە ئەوپەڕی ڕەنگدانەوەی ئازادیی تاکەکەس لە کۆمەڵگادا بووە. بە ئاسۆیەکی بەرفراوانی بیرەوە پێی ناوەتە هەرێمی ناسینی گەلان و مرۆڤ بە گشتی)) [٢].

بۆیە لە شیعری (فرمێسکی روون)دا دەڵێ:

---

(١) هەمان سەرچاوە، ل٩٧.

(٢) روبرت جلكنر و جيرالد إنسكو، ص ١٧٦.

(٣) ئیبراهیم ئیسماعیل پور، هێمن شاعیر ی عیشق و ئازادی، گۆڤاری مهاباد، ساڵی چوارەم، ژمارە (٤٥)، سەرماوەزی (١٣٨٣ — ٢٠٠٤)، ل٢٣.

**ئـــــــــارەزوومە هەرچی ئینسانە بە ئازادی بژی**
**چۆن گەلی داماو و دیل و مات و غەمگینم دەوێ؟**

{ دیوانی هێمن موکریانی، ل٣٤٧ }

هێمن لەسەر ئازادیی ئافرەت جەخت دەکاتەوە و ڕووی دەمی لە گەلەکەی دەکات و چەندەها پرسیاری ورووژێنەر دەخاتە ڕوو، کە چۆن گەلی چەوساوە و ژێردەست و ستەمدیدە سەربەست دەبێ، لە کاتێکدا ئافرەت دیل و کۆیلە بێ و وەك دابەستە لە ژوورەوە وابەستە و زیندان و کۆت و بەند بێ بەهۆی دوا کەوتوویی داب و نەریتە کۆمەلأیەتیەکان، شاعیر چاك دەزانێ کە دەرگا لەسەرداخستنی ئافرەتان لە مالّەوە و پەراوێزکردنیان، گەورەترین و بەهێزترین هۆکاری دواکەوتوویی میللەتەکەیەتی. بۆتە کۆت و کۆسپ لەبەردەم گەشەسەندن و سەرکەوتنی لە هەموو بوارەکانی ئابووری و ڕامیاری و کۆمەلأیەتی و ڕۆشنبیری و مرۆڤایەتیدا. بۆیە ڕەخنە لەو باوکانە دەگرێت کە لە تاریکیدا بیر دەکەنەوە و کورتبین و بیرتەسکن و نرخی ئازادی و گرنگی ئافرەت نازانن بە چاوێکی سوك یان وەکو کۆیلە سەیریان دەکەن و،دەرگای سەربەستی و کرانەوەیان بەڕووی جیهاندا لەسەر دادەخەن و، ڕەشبینانە بیر دەکەنەوە، و هەست بە گەورەیی و بەرزیی ئافرەت ناکەن.

شاعیر دەنگی ئازادیخوازی بەرز دەکاتەوە و داوا لە ئافرەتان دەکات کە چارشێوی ڕەش لەسەر ڕووی خۆیان لابدەن، تاکو مانگی ڕوو کولّمی گەشیان لە ژێر هەوری تەم و مژی تاریکیدا بەدەر بکەوێت و، بدرەوشێتەوە، چونکە لە سەدەی بیستەمدا کاتێك دنیا لەو پەڕی ئازادی و سەرفرازیدان شوورەییە ئافرەتی ئێمە ڕووی بگیرێت و جوانیی خۆی لە ژیان بشارێتەوە. دواتر شاعیر دێت و زیرەکانە و وردبینانە بەراوردی نێوان کچانی کورد و کچانی تری دنیا دەکات، کە چۆن ئافرەتانی جیهان لە سایەی خوێندندا فێری زانست و زانیاری و ڕۆشنبیری و هونەر بوون. دەچنە ئاسمان و قوولأیی دەریا و تەنانەت لە هەموو بوارە جیاوازەکانی ژیاندا، ڕۆلّی خۆیان دەبینن، کەچی کچی کورد لە کۆمەلّگای خۆماندا هیچ دەربارەی زانست و زانیاری و ڕۆشنبیری و هونەر نازانێ و هەر خەریکی تەشی ڕێستنەوە و دەلّێ ئەم سەنعەتی تەشی ڕستنە یادگاری وەفاییە. هەروەك شاعیر لە شیعری (یادگاری شیرین)دا بەو پەڕی هونەریەوە بە زمانێکی ناسك و شیرین و بە ئەندێشەیەکی فراوان و هەست و سۆزێکی ڕۆمانسیزمییەوە تابلۆیەکی جوانمان بۆ دەکێشێ و دەلّێ:

**چۆن دەبێ سەربەست گەلی ژێر دەست کە کچ دابەستەبێ**
**بـــەس نەبێ ئەو کۆیلەتی و ئەو کچ لە ژووردا بەســتنە**
**دەرکـــــــی داخستووە لە تۆ بابت، کەچی دەرکـــی نییە**
**دەرکـــــە داخستن لە تۆ دەرکــــی هومێد داخســــتنە**
**دارِزینـــە، مردنــــــە، ئـــاخر هـــەتاکـــەی پێت بلێن**
**نـــابێ بێتە دەر لـــــە ماڵ، مــــافی ژیانی کـوا، ژنە**
**لادە چارشــێوی ڕەشت بـا دەرکەوێ کــوڵمی گەشـــت**
**چون لـــە قەرنی بیستەما زۆر عەیبــــە ئەو ڕووگرتنە**

{ تاریك و ڕوون ل٧٠ }

جارێکی تر هێمنی شاعیر لەگەڵ کچ و کوڕانی میللەتەکەی دەکەوێتە گفتوگۆ و وەسف و ستایشی کچانی گەلەکەی دەکات کە چەندە جوان و ناسك و خنجیلانە و دڵ و دەروون پاك و بێگەردن، بۆیە لە خوا دەپاڕێتەوە کە ئەم فریشتەی سپی و جوانییانە دووربن لە پەڵە و هەموو سیمایەکی پیس و ناشیرین. هەروەها چیرۆکی ڕاپەڕینی میللەتان دەگێڕێتەوە و باسی لە خۆ بوردوویی و بەخشندەیی و ئازایەتی و چالاکی میللەتانی تر دەکات. کەچی لێرەدا لەم ڕۆژگار و سەردەمەدا، کچانی کورد بێبەری و بێبەشن لە هەموو ماف و داخوازیەکانیان و وەك حەپسێك لە ژێر چارشێودا ماونەتەوە. لە کاتێکدا ئافرەتانی هەموو دنیا سەربەست دەستەملانی حەز و خواست و مەیل و ئارەزووەکانیانن و، شان بە شانی پیاوان خەبات دەکەن و تێدەکۆشێ و پلە و پایە و بەرپرسیاریەتی گرنگ و کاریگەر و هەستیار دەگرنە ئەستۆ، بەلاّم لە هەمان کاتدا هەقی کچانی کورد دەخورێ و بەبا دەدرێ و پێشێل دەکرێت. بۆیە داوایان لێ دەکات و هانیان دەدات بۆ مافەکانیان. دیسان جارێکی تر هاوار و سەدای ئازادانەی بەرز دەکاتەوە، پێ یان دەڵێت: زنجیر و کۆت و بەندەکانتان بپسێنن و، با ژاندارکیش وەك مەردان هەستێ و دوژمن لە خاکی کوردستان تەفر و تونا و ڕیسوابکات و، لە خاکی کوردستانی وەدەرنێت، وەك لە شیعری وتو وێژی (کچ و کوڕ)بەدەر دەکەوێ و دەڵێ :

**کـــچی هەموو کەس ئەمڕۆ سەربەســتە**
**هــەر هەقی کچی کــــــوردە پێی پەستە**

**بپســێنه لـــه پێ تۆ زنجیر و کـــۆت**
**دێــده گیان بده یــاری بـــرای خــۆت**
**لــه کوێن (ژاندارك)هەسته وەك مەردان**
**دوژمــن وەدەر نێ لــه خــاکـی کوردان**

{ تاریك و ڕوون ل٥٠ }

هەوڵی ئەوە دەدات پەلاماری لانەی شێران بدات، ئەو لانەی کە لاوانی کورد بە تایبەتی کچان و ئافرەتان خۆیان تێدا لە سەنگەر گرتووە و چاوەڕێی ئەژنۆشکاندنی دوژمن دەکەن. شاعیر پەنجەی تاوان و زۆرداری و خیانەت بۆ ئەوانە درێژ دەکات کە بەردەوام خەون بە چەوساندنەوە و زوڵم و داگیرکردن و دوژمنکاریەوە دەبینن. تەنیا بیر لە شەڕ و کوشتن و گرتن دەکەنەوە، وەك شەمشەمە کوێرەکانی تاریکی ڕق و قینیان لە ڕووناکیە و، چاویان پێی هەڵناهێ. یان وەك دڕندە کێویەکانی بن گەوەڕ و کەندەلانەکان، بە دیتنی دیمەنە جوانەکانی گوڵ و سوێسن و کنێر و چیمەنی سەرنجراکێش ئاشنا نین و دڵتەنگ دەبن. بەلاّم شاعیر بڕوای بە لاوان و کچانی میللەتەکە زۆر پتە و بەهێزە و بەوپەڕی گەشبینییەوە تێیان دەڕوانێ و چاوەڕێی ئایندەکی گەش و ڕووناکیان لێ دەکات، کە دەبینێ ئافرەتان لە پێناوی مافی ئازادی و داخوازیە ڕەواکانیان بێ ترس و بێ باکانە چەکی خەباتیان دەست داوەتێ و، مەردانە ڕێگای پڕ کێشە و ترسیان گرتۆتە بەر و هەنگاو بەرەو چیای ڕزگاری دەهاوێن و، ماندوو نابن، لێرەدا شاعیر کاتێ دیمەنی هەڵمەت و خەبات و تێکۆشانی ئافرەتی زەحمەتکێشی کورد دەبینێ و، لە دژی ستەم و قەلای زۆرداری، دڵی دەکەوێتە خورپە و هەست و نەستی بە جۆش و خرۆش دێنێ و، زامی کۆنی سارێژ دەبێ و ئاواتی لەمێژینەی دێتە دی و کەش و هەوایەکی گەشبینیی باڵی بەسەر دەکێشێ. بۆیە هێزی حەزێکی گەورە و خۆشویستیەکی بێ پایان لە ناخی دروست دەبێ خۆی بە قوربانی دەست و تفەنگ و خەباتی ئەو کچانە دەکات کە گیان باز و فیداکار و بوێرن و بەو پەڕی سەربەرزی و ئازایەتی و ڕوو سوریەوە، خوێنی خۆیان دەڕێژن بۆ ئاودانی گولاڵە سوورەی ئازادی. شاعیر لە شیعری (دسڕێژی لاوان)دا بەم شێوەیە ڕۆڵ و کاریگەریی ئافرەت و ئازادیمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەڵێ:

**فیـدای کۆڕی خەباتت بـم کچی کورد**
**کــــه گیانبـــاز و فیداکار و بـوێری**
**ئــەتۆ سەربەرز و ڕووسووری بەخوێنت**
**گـولاڵه سـوورەی ئـــازادی دەدێـــری**

{ دیوانی هێمن موکریانی ل٣٥٩ }

هێمنی شاعیر جگە لەوەی کە بڕوای پتەوی بە ئازادیی تاك بە تایبەتی ئازادیی ئافرەت هەبووە. لە هەمان کاتدا زۆر سوور و توند بووە لە سەر ئازادیی بیر و باوەڕ و ئایدیۆلۆجی مرۆڤ، هەمیشە جەختی لەسەر کردووە و دووپاتی کردۆتەوە. وێڕای ئەم هەموو فشارە زۆرەی لەسەر شاعیر بووە و ژیان و سەر و ماڵی خستۆتە مەترسیەوە. ئەمەش لەبەر ئەوە بووە کە شاعیر خۆی مارانگەز بووە و دەردی زۆری چێشتووە، بەدەست ستەم و زۆرداری و کپکردنی دەنگی ئازادییەوە. بۆیە شاعیر هەردەم لە بیرو خەیاڵی ئازادیی بووە، لە هەموو کەسێك زیاتر نرخی زانیوە و خۆشی ویستووە و شیعری بەسەردا هەڵداوە. چونکە مرۆڤی برسی لە هەموو کەس زیاتر نرخی نان دەزانێت. هەروەك شاعیر دەڵێ: ((لەوەتەی من قەڵەمم بە دەستەوەیە قەتم هەست بە ئازادییەك نەکردووە، کە قەڵەمی خۆم بە کەیفی خۆم بەردەم)) (١).

بێ گومان هەر ئەو ڕەوشە ناهەموارەی شاعیر تێیدا ژیاوە لە وانەیە وای کردبێ کە زیاتر لە کەسانی تر بایەخ بە ئازادیی تاکەکەس و ئافرەت و بیر و باوەڕ بدات. لەم ڕووە وە ڕۆلێکی گرنگ و بەرچاو بگێڕی. لەم بارەیەوە هێمن لە شیعری (ئامێزی ژن) بەهەست و سۆزێکی زۆرەوە ڕۆمانسیانە خۆشەویستی ڕازی دەروونی خۆی بۆ بووکی ئازادی دەکاتەوە و دەڵێ:

**بـەڵێ سەختە یەکجار سەختە**
**دووری لـــە ژن، نـــــامـرادی**
**بـــەلاّم لــــە ژن خۆشەویستر**
**لـــە لای من، ئەتۆی ئازادی!**

{ تاریك و ڕوون ل١٧٢ }

ئازادی لە لای محەمەدی نوریی شاعیر لەسەر و ماڵ، لە گیان و جەستە گرنگتر و خۆشەویسترە. بۆیە هەردەم لەگەڵ غەم و ئێش و ئازاری میللەتەکەیەتی و بۆ ساتێکیش هەرگیز لە یادی نەکردووە. لە پاڵ ئەمەشدا ئازادیی تاکەکەس و ئافرەت کە بەشێك بووە لە ئازادیی گشتی و تەواوکەری یەکترن جێی بایەخ و ئاوڕ لێدانەوەی شاعیر بووە. ئەو ڕەوشەی کە بەرۆکی کوردی گرتووە، شاعیری هەراسان کردووە، بەتایبەتی پاش بەسەربردنی تەمەنێکی زۆر ژان و ئازار و ئەشکەنجەی غەم و مەینەتی و هەژاری و ستەم و چەوساندنەوە و دەربەدەری و زەبروزەنگی زۆردار و داگیرکەران وایان لە شاعیر کردووە، کە هەستی ئازادی لە هزر و ناخ و

---

(١) هێمن، چەپکێ گوڵ و چەپکێ نیرگز، ل١٣٩.

دڵ و دەروونیدا چرۆ و گەشە بکات، وەك شاعیرێکی ڕۆمانسیزم هەموو بنەماکانی ئەم ڕێبازە، لە سەرووی هەموویانەوە ئازادیی ڕەها لە بیرکردنەوە و گوزارشتکردن و هەڵسوکەوتی ژیاندا لە شیعرەکانی ڕەنگ بداتەوە. هەرچەندە گومانی تێدا نییە، ئەم ناوەرۆکی ئازادییە لە لای هەر شاعیرێك بە جۆر و شێوازێك ڕەنگی داوەتەوە، کە مۆرك و سیمای خودی شاعیرەکەی پێوە دیارە. لە شیعرەکانی محەمەدی نوریشدا بەگشتی دەنگی ئەم ئازادییە لەوپەڕی ناخەوە لە هەست و نەستێکی کاریگەر و ڕاستەوە دەبینرێ و دەبیسترێ، بێ ئەوەی زۆر لێکردن و ناڕاستیی پێوە دیار بێ. ئەگەرچی ئەم ڕەنگدانەوەی ئازادییە لە شیعری هەر شاعیرێکدا بە پێی قۆناغەکان و گۆڕانی شوێن و کات و بارودۆخەکان گۆڕانی بەسەردا هاتووە و بەرزی و نزمیی بەخۆوە بینیوە. محەمەدی نووریی شاعیر زیاتر جەخت لەسەر ئازادییە گشتیەکان دەکاتەوە لە کۆ و گشت و سەرجەمەوە دەچێتە تاك و تایبەت و بەشەوە. واتە لە چوارچیوەی ئازارەکانی کۆمەڵ و میللەتەکەیەوە باسی ئازاری تاکەکەس بەنێر و مێوە دەکات و، گوزارشت لەو بارودۆخ و سەردەمە دەکات کە کوڕان و کچانی میللەتەکەی تێدا دەژین و شیعرەکانی شاعیر ئەگەرچی لەم ڕووەوە کەمن، بەلاَم مشتێك نموونەی خەرواریکە و کەم و زۆریش نابێتە پێوانە بۆ بەرزی و نزمیی ئاستی داهێنان، چونکە زۆر جار تاکە شیعرێك بەسە بۆ سەلماندنی گەورەیی و بەرزی و نەمریی هەر شاعیرێك. هەرچۆنێك بێت ئەوەی لێرەدا بەدی دەکرێت شاعیر ڕاستگۆیانە لە جوانترین شێوە و ناوەرۆکدا و بە پۆشاکێکی ڕۆمانسیزمی باسی ئازادی دەکات و هەوڵی بۆ دەدات و خەونی پێوە دەبینێت، بۆیە شاعیر ڕوو لە دایکی نیشتمان دەکات، ئەو دایکەی کە لاوانی کچان و کوڕانی دڵسۆزی لە ئامێز گرتووە لە گەڵیدا دەکەوێتە گفتو گۆ و مژدەی ئازادی و سەربەستیی دەداتێ. داوای لێ دەکات کە هیچ کاتێك غەمگین و ڕەشپۆش نەبێ، چونکە کچان و کوڕانی تۆ ئەمڕۆکە هەموو مەست و سەرخۆش و بێقەرارن، دڵ و دەروونیان بۆ هێنانە دیی ژیانێکی شاد و بەختەوەر و ئازادیی دوور لە هەموو ستەم و چەوساندنەوە و کۆت و بەندی ژێر دەستی کەوتۆتە جۆش و خرۆشەوە، هەنگاو بەرەو ژینێکی تازە دەهاوێ. هەر ئەمەشە وای لێکردووە بە ئاشکرا و ڕاشکاوی و بێباکانە بچێتە مەیدان و نەفرەت لە شەوە زەنگی تاریکی و ژێردەستیی دوژمنان بکات و دروشمی یان ئازادی بۆ گەل و نیشتمان یان مردن بەرز بکاتەوە و بیکاتە چاوگەی تێکۆشان و بژێوی ژیانی تا هەتاهەتایە. هەروەك لە شیعری (یا وەتەن یا مردنم) ئەم ڕاز و خواستەمان بۆ دەدرکێنێ و دەڵێ:

**غەم مەخۆ دایکی وەتەن تۆوی مرادت شین ئـەکا**
**لاوی تۆ سەرخۆشە ئەورۆ پاکی داوای ژین ئـــەکا**
**داغی بالآی سەوزی تۆیە دوژمنت هەر شین ئەکـا**
**تینی زوڵمی کۆنی تۆیە قەلبی من پڕ کین ئـەکـــا**
**نـامەویٚ ژێردەستی دوژمـــن، بێتە تۆقی گەردەنم**
**نـامـــەویٚ ئەم ژینە تاڵـــــە یان وەتەن یان مردنم**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان، ل٢٠ }

محەمەدی نووری وەك مرۆڤێکی زەحمەتکێش و بێنەوا و شاعیرێکی بێبەش و نائومێد و چەوساوەی کورد نەداری و کەسەر و دەردەسەریی زۆر دیوە و هەستی بە ئێش و ئازارەکانی کۆمەڵ و گەلەکەی خۆی کردووە. کاتیٚ لە ڕووخساری کز و زەرد و پڕ نائومێدی تاکەکانی نەتەوەکەی ڕوانیوە بێزاری و نارەزایی و ناکامیی تێدا خوێندۆتەوە. بۆیە دەبینین شاعیر داوای ئازادی بۆ هەموو چین و توێژەکانی کۆمەڵ دەکات، نەك تەنیا لایەنێك یان بەشێکی کۆمەڵگا. چونکە شاعیر باش دەزانیٚ جگە لەوەی ئافرەت وەك توێژێکی گرنگ دەچەوسێتەوە و ژێردەستە لە پاڵ ئەمەشدا هەموو گەلەکەی و سەرجەم تاکەکانی کۆمەڵ بە کۆت و بەندی دیلی و کۆیلەتیەوە دەبینیٚ. بۆیە لە ڕوانگەی گەلەکەیەوە لە هەموو ئەندامەکانی خۆی دەڕوانیٚ. پاشان بە ناخیاندا شۆڕ دەبێتەوە. هیواو خۆزگە و خواستەکانی خۆی تێدا دەدۆزێتەوە، بۆیە زۆر بەتوند و تینەوە شاعیر دەوروژێنیٚ و پاڵی پێوە دەنیٚ و هانی دەدات بۆ ئەوەی دەنگ بەرز بکاتەوە و بانگی لاوانی میللەتەکەی بکات. پێیان بڵیٚ پیویستە لەسەر لاوان کە لە نێو کۆڕ و کۆمەڵ و گەلاندا وەك گوڵێکی بیٚ دڕك و داڵ بن و تا دەکرێت جوان و بەسوود و بە کەڵك بن بۆ مرۆڤایەتی. ئەگەرنا بابیٚ ناونیشان بن و گۆڕ بزر و بیٚ سۆراغ و سەرو شوێن بن. چونکە ئەگەر مرۆڤ نەتوانیٚ بەسەر بەرزی و ئازادی بژی و بمرێت و بەرەنگاری دواکەوتوویی ببێتەوە یان بۆ ئەوەی دەرباز بێت لە لێدان و کوتان و باری گران و زەحمەتی ئەم ڕۆژگارە چەوت و سپڵەیە پێویستە تەبا و یەکگرتوو بیٚ بۆ بەدیهێنانی مافەکانی لە ژیان و ئازادی. شاعیر لە شیعری (ماڵ و تەبایی)دا دەڵیٚ:

**کـوڕ لە نێو کۆڕی گەلاندا وەك گوڵی بیٚ خار نەبیٚ**
**بــــیٚ نیشان ون بیٚ لە ژینا شوێنەواری دیار نـەبیٚ**
**تـا بە سەربەرزی بژی، بمرێت و دوواکەووتوو نـەبیٚ**

**سـەر لەسەر داری ببینیٚ، مل لە نێو هەوسار نەبیٚ**

**بـا لە کاولاندا وەکو کێویان کەسـاس و کۆیلە بـیٚ**

**سـوغرەکێشی نـــاحەزان و باربەری زۆردار نـەبیٚ**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان، ل٤٩ }

محەمەدی نووریی شاعیر لەگەڵ ئەوەی بیر و باوەڕی بە ئازادی پتەوە و بەگەشبینییەوە لە ئاسۆی ئایندە دەڕوانیٚ، لە پاڵ ئەمەشدا ڕۆمانسیزمیانە خەون دەبینیٚ و خۆزگە دەخوازیٚ. بۆیە دەبینین لەگەڵ جوانترین و ناسکترین و پاکترین گیانلەبەری ئەم سەر زەمینەدا دەکەوێتە ڕاز و نیاز و ئومێدی ئەوە دەخوازێ، کە وەك ئەو ئازاد بوایە و، دوور لە ستەم و ژێردەستی، بگەیشتبووایە مرازەکانی و سەربەست لە کێو و کەژ و هەردی وڵاتەکەی بخولابوایەوە، شنەی شەماڵی ئازادی هەڵمژیبایە و ببوایە بە نوێنەری بێنەوایان، پەیامی شادی و سەربەستیی بۆ دەرەدەداران بهێنایە. شاعیر لەم ڕووەوە خواست و مەبەستەکانی زۆرە و سەدان گریٚ و گۆڵێشی لەسەر زووبانە و کە ناتوانیٚ بەئاسانی دەریان بڕیٚ و بیانکاتەوە، هەر ئەمەشە بە ڕێژنە وتە و مەبەست و پرسیار دەڕژێنتە دەروونییەوە. شاعیر لە شیعری (ئەمن و پەپوولە)دا دەڵیٚ:

**خۆزگـە پەپوولە وەك تۆ ئـــازاد بـام**

**سـەر لـــە پێناوی ڕێگای مراد بـــام**

**ئـــاوارەی کێو وکەژ و هەردان بـــــام**

**پـــەیام هێنەری خاوەن دەردان بـــام**

**مــــەبەستم زۆرە، حەزم لــــە دوانـە**

**ســــەد گریٚ و گۆڵم لەســـەر زمـانـە**

**هـــــەزاران وتە و مەبەست و پرسیـار**

**دەتکێتە دەروون وەك ڕێژنەی بـــەهار**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان، ل٥٣ }

شاعیر زۆر جار لە هێنانەدیی ئاواتەکانی و بەرجەستەکردنی ئازادیدا ڕەشبین دەبێت و تەسکبینانە بیر دەکاتەوە و هەنگاوەکانی سست و لاواز و بیٚ هێز دەبێت. توانای بەرەو پێش چوونی نامینێت بەشێوەیەك جەستەی خۆی بە زیندانێك دەزانیٚ بۆ گیانی بیٚ ئارام و بێزاری کە شەیدای ڕۆژی ئازادی و شادییە، بەڵام ناگاتە ئامانج و بەم دەرد و کەسەر و داخ و

حەسرەتەوە ئاواتەکانی دەباتە ژێر گڵ و لە شیعری (ئاواتی ژێر گڵ)دا وێنەیەکی هونەریی جوانی ڕۆمانسیزمیانەمان پێشان دەدات و دەڵێ:

**لـــــە زیندانی لەشا گیانی نەحەجمیو**
**بـــەهیوای ژینی ئـازاد مـــاتڵم کرد**
**کە ژیان و گیان نەگەینە ڕۆژی ئاوات**
**هـــەمـــوو ئاواتی وان بوو ژێر گڵم کرد**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان، ل٧٩}

# تەوەری دووەم

# سروشتی خود لای شاعیران: هێمن و محەمەدی نووری

## ١- نامۆیی و تەنیایی و گۆشەگیری:

سروشتی خود لای هەموو شاعیر و نوسەرێك ڕۆڵێکی سەرەکی و گرنگ دەگێڕێ بۆ لەدایکبوونی هەر بەرهەمێك و بەرزی و سەرکەوتوویی داهێنانی هەر شاکارێك. واتە ئەزموونی شاعیر چاوگەی هەموو کارێکی ئەدەب و هونەری مەزن و نەمرە. نامۆیش بەدەر نییە لە پێکهاتەی سروشتی خود، نامۆیی بەواتای ونبوونی هیوا و ئاوات و ئامانجەکان و دابڕان و پەراوێز بوونی مرۆڤە لە بوارەکانی کۆمەلاّیەتی و ڕۆشنبیری و لایەنەکانی تری ژیان لە بارەی خود و دەروونەوە. لەهەمان کاتدا توانەوەیە لە تەنیایی و گۆشەگیری ئاوارەیی و لاوازی و بێدەسەلاّتیدا جگە لە مانەش ((زاراوەی نامۆیی چەند سیمایەکی تری هەیە کە ئەم واتایانە دەدات: گۆشەگیری، تەنیاییی، غەریبی، ترازان، چوونەدەر، داماڵین، وازهێنان، گواستنەوە و پەڕیوە و پەڕاگەندە و ئاوارەیی و تاراوگە و دووری)) [(١)]. مرۆڤ کاتێ نامۆ دەبێ لە هەموو شادیەکان و سەرکەوتن و بەرەوپێشچوون و خواستە بەرزەکان و گەش بینی دادەماڵرێ و هەست بە لەدەستدان و دۆڕاندنی خۆشەویسترین و بەنرخترین ئازیز و ئاواتی خۆی دەکات، فرۆید دەربارەی نامۆیی دەڵێ: ((کاتێ ڕاڕایی و نامۆبوون بەرز بێتەوە، پاڵ بە مرۆڤەکانەوە دەنێت بۆ خۆکوشتن)) [(٢)]. هەروەها سەبارەت بە چەمکی نامۆیی لەنگرودی شاعیر فارسی دەڵێ: ((غوربەت یانی دابڕان لە خودی خۆت، یانی دوور کەوتنەوە لە هەڵسوکەوت و جموجۆڵێکی زیندوو، کە ناسنامە و کەسایەتیی مرۆی دروست کردووە)) [(٣)].

---

(١) کیلاس محمد عزیز العسکری، الاغتراب فی شعر الشاعرین محمود درویش و شیرکو بیکەس، رسالة ماجستیر، جامعة بغداد، کلیة التربیة (للبنات)، ٢٠٠٥، ص٣٠.

(٢) کەمال معروف، چەمکی نامۆبوون لە ئەدەبیاتی ئەورووپی و شیعری نوێی کوردیدا، گۆڤاری گەلاوێژی نوێ، ژمارە(٣٠)، ساڵی ٢٠٠٢، ل١٩٥.

(٣) ناسر وەحیدی، شاعیر لە غوربەت شیعر لە کۆچدا، گ ڕامان، ژ ٣١، کانوونی دووەمی ١٩٩٩، ل ٤٤.

بەمە شێوەیە دەبینین ژیان لای ڕۆمانسیزمیەکان ڕەها و بێ کۆتاییە. بۆیە شاعیرانی ڕۆمانسیزم هەرچیەك بەدەست بهێنن، هیچ بەهایەکی نییە و ناتەواو و کەموکورت و پارچەیە، بەمەش ژیانیان گیرۆدەی دڵەڕاوکێ و خەون و خەیاڵ بووە، تا وای لێکردوون لەم جیهانە پان و بەرینەدا تەنانەت لە ماڵی خۆشیاندا هەست بە نامۆیی بکەن.

(نۆڤالیس – novalis)گەورە ڕۆمانسیزمی ئەڵمانی دەڵێ: ((ئەو ئاوازەی ڕۆمانسیزمیەکان بۆ یەکەمین جار دەیان ژەنی، دواتر هەرگیز نەبڕایەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە ڕوو لە زیاد بوون و دووپاتبوونەوە بوو، بە درێژایی قۆناغی پێشکەوتنی جیهانی سەرمایەداری. ئەمەش دەرئەنجامی زیادبوونی نامۆییە کە مرۆڤ هەستی پێدەکرد لە ژیانیدا)) [(١)]. بەم شێوەیە دیاردەی ((نامۆبوون لە زۆربەی سەردەمەکان هەبووە، بەڵام هەمیشە بەیەك وێنە نەبووە، چونکە ئەم دیاردەیە بەپێی کۆمەڵگا و پلەی ڕۆشنبیریی جەماوەرەکەی دەگۆڕێ)) [(٢)]. ئاوارەیی و دوورەوڵاتی و پەراگەندەیی و سۆزی دووری لە خۆشەویستان و نیشتمان، بەهێزترین و سەرەکیترین بابەتی نامۆبوونی شاعیرە. جگە لەمەش گەورەترین و بەهێزترین پاڵنەر و هاندەری شاعیر و نووسەرانە، بۆ بەرهەمهێنانی شاکاری ئەدەبیی پڕ داهێنان و ئەفراندن، بۆیە ((زۆر لە نووسەر و هونەرمەندانی گەورەی جیهان بلیمەتی و ڕەسکانی جوانناسی خۆیان لە ئەزموونی دوورە وڵاتیەوە وەرگرتووە، لەوانە جیمس جویس، تۆماس مان، مۆدیلیانی، بیکیت، بۆژین یونسکو، بێخت، ئەم کۆمەڵە نووسەرە بە هۆی مانەوەیان لە تاراوگە، توانیان شۆڕەسوارانە ئەسپی خۆیان تاو بدەن و سوود لەو ئەزموونەی تاراوگە وەربگرن و بیکەنە خاڵی وەچەرخان لە ژیانیاندا)) [(٣)]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە نامۆیی وێڕای ئەو لایەنە خراپانەی کە لە سەر دەروونی مرۆڤ دروستی دەکات، لە هەمان کاتدا زۆر جار ژێدەر و فاکتەرێکی سەرەکییە بۆ داهێنانی هونەری و ئەدەبی بەرز هەرچۆنێك بێت ((نامۆیی لە شیعری کوردیدا، ڕەگێکی گەلێ کۆنی هەیە، ڕەهەندێکی

---

(١) د. حلمی مرزوق، نفس المصدر، ص٤٥.

(٢) فەرمان حەسەن ساڵح، مرۆڤ و نامۆبوون، گ ڕامان، ژ ٢٤، حوزیرانی ١٩٨٨، ل٤٢.

(٣) سەرکەوت پێنجوینی، تاسەی غوربەت لە شیعری نوێی کوردی تاراوگەدا، گ ڕامان، ژ ٤٨، هەولێر، ٢٠٠٠ـ ل ٥١.

جوگرافیە، پەیوەندیی بە شوێن و کاتەوە هەیە. مرۆڤ کە لە ولاتەکەی خۆی نامۆ بێ، کە ئاوارە بوو بۆ شوێنێکی تر، زیاتر تووشی نامۆیی دەبێ)) [1].

ئەوەی لێرەدا لەم ڕۆژگارە دەبینرێت و جێی ئاماژە پێکردنە، نامۆیی لە ئەدەبیاتی کوردیدا وەك دیاردەیەکی زەق و بەرچاو خۆی دەنوێنێ. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕەوشە نالەبارەی کە گەلی کوردی گیرۆدە کردووە، وەك نەبوونی ئازادی و ئارامی و ئاسایش و خالە نێگەتیڤەکانی داگیرکردن و چەوساندنەوە و توندوتیژیی ڕامیاری و خراپی و ڕەقی هەلسوکەوتی دوژمنان و لە پاڵ ئەمانەش دا فشارە ڕامیاری و کۆمەلایەتیەکان و کاریگەرییان لەسەر هزر و ناخ و دڵ و دەروونی مرۆڤی کورد وای کردووە کە دووچاری نامۆیی ببنەوە، بەتایبەتی کەسانی هەستیار و شاعیر نووسەر و ڕۆشنبیران زیاتر دەکەوتنە بەر نووکی ڕمی ئەو دیاردەیەو تووشی قەیران و تەنگژە و بێ ئومێدی دەبوون، کاتێ کۆشکی هیواکانیان دەڕووخان و خەونەکانیان دەبوونە تراویلکە. ئەمەش هەروەك لای هێمن و محەمەدی نووری دەردەکەوێت.

نامۆیی لای هێمن دیاردەیەکی زەقە و، ڕووبەرێکی گەورە و فراوانی لە ژیانی و بەرهەمەکانی داگیر کردووە و، بەشێکی زۆری پێك هێناوە. بۆیە ئەگەر بەناخی ژیان و شیعری ئەم شاعیرە مەزنەدا بچینە خوارەوە، دەبینین هێمن ((هەر لە سەرەتاوە بەر لە شاعیربوونی لەگەڵ دابوونەریتی چینایەتیی خۆیدا نامۆ بووە و لە ململانێیەکی ڕۆحی و پەروەردەیی سەختدا ژیاوە. نامۆ بوو بە کەلتوری بنەماڵەکەی خۆی تا سەر ئێسقان، ئەوەندەی بۆی کراوە دوژمنایەتیی لەگەڵ ئەو کەلتورە کۆمەلایەتیەدا کردووە)) [2].هەر بۆیەش شاعیر (لەکوێوە بۆ کوێ)ی نوسیویە و دەڵێ: ((ڕێوشوێنی بنەماڵەکەمان ئیجازەی نەدەدا من لە گەڵ هاوتەمەنەکانم گاڵتە و گەپ بکەم... ئەوان نەیان دەزانی بەو کردەوەی خۆیان چۆن هەستی من بریندار دەکەن، برینێك کە دەبێتە گریمانەی ڕۆحی و تا مردن سارێژ نابێ. ئێستاش کە وەبیرم دێتەوە کزەم لە جەرگی دێ و خەمێکی گران دامدەگرێ کە من لە هەموو خۆشی سەردەمی منداڵی بێ بەش بووم)) [3].

---

(١) د. کەمال معروف، هەمان سەرچاوە، ل ١٩٢.

(٢) سوارە قەلادزەیی، دیالۆگێك لە دیداری (هێمن)ی گەورەدا، گ کاروان، چاپخانەی منارە، هەولێر، ژ ١٣، ٢٠٠٧.

(٣) هێمن، تاریك و ڕوون، ل٤، ٥.

هەرچەندە شاعیر کوڕە دەوڵەمەند و کوڕی شیخەلئیسلامی بەناوبانگ و خاوەن دیوەخان بوو، تاکو بڵێی پۆشتە و پەرداخ و تێرو پڕ و پارەدار بوو، بەلاّم ئەمە بەلای شاعیرەوە هەر بەندیخانە و قەفەسە. بۆیە شاعیر هەرگیز ئاسوودە و بەختەوەر نەبوو، شتێك نەبووە غەمەکانی لەبیر باتەوە و سەبوریی دڵە ناسکەکەی بدات و، ببێتە هۆکاری فەرامۆشکردنی ئازارەکانی. جگە لەو چیرۆکانەی شەوانە کە دایە (مرۆت) بۆی گێڕاوەتەوە هەروەکو خۆی دەڵێ: ((تەنیا بیرەوەریەکی خۆشم لە زەمانی منداڵیم هەیە، ئەویش ئەوەیە شەوانە دەچوومەوە ژوورێ و سەرم وەسەر ڕانی دایە مرۆت دەکرد و ئەویش حیکایەتی بۆ دەکردم تا خەو دەیبردمەوە)) [1]. بەم شێوە دەبینین کۆت و بەندەکانی دابونەریتی کۆمەلاّیەتی و دیوارەکانی شوورەیی و بەربەستەکانی چینایەتی، دەبێتە ئەو شوورە بەهێزانەی لەودیو سنووری بێبەشی و بێبەریبوونی لە شادیەکانی منداڵی دەهێڵێتەوە. هێمن لەسەرەتاوە چەوساوەتەوە، نەیان هێشتووە وەك هەموو منداڵێکی تر کردەوە و ڕەفتاری ژیانی منداڵیی خۆی پیادە بکات وەك منداڵ بژیت بۆیە ئەمە سەرەتا و قۆناغییەکەمی نامۆبوونی شاعیرە، بەهاوتەمەنەکان و منداڵانی کوچە و کۆلاّنی گەڕەك و گوندەکەی خۆی. هەر ئەمەش وای لێکردووە کە کزەی لە جەرگی بێ و ئاخی بۆ هەڵکێشێ. شاعیر هێندە ئێش و ئازاری نامۆیی و تەنیایی و گۆشە گیری چێشتووە. ڕەنگ و بۆی پێوە گرتووە و شیعرەکانی بوون بە کۆتەڵێکی غەم و نامۆیی. تەنانەت لە هیچ شوێن و جێگەیەك هاوڕاز و هاودەمێك بەدی ناکا و، دڵسۆز و ئارامبەخش و هاوسۆزێك لە دەوروبەری خۆی نادۆزێتەوە و هیچ کەسێکیش بەدی ناکات گوێی بۆ هەست و سۆز و ڕاز و سکالاّی ڕابگرێ و بەچاوی خۆی زامی سەخت و حاڵی شێواو و پەرێشانی ببینێ. یان ببێتە هاوڕێی ڕۆژ و شەوانی و لە گۆشەی تەنیایی و بێکەسیدا لێی جیا نەبێتەوە، جگە لە خەم شاعیر هەمیشە وەك هاوڕێیەکی دڵسۆز و بەوەفا سەیری خەم دەکات کە دەبینێ لە هەموو ڕۆژگار و بارودۆخێکدا تەنیا غەمە لەگەڵیەتی و، بەجێی ناهێڵێ. بۆیە چاکەی ئەوی لەپێش چاوە کە بەردەوام لای لێ دەکاتەوە. چونکە شاعیر ئاگای لێیە لە دەفتەری ژیانیدا و لە ڕۆژمێری تەمەنی، جگە لە باسی شین و گریان و فرمێسك و ئاهوناڵە و هەناسەی سارد و ناخۆشی و غەم و مەینەت و ماتەم، شتێکی تر بەدی ناکات. باش دەزانێ تازە کەوتۆتە بۆسەی ڕۆژگاری ڕەش و سپڵەوە و سینگی بووە بە قەڵغان و لە گشت لاوە تیرباران دەکرێت،

---

(١) هێمن، تاریك و ڕوون، ل٥.

له غەم زیاتر کەس دەستی بۆ درێژ ناکات. هەروەك شاعیر لە شیعری (بۆسەی ڕۆژگار)دا بەوپەڕی هەست و سۆزی ڕۆمانسیزمیانەوە و بە ئەندێشەیەکی یەکجار فراوان و زمانێکی کاریگەر و وێنەیەکی هونەریی بەرز باس لە سروشتی خودی خۆیمان بۆ دەکات تا بلۆی ژیانی گۆشەگیری و تەنیایی نامۆیی خۆیمان پێشان دەدات و دەڵێ:

**نیمــە ئاواڵێ لــە گۆشەی بێکەسـیدا غەم نـــەبێ**
**چاکە ئەو لێرەش وەفای هەرماوە، سایەی کەم نەبێ**
**لاپـــــەڕەی ژینم هەموو هەڵدەیتەوە تێی دا نییە**
**باســـی فرمێسك و هەناسە و شیوەن و ماتەم نەبێ**
**ڕۆژگاری سپڵە بـــۆ مـــن بۆســـەیەکی نـــــایەوە**
**نــەم دی هەر تیرێکی دەی هاوێ بەرەو سینەم نەبێ**

{ تاریك و ڕوون ل١٣٢ }

هێمن تا ڕادەی ئەوپەڕی و تا سنورێکی بێکۆتایی لەگەڵ تەنیایی و نامۆیی دەژی، لەگەڵ ئاوارەیی و دەربەدەری هاودەم و هاونشینە. بۆیە تارمایی ژان و ناخۆشی دەستەملانێ دەبێت و لە باوەشی فرمێسك و گریان و ناڵە ناڵی جودایی شەوان و ڕۆژانی بەسەر دەبات. چونکە شاعیر هەرگیز ڕوویەکی گەشی لە شادی نەدیووە.

جارێك بەمیوانیش سەردانی نەکردووە، تەنانەت بە ڕێکەوتیش لەگەڵی پێنەکەنیوە و لای لێ نەکردۆتەوە. بۆیە ناچاربوو، لە وڵاتی غوربەت و ئاوارەیی و لەژێر زەبروزەنگی دوژمنان و داگیرکەراندا بە دیلیەتی و دەستبەسەری بە بێهێزی و کەساسی و بە مات و داماوی لە خانەی بێکەسی و چارەڕەشیدا لەگەڵ غەم هەڵبکات و بەرگی نامۆیی لەبەر بکات و لە هەوری چاوەکانییەوە بەگوڕ بارانی فرمێسك ببارێنێ و ڕاز و سکاڵای خۆی دەربڕێ، بۆ یە لە شیعری ((فرمێسکی گەش))دا بەم شێوەی گوزارشت لە بێوەفایی دنیا بەرامبەر بە خۆی دەکات و دەڵێ:-

**قـــەت لـــە دنیادا نەبوو بێجگە لــــە ناخۆشی بەشم**
**مــــات و دامـــا و پەشــــێو و بێکەس و چارەڕەشـم**
**ســـەردەمێك ئاوارە بـــووم، ماوەیەکیش دەست بەســەر**
**نەم دی ڕووی ئاسوودەیی، هەر تووشی گێرە و قەرقەشم**

(تاریك و رۆون ل١١٥)

شاعیر تەمەنێکە وەك بولبول لەبەر ئێش و ئازاری ژیانی ناهەموار و نالەباری خۆی دەناڵێنێ و ئۆقرەی لێ بڕاوە و ئارام ناگرێ و بەسۆز و داخەوە، هەنیسك دەدا و قووڵپی گریانییەتی بۆ ڕۆژانی بەدبەختی و هەڵوەرینی گوڵاڵەی تافی لاویەتی، هەروەك باڵندەیەکی فێرە دارستان و باخ و مێرگوزار، بەرگەی ژیانی بەندی و دیلی ناگرێ، بۆیە حەز لە مردن دەکا و دووچاری نامۆیی و دەربەدەری و دوورەپەرێزی دەبێتەوەو.

لە دوورە وڵاٚ تیشدا غەمی ماڵ و گوند و شار و وڵاٚتەکەی جەرگ و دڵی لەت لەت دەکات. لە شیعری (بابر دەڵە)دا دەڵێ:-

**لـــەبەر ئـــــازاری ژینی نـــالەبـاری**
**دەنـــــاڵێ بلبلی شــــەیدا بـــــەزاری**
**بــــە سـۆز و داخەوە دەیگوت فەقیرم**
**پـــــەڕوپۆم هـــــەڵوەری، بێ وادە پیرم**
**مــــەلێکی فێـری دارســــتان و لێڕ بێ**
**قەفەز پیری دەکـــا با شووی لە زێڕ بێ**

(تاریك و ڕوون ل ١١٢)

هێمن لەتاوی جوانیی گوڵ و خۆشەویستانی لە تالاٚوی مەرگ نزیك دەبێتەوە. هاواری نارەزایی و نەفرەت لە دژی دوژمنان بەرز دەکاتەوە کە بێ سوچ و گوناح پەرتەوازەی کردووە. پاشان لەناخی خۆیەوە دەکەوێتە وڕێنە و پرسیارەوە، دەڵێ : - دەبێ بۆچی خەڵکی هونەرمەند و ئازادیخواز هەمیشە رەنجەڕۆ و دەربەدەر و ژیانی ترش و تاڵ بێ و، لە ژن و منداڵ و خزم و کەس و ئازیز و خۆشەویستانی دووربێ و، گشت شتێکی لە دەست بچێ و، سەدان ئاریشەی بەسەربێ و، زۆرداری بەرۆکی بگرێ. یان دەبێ لە باوەشی گەرمی بەختەوەری بێبەش بکرێت و ڕۆژگاری ڕەش باڵی بەسەردا بکێشێت و ژیانی پڕ بێ لە ڕەنج و دەردەسەری و، ئاخوداخ ببێتە دیوانەی شاخ و کێوان، لەبەر چاوان ون بێت و لە دەفتەری بیرەوەری ڕەشبێتەوە و، ببێتە کۆنە چیرۆکی بەر ئاگردان و لەگەڵ ژان وپەژارەی شەوان سەر بنێتەوە، ڕۆژانیش ئارام و ئۆقرەی لێ ببڕێ. هەروەك لەهەمان شیعری (بابردەڵە)دا وێنەی نامۆیی خۆیمان پێشان دەدات، دەڵێ:-

**لـە ئامێزی گەرم بێ بـــەش کراوم**
**وەکـو تۆ تـووشی ڕۆژی ڕەش کراوم**
**ژیـــانم پڕ لـە ڕەنج و دەرد و داخـە**
**ئـەوە گیرساومەوە لەو کێو وشـاخە**
**کەســـێك نەی پرسی، نەیزانی چلۆنم**
**لـــەیادان چوومەوە، چیرۆکـــە کۆنم**
**بـــەشەو ژان و بـــەژارەم دێنە پالێ**
**بـەرۆژ ئۆقرەم نییە سـاتێك لە مالێ**

(تاریك و روون ل١١٤)

هێمن زۆر جاران ڕۆژگاری ڕەش هێندە تەنگی پێ هەڵدەچنێ و دڵی دەگوشێ و بەرچاوی تەنگ دەکا تا تەواو بێزار و بێ توانا و پەرێشان دەبێت. تەنانەت لەبوونی خۆشی دەکەوێتە گومانەوە و لەدەروونی خودی خۆی نامۆ دەبێ وەك لەشیعری (سازی ناز)دا دەڵێ:-

**ئـــاخریـن تیشکی خۆری پایـــزم**
**شـــاعیری پیری تـــووڕە و زیـــزم**
**چۆن دەتوانم بەتۆ بلێم مـــن چیم ؟!**
**خـــۆم گومانم هەیە کە هەم یا نیم؟!**

(نالەی جودایی ل ٥٢)

شاعیر وێرایی نامۆیی بەخودی خۆی لەماڵ و منداڵ و خاوخێزانەکەشی نامۆ دەبێ و زۆر جار خۆی بەغەوارەو بێکەس دەزانێ و، ((لە وڵات و ماڵی خۆیدا هەست بەغەریبی دەکا چونکە چەرخ لەگەڵیدا بەرپەرچە، ئەمیش وەکو ئەندامێکی هۆشیار، لە ڕەشە خەڵکەکە زیاتر هەست بە کۆیلەیەتی دەکا، بە ڕادەیەك لە کەسوکاری خۆشی بێزارە و گلەیی و گازاندەی هەیە))[1]. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بارودۆخە دەرونییە تایبەتە کە شاعیر تێیدا دەژی.چونکە شاعیر مرۆڤیکی زۆر هەستیارو دڵ ناسك بووە بچوکترین شت هەستی بزواندووەو کاری لێکردووە، پەست و بێزار و نیگەرانی کردوە و ویژدانی ئازار داوە، بۆیە لە شیعری

(١) محەمەد فەریق حەسەن, هەمان سەرچاوە, ل١٤.

(تەپڵی ئەمان)دا بەشێوەیەکی ڕۆمانسیزمی یانە نامۆیی لە ماڵ و خێزانەکەی دەخاتە ڕوو و، دەڵێ:-

**لــە ماڵی خۆم دەکەم بـــــۆنی غـەریبی**
**کـــە بیزارم لــــــە هەرچێکی هەمـــانە**
**ئـــــەوەی خۆشم دەویست وەك گیانی شیرین**
**تــــەماشای بۆتە مشتــــەی ناو هەمـانە**

(تاریك و روون ل١٥٥)

لێرەدا شاعیر لەنێو ماڵ و منداڵ و خزم و کەس و کاری خۆیدا خۆی بەغەریب دەزانێ و بێزارە لەهەموو شتێك. کاتێك دەبینێ ئەوانەی خۆشی ویستوون و قوربانیی بۆ داون، کەچی ئێستا لێی بوونەتە دوژمن و وەك گورگ لە پێستی مەڕدان و هەوڵی خواردن و لەناوچوونی دەدەن. شاعیر لەوپەڕی ڕەشبینی و نائومێدیدا دەژی، هەست بە دابڕان و فەوتان و ون بوون و لەدەستدانی هەموو شتێك دەکات و تروسکاییەك هیوا بەدی ناکات. جێگا و شوێن و هێلانەیەك نادۆزێتەوە تا ببێتە پەناو پەسیوی کۆتری دڵە بچکۆلانەکەی و لە زریان و سەرماوسۆڵ و سەهۆڵبەندانی زستان و کێژەڵووکەی رەشی پایز بپارێزێ و لە ئامێزی گەرمی بگرێ. بۆیە لە(ناڵەی جودایی)دا دەڵێ:-

**ڕوو لــەهەر لایەك دەکەم نامۆیە بۆم**
**نابینم جێژوان و کـــــەونە لانی خۆم**
**شەو دەکێشم شەونخوونی و بێ خەوی**
**ڕۆژ دەچێژم دەردی داخـــی بێ ئەوی**

(ناڵەی جودای ل٢٨)

شاعیر لەهەموو شوێنێ نامۆیە و، پەڕیوە و پەناهەندەی لادێ و شار و وڵاتانە. جێژوان و کەونە لانەی خۆی لێ قەدەغە کراوە. چرای هیوای گەڕانەوە و شەونخونی ناڵەناڵ و بێخەوی دەکێشێت. ڕۆژانیش بەدەم ئیش و ئازار و دەرد و داخی دووریی یارانەوە دەتلێتەوە. ژیان بەسەر دەبات کەچی لەگەڵ ئەمانەشدا شاعیر هێشتا خۆی بەدەستەوە نەداوە وە، لە ململانێ و بەرەنگاربوونەوە و خەبات و تێکۆشان بەردەوامە لەپێناوی ژیانی کوردەواری و نیشتمانی دڵگیر و وڵاتە خۆشەویست و جوانەکەی. پاشان شاعیر دوای ئەم هەموو ساڵە ئاوارەیی و دوورەوڵاتیە دڵنیا

نییە لەوەی کە ڕۆڵەی خێزان و باوانەکانی، ئەوانەی کە تەنیا ساتێکیش لە یادی نەچوونەتەوە یان بیناسێتەوە. بۆیە لێیان دەچێتە پێشەوە وپرسیاریان لێ دەکات، ئەرێ بمبینن دەبێ بمناسنەوە هەروەك لە (ناڵەی جودایی) لەبەهێزترین هەست و سۆز و جوانترین و کاریگەرترین زمانی شیعری ڕۆمانسیزمیانەدا دەڵێ:-

**کوردەواری ئـــەی وڵاتە جوانەکەم**

**ڕۆڵـــــەکەم خێزانەکەم باوانەکەم**

**ئەی ئەوانەی قەت لەیادم ناچنەوە**

**ئێستە بمبینن ئەرێ دەمناسنەوە؟**

(نالەی جودایی ل٣٠)

هێمنی شاعیر هەر لەسەرەتاوە دژی هەموو بیرو بۆ چوونێکی تەسکبینانە و کۆنەپەرستانەیە، کە بوون بەکەلتوور وەك تەوقێك بەملی گەلەکەوەیەتی وە، لەم ڕێگایەدا خەباتی کردووە و یاخیبوونی خۆی ڕاگەیاندوە وە، بە کرداریش پەیڕەوی کردوە. شاعیر دژی هەموو ئەو خوونەریتە کۆمەڵایەتیانەش دەوەستێتەوە کە بوونەتە چاوگەی سەدان کێشەو گیروگرفت و کۆسپ لەبەردەم ئازادی و مافەکانی مرۆڤدا هەر بۆیە زۆر بەتوندی بەرهەڵستیان دەکات و گوێ بەوەش نادات و بێ باکە لەوەی کە چی بەسەر دێت و چارەنووسی بەچی دەگات. ئەمەش ڕاستیەکی بەڵگەنەویستە.

چونکە شاعیر هیچ کاتێك ملکەچی خواست و ویستی دوژمنان و ئاغا و دەرەبەگ و سەرمایەدارن نەبووە و چۆکی دانەداوە. چونکە شاعیر هەرگیز نەیویستوە و لە توانایدا نەبووە بەژێردەستی بژی و لەناو خەڵك و کۆمەڵگایەکدا گوزەران بەسەر بەرێ و ڕابوێرێ، کە بێ هەڵوێست و بێدەنگ و بێکردار بن لە ئاستی فشاری زۆردار و داگیرکەران و ئەو کۆتوبەندانەی بەهۆی باری ڕامیاری و کۆمەڵایەتی و ئاینییەوە چەسپاون بەسەر کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا. بۆیە شاعیر لە شیعری ((ئارەزووی فڕین))دا لە خەیاڵێکی فراوان و فۆرم و ناوەڕۆکێکی جوان و بەهێزی ڕۆمانسیزمیدا هەوڵ دەدات بفڕێ بەرەو کەناری نامۆبوون.

لەو خەڵکانە یاخی دەبێت کە لە چەمکی ئازادی ناگەن، لەبەر ئەوە ناتوانێت لەگەڵیان هەڵبکات، چونکە ژیان لەگەڵ ئەوانەدا بەسەخت و دژوار و ناخۆش دەزانێ. لێرەدا شاعیر لەپاڵ هەست و سۆز و ئەندیشەی ڕۆمانسیزمیدا بەرەو دابڕان دەڕوات و نامۆ دەبێ و دەڵێ:-

**ژین بەیەخسیری و دیـــلی بێ کـەڵکە**
**بـــۆیە لـــەمێژە لـــــە ژینم تێرم**
**گوزەران بـــــۆمن لـــەناو ئەو خەڵکە**
**ســـەختە و نـــاخۆشە چۆنی ڕابوێرم؟**

(تاریك و روون ل١١٧)

شاعیر هیچ کاتێك نەی ویستووە ببێتە بار بەسەر شانی میللەتەکەیەوە. یان وەك مشەخۆرێك لەسەر کەوڵی گەلەکەی بژی. ئەو هەردەم لەبیر و غەمی ئەوەدا بووە کە ئەمەکدار و خزمەتکاری ولاَتەکەی بێت و گیان و سەروماڵی بکاتە قوربانی، بەلاَم کاتێك هێز و تین و تاو و گوڕی تێدا نامینێت و پڕ دەبێت و دەسەلاَتی بەخشش و چالاکی و خزمەتکردن نامێنێت، ئیتر وشك و کز و داماو، بێ زەوق و دڵتەنگ و و خەمبار و بێئومێد دەبێت و، ئارەزووی ژیانی نامێنێ و، بێزار دەبێ، حەز دەکات تا زووە لەناو خەڵکیی لاچێ و کۆتایی بەم ڕۆژگار و سەردەمە بهێنێ کە بە بیرەواجی لەبازاڕی ئەم ژیانە بەجێیان هێشتووە. بۆیە لەشیعری ((ماچی شیرین))دا دەڵێ:-

**خـــەم و دەردی زەمـــانە پیری کردم وشك و بێ زەوقم**
**کە شاعیر وشك و بێ شۆربوو لەناو خەڵکی دەبێ لاچێ**
**لـــــەگۆشەی بێکەسیدا ئێستە وا دڵتەنگ وخـــەمبارم**
**نییە بـــــاکم ئەگەر مـــاڵم بەجارێکی بـــەقوڕدا چێ**

(تاریك وروون ل ١٣٥)

ئاوارەیی و دوورەولاَتی لە ژیان و شیعری هێمندا رووپەکی دیار و سیمایەکی بەرچاوە. بەشێوەیەك بووە بە ناسنامەی شاعیر و لە زۆر جێگا و شوێندا بەشاعیری ئاوارەیی و نامۆی جودایی ناسراوە و دەناسرێتەوە ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ ئەو ماوە و کاتە زۆرەی، یان ئەو ڕۆژگارە کات و دوورودرێژەی کە شاعیر تێدا نزیکەی دەساڵ پەناهەندەو دەربەدەر و دوورە ولاَت بووە و بەنامۆیی و تەنیایی و گۆشەگیری لە تاروگەدا ژیانی بردۆتە سەر. بۆیە شاعیر لەباسی ئاوارەیی و دەربەدەری خۆیدا دەڵێ:-

((هەژار گوتەنی هەر شەوە و میوانی خانە خوێیەکم و هەر ڕۆژە لە جێیەك. زۆرم کوێرەوەری و چەرمەسەری چێشتووە ، زۆرم شەوو شەونخوونی کێشاوە، زۆرم نەداری و رووتی

دیوه))[1]. بۆیه لەم ساتەوه نامۆیی بۆته هاوڕێیەکی هەمیشەیی، شیعری هێمن و، لەگەڵیدا ڕۆیشتووه و گەشەی کردوه و گەوره بووه و باڵاپۆشی کردوه. ((هێمن وەکو یەکێ لەو ڕۆشنبیره بەئاگایانه، غەریبه!، کاتی شیعره کانی دەخوێنێتەوه هەست دەکەی غەمی نەتەوەیەکی بەکۆڵەوەیه یادی دەکاتەوه، دەیلاوێنێ. لەگەڵ کارەساتی رابردوودا دەژی و خۆی تێدا دەخواتەوه))[2]. چونکه شاعیر تەنیا گوزارشتی له ئێش و ئازارەکانی خۆی نەکردووه، بەڵکو ڕوودا و کارەسات و گۆڕانکاریەکانی ژیانی گەلەکەشی بۆته خورپەی شیعری ئەو و کانیاوی شیعری لەناخی دڵ دەرونییەوه هەڵقوڵاندوه. ((هێمن ژین و هەستی غوربەتی خۆی و نەتەوەکەی وا تێکەڵ کردووه، رەنگ و جیلوەی شەوق و بریقەیەکی وای پێداوه، بەناڵه و تاسه و حەز و ئارەزوو هەناسه هەڵکێشانێکی لەشیعرەکانیدا بۆنکڕوزی لێوه دێ، لەبەر ڕۆشنایی سووتانی دەروونیدا لەژێر گڕی ئەزەلی نەکوژاوەی توانای گەلەکەیدا ئەیلاوێنێتەوه و ڕێگای خەباتی ئەبڕی))[3].

هێمن ئەوپەڕی بێزاریی هەست بەتەنیایی و گۆشەگیری دەکات و ((لەشوێنێکی غەریب و ناسۆر لەنگەری گرتووه و، هەموو دەوروبەری لێی نامۆن هیچ دیمەنێك خەم لابەر نین بۆ ئەو ، بستێ خاك نییه باوەشی بۆ بکاتەوه و وەکو کۆرپەیەکی جگەرگۆشەی خۆی لێی نامۆن توند له ئامێزی بگرێ و نازی هەڵگرێ))[4].شاعیر دوای ئەم هەموو کارەسات و گۆڕانکاریه ناهەموارانەی تەوژمی بۆ دێنن و دەیخەنه تەنگەژەوه، دەست له بێنه قاقای دەنێن. به ناچاری ملی ڕێگای ماڵئاوی دەگرێته بەر و خواحافیزی له ژن منداڵ و دایك و باوك و خزم و کەس و دۆست و یار و خۆشەویستانی دەکات. غەمه پیرۆزەکانی میللەتەکەی لەکۆڵ دەگرێ بەرەو دوورگەیەکی تەم و مژاوی و ئایندەیەکی نادیار هەنگاو دەنێ، بەنێو کێڵگەیی مینچنراوی نامۆیغدا ڕێگا دەبڕێ، بەرەو وڵاتی غەریبی.

مامۆستا هێمن دەڵێ:- ((کاکه من دووجار غەریبیم بەسەردا هاتووه. من لەعێراق کۆمەڵێك دۆست و ئاشنام لەخۆ خڕ کردەوه کەچی لەپڕا، بەغدا لەکورد چۆل بوو، کوردەکانی

(١) هێمن، تاریك و روون، ل٤٣.

(٢) محەمەد فەریق حەسەن، هەمان سەرچاوه، ل١٤.

(٣) سەلاحی شێخ شەرەف، هێمن و ئاوارەیی، گۆڤاری کۆسار، ژمارە(١)، ٢٠٠٠، ل١٤.

(٤) سەعید شوان، هێمن شاعیری خەم و خاوەن هەڵوێست، گ ئاوێنه ژ ٢١، ٢٢، ساڵی ١٣٧٤، ل١٨.

خۆشمان، ئەوانەی ئێران زۆربەیان چوونە ئەوروپا، وە من بەتەنێ لە بەغدا مامەوە، ناڵەی جودایم لەو وەختەدا گوتووە))[1].

شاعیر لە ئەنجامی ئاوارەییدا هەناسەی سارد هەڵدەکێشێ و، دڵی دەناڵێ و فرمێسك لەچاوی ناوەستێ و دەستەکانی ئەژنۆی بەرنادەن و ژانی ناسۆری جودایی و دابران و جیابوونەوە دەچێژێ و، کۆنە زەمانی عەشقی لەگەڵ بەفری چیاکاندا دەتوێنەوەو هەرەس دێنن، چونکە شاعیر هەرچیەکی خۆش ویستووە، جێی هێشتووە و لە یار و ئازیزانی دوور خراوەتەوە و لە خاك و نیشتمانەکەشی دەرکراوە و بۆتە ئاوارە و پەرپوەی گوند و شارو زێدی خۆی. بۆیە شاعیر لەشیعری (ناڵەی جودایی)دا بە ناڵەناڵ چیرۆکی جودایی خۆیمان لەخاك و نیشتمان و یاران بۆ دەگێڕێتەوەو دەڵێ:-

**ژانــــی ناســــــۆری جودابیم چێشتووە**
**هەرچی خۆشم ویستووە جێم هێشتووە**
**هـــــەڵبڕاوم من لـــــــەیاری نازەنـــین**
**دەرکـــــــراوم مـــن لــــــەخاکی دڵنشین**
**بـــــوومە ئاوارە و پەرپوەی دوور ولآت**
**کـــــەوتمە نێو وردە داوی ڕێی نـەجات**

(ناڵەی جودایی ل ٢٨)

شاعیر کاتێك لە زێدی خۆی دووردەکەوێتەوە و لە هەموو شتێکی جوان و خۆشی و بەچێژ بێ بەش دەبێ، غەم و خەیاڵ دای دەگرێ و مەلی حەز و خۆزگە و ئاواتەکانی بەرەو لوتکەی چیایەکانی شادی بەهەشتی جوانی هەڵدەفڕێ و، خەون دەبینێ و یادی ئەو ڕۆژانە دەکاتەوە کە ماڵئاوایی لەکاتە خۆش و ئارامەکان کردوە و لەو وێنانەی کە هەرگیز لەبەر چاو کاڵ نابنەوە و وون نابن و بە نەمری دەمێنێتەوە. بۆیە شاعیر داوا لە خۆشەویستانی دەکات لەم ساتانەدا لە بیری نەکەن و یادی بکەنەوە هەروەك لە شیعری(یادم بکەن)دا دەڵێ:-

**یـــــادم بکەن یـــادی منی دوور ولآت**
**یادی منی ڕێبــــــواری ڕێگای خەبات**

---

(١) ناسر ڕەزازی، یادێك لەمامۆستا هێمن، گۆڤاری مامۆستای کورد، ژ٢٢، ساڵ؟، ل٧٠.

**یادی منی بێ بەش لە خۆشی و شادی**
**یــــادی منی ســــەوداسەری ئازادی**

(تاریك و روون ل٢٠٧)

نامۆیی و تەنیایی لای محەمەدی نوریی شاعیر وەك دیمەنێكی ڕۆمانسیزمی لە وێنەیەكی جوان و ناسك و هەست بزوێن و كاریگەردا خۆی دەنوێنێ. ئەگەر گەشتێك بەنێو شیعرەكانی ئەم شاعیرە هەست ناسكەدا بكەین، دەبینین تارمایی نامۆبوون تاڕادەیەكی زۆر باڵی كێشاوەتە سەر شیعرەكانی و، لێرەولەوێ هەرجارێ بەدەنگ و بە ڕەنگێك دەردەكەون، بەڵام هێشتا نەبۆتە سیمایەك پێی بناسرێ. هەروەك هێمنی شاعیر پێی دەناسرێتەوە. چونكە محەمەدی نووری نە لە وڵاتی غەریبیان ژیاوە، نە تاڵاوی غوربەت و تاڕاوگەی دوورەوڵاتی چێشتوە. بەڵكو شاعیر لەنێو وڵاتی خۆی ئاوارە و دەربەدەر و نامۆ بووە، وەك كۆچەرێك هەرجارێ لە گوندو لە شارێك بووە. ماڵەكەی هەرگیز لە ساڵێك یان دوو ساڵ زیاتر لە شوێنێك نەماوەتەوە. بەڵكو هەمیشە ماڵەكەی پێچراوەتەوە ئامادەی كۆچ و ڕاگواستن یان لەچوون و هاتن بووە دەردی ئاوارەیی و دەرەبەدەری و هەژاری و چەوسانەوە و زوڵم و زۆرداریی لە نێو وڵاتەكەی خۆیدا دیوە ، نغرۆی غەم مەینەت و نامۆیی كردوە، بۆیە لە(خەوێك و شەوێك)ی دیوانە شیعرەكەی خۆی دا، كاتێ بیرەوەری خۆی دەگێڕێتەوە و وێنەیەكی زیندوو لە ژیانی نامۆیی خۆی پێشان دەدات و دەڵێ:- ((ئەمن كاتێك ئەو بیرەوەرییە تاڵ و سوێرانە لە ساڵەكانی (١٣٨٢-١٣٨٣) ی هەتاویدا دەنووسمەوە كە دەوروبەرم لە دیداری عەزیزان لە دیمەنی خۆشەویستان خاڵییە))[1]. نامۆیی لە شیعری محەمەد نووریدا سیمایەكی تایبەتی هەیە، ڕەهەندێكی كۆمەڵایەتی و ڕامیاری و دەروونیی بەخۆوە گرتووە، بەشێوەیەك ئاوێتە بووە كە پێویستی بە خوێندنەوەیەكی ورد و قووڵ و لەسەرخۆ هەیە. چونكە شیعر كاتێك لە تاراوگە لەدایك دەبێت، ڕەنگ و روخسارێكی جیاوازی دەبێت، لەو شیعرانەی كە لەناو وڵاتدا لەدایك دەبن. نامۆیی لای محەمەدی نووری، جیهانێكی پڕ سۆز و خەون و خەیاڵە و، سروشتێكی تایبەتی لە ڕامان و ئەندێشە و یاخیبوون هەیە. لە ڕوانگەی خودەوە گوزارشت لەغەمەكانی گەلەكەی دەكات. لەبن پاڵی دیوارە ڕوخاو خانووە قوڕەكانی لادییەكاندا

---

(١) محەمەد نووری، دیوانی محەمەد نووری، بستوی ژیان، چاپخانەی شڤان، سلیمانی، سالی ٢٠٠٦، ل١٣٥.

فرمێسك بۆ ژیانی غەریبی خۆی و گەلەکەی هەڵدەڕێژێ. شاعیر دیاردە و دیمەنەکانی سیس و کزبوون و نەمانی مۆمێکی کوژاوەو تەمەنێکی بەفیڕۆچووی گەلا و بەری گوڵی هیوا و ئاواتەکانی بەشێوەیەکی هونەری دەتوێنێتەوە و ئاوێتەی شەپۆلەکانی دەریای خەیاڵی ڕۆمانسیزمی دەکات و، پاشان هەموو شتەکان سەر لەنوێ گۆڕانکاریانە و داهێنەرانە لە جیهانی شیعریەتدا بەشێوازێکی تازە دروست دەکاتەوە.

کاتێك شاعیر دەکەوێتە باوەشی نامۆیی، یان دەچێتە سەر کێوی ژیان و بیر لە تەنیایی و ئاوارەیی و بێکەسی دەکاتەوە، لێکچوونێك لە نێوان خۆی و داری چاکیدا دەبینێت،کە ئەو چۆن و تەنیا و پەراوێز بووە، خۆشی هەروا دەدۆزێتەوە. بەم شێوەیە شاعیر تەنیایی و نامۆییەکەی زیاد دەکات، وەك ئەو تەنیا داری چاکییەی لە سوچێکی ئەم جیهانەدا بێ هاودەم هاونشین دەژێت.

هەروەك لەشیعری ((لەسەر بستووی ژیان))دا هەستی خۆی دەخاتە ڕوو و دەڵێ:-

**لـــەسەر بستووی ژیان وەك داری چاکی**
**بـــــــەتەنیا مامەوە بێ بەرگ و بێ بەر**
**گـەلێك بـــــــێ تێنترە تـــاوی هومێدم**
**لــــــەزەردەی ڕۆژ پەڕی مانگی خەزڵوەر**

(دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل١٦)

نامۆیی لەلای محەمەدی نووری بەستراوەتەوە بەمەسەلەی گەلەکەیەوە، بۆیە پشتی تێ ناکا و لێی جیا نابێتەوە. هەروەك لە ڕەنگدانەوەی کارەساتەکانەوە بۆتە خەسڵەتێکی شیعری و، ئاوارەیی و غەریبی و دەربەدەری تەنیا دوورکەوتنەوەیەکی ڕووت نییە لە خاك و گەلەکەی. بەڵکە هەرەسهێنانی هەموو ئەو هیواو ئامانجە بەرز و پیرۆزانەیە کە دەیان ساڵە هەوڵی بۆ دەدا، لە پێناویدا دەتوێتەوە. هەرچەندە شاعیر باش دەزانێ ڕۆژگاری چەوت و دژوار لەگەڵ خۆزگە و خواست و ئاواتەکانی کۆك و ڕێك و تەریب نییە، هەروەك سێبەر لە ڕوناکی تیشکی شادی دابڕاوە و پێی ناگاتەوە.

بۆیە هەناسەی پڕ خۆشەویستی و تاسەی تەنگ و سوار دەبێت و، کۆتری ئەوینی بەکورەی داغی حەسرەت پەڕوپۆی دەسووتێ و دەڵێ:

**لــــەگەڵ ڕۆژی هومێد نارێکە  هیوام**
**وەکـــــــو سێبەر لە رووناکی ڕەویوم**
**هــــــەناسەی لێبڕا بای فێنکی ئاوات**
**بـــە کوورەی داغیێ حەسرەت داچزیوم**

(دیوانی محەمەد نووری ، بستووی ژیان ل١٦)

محەمەدی نووری لە تەمەنی خۆیدا شادیی کەم دیووە و زیاتر ئاڵوودەی دەرد و غەم و ناخۆشی بوو، هەروەك خۆی دەڵێ:-  ((هەرداخ و دەردە لە دڵی زار و زەبوونەوە دەتکێتەوە ڕۆژی ڕەشی ژیانی بێ شوێنەوارو بێ دەنگیم. هەر ئاخی ساردە لەناخی دەروونەوە سەر دەکێشێتەوە شەوەزەنگی دنیای بێ رەنگیم. نازانم چیم و چیم دەوێ ؟ لە پەلەقاژە و پێپڕکەی ئێرە و ئەوێ داوی کام داوایە لەپەرو باڵی بیر و هەستم هالآوە ؟ دانەی کام بنەیە نایگەمێ و بڕستم لێبڕاوە ؟ نە ئەوەی دەمەوێ بۆم لەپرێسکەی سرتە و پرتەوە دەپێچرێ و دێتە دەرێ.نەئەوەی نامۆیە نامەوێ بێ چپە و چرتە سەر هەڵدەداو دێتە سەرێ))[1].

شاعیر گەلێك گازەندەی خۆی لەم چەرخە بێ وەفا و نەگریسە دەکات. بێ هێز و بێ ئومێد دەبێ لەو ژیانەی کە دەسەلآتی فێڵ و درۆ و ساختەچیەتی و مادیەت و سەرمایەداری باڵی بەسەردا کێشاوە، کە تێیدا هیچ پێوەرێك نییە بۆ بەها مرۆڤایەتیەکان و هەموو شتێك لەڕوانگەی سەرمایە و بەرژەوەندییەوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت. بۆیە شاعیر یەکجار زویر و غەمبار دەبێت و دڵی دەشکێ و هەستی بریندار دەبێت، بەهۆی هەڵوێستی ناهەموار و خراپی ئەو خزم و دۆست و یارانەی کە هەموو شتێك لە ڕوانگەی سوودی خۆیانەوە دەبینن و خۆپەرستانە و هەلپەرستانە دەجوولێنەوە.بەم کارەشی درەختی هیوا دەسووتێ و ماڵی دوژمنی پێ روناك و گەرم دەبێتەوە هەروەك شاعیر لە شیعری (هەرکەس بەجۆرێ دڵم دەشکێنێ) دەڵێ:-

**هـــــەرکەس بـــەجۆرێ دڵم دەشکێنێ**
**غـــــەم و پەژارەم لـــــە ژین دەخزێنێ**
**دوژمن بەجێی خۆ بەلآم دۆست بۆچی**

---

(١) محەمەد نوری، دیوانی محەمەد نوری، بستوی ژیان، ل٩٥.

**پــەیمانی یــاریم لـــــەگەڵ دەپسێنێ**
**لە نیسێی دۆســـــتان دەپرینگێتەوە**
**ئەستۆی بــــۆ ڕەقیب دادەســەپێنێ**

(دیوانی محەمەد نووری، بستووی ژیان، ل ٩٦)

پاشان شاعیر هێندە بێزار و پەریشان دەبێ لە گوزەران کردن لە نێو ئەو خەڵکانەی کە بە فڕو فیشاڵ دەژین و نرخی ئازادی و بەختەوەری ژیان نازانن و بەتەنگ هیچ شتێکی ڕاست و دروستەوە نین و پشتی مرۆڤی ئازادیخواز و ڕاستگۆ ناگرن، بۆیە چاك دەزانێ ئەو گۆڕانکاریە خراپانەی کەکۆمەڵگای گرتۆتەوە گلۆڵەی ژیانی بەرەو لێژی دەبات و جێگە و پێگەی لەق دەکات و ژیانی ئەو بەرەو یاخیبوون و نامۆیی و دووره پەرێزی دەبات، شاعیرلەشیعری(دزو خاوەن ماڵ) بەم شێوەیە هەستی نامۆ بوونی خۆی لە خزم و یارانی دەردە برێ ودەڵێ:-

نـــازانـــــم بۆچی دڵ لێرە بـــەندە
**کەس نـــاڵێ خاڵۆ کەرت بەچەندە**
**ئەوەندەی دیومە ساردی لــە یاران**
**نـــەمدیوە سڕی لـــە بەفر و باران**

(دیوانی محەمەد نووری، بستووی یاران، ل١١٠)

شاعیر لەپاڵ نامۆبوونی لە خۆی و خێزانەکەی لە کۆمەڵگاکەشی نامۆ دەبێ، چونکە شاعیر ناتوانێ لەگەڵ چەوتی و خوار و خێچی ئەو دیاردە دزێو و ناڕێکانە بژی کە بوونەتە تەوق بەملی کۆمەڵگاوە. هەر ئەمەش وای لێکردووە کە هەوڵی بەرگری و بەر هەڵستیکردنی ئەم داب و نەریتانە بدات یان لێیان یاخی و نامۆبێت.

شاعیر بێ باکانە و بێ دوودڵی پەردە لە ڕووی هەموو ئەوکارە خراپانە هەڵ دەداتەوە، کە داگیرکەر و ئاغا و دەرەبەگ و زۆرداران پیادەی دەکەن. جگە لەوەش بەشێوەیەکی ڕەخنەییانە، ئەو گیرو گرفت وکەم و کوری و خاڵە لاوازانەی کۆمەڵگا دەخاتە ڕوو کەبوونەتە بەربەست لەبەردەم پێشخستنی بوارەکانی ژیان بەگشتی و باری کۆمەڵایەتی و ئابووری بەتایبەتی تەنانەت زۆر جار ئاستی ئەو ڕەخنە گرتنە هێندە بەرز دەبێتەوە دەگاتە پلەی دابڕان و جیابوونەوە و جێ هێشتن کەنارگیری و گۆشەگیری بوون و تەنیایی و ڕاکردن و چۆڵ پەرستی. بۆیە شاعیر لەناو خەڵك و کۆمەڵگا بەم شێوازە ناڕێکەی کە هەیە و داو و بەند و زیندان دەزانێ. لەبەرئەوە کێو و شاخ و هەردوو دەشت و وچۆڵەوانیی پێ خۆشترە. هەروەك هاوژینی

لەگەڵ دێو و درنج و جنۆکەی پێ باشتر و خۆشترە لە دۆستایەتی خەڵکی فێڵباز و دزو درۆزن و دووڕوو و هەڵپەرست و خراپ. هەروەك لە شیعری (چۆڵپەرستم خۆشترە) بەشێوەیەکی رۆمانسیزمی رەخنەکانی کۆمەڵگاکەی و نامۆ بوونی پێشان دەدا و دەڵێ:-

**دان و داوە ئـــاوەدانی و چۆڵپەرستیم خۆشــترە**

**فێڵی جندۆکە لە فێڵی دۆستی قەستیم خۆشترە**

**مــــن لــە یارانی زەمانە هەر نـەیاریم هاتەڕێ**

**هــــاودڵیم بۆ ساخ نەبۆوە دڵ شکستیم خۆشترە**

(دیوانی محەمەد نووری، بستووی ژیان، ل٤٧)

محەمەدی نووری شاعیر لەوکاتانەی زیزەو لە میللەتەکەی یاخییە و ڕێی تەنیایی گرتۆتە بەر، واتای ئەوە نییە ئیش و ئازاری گەلەکەی فەرامۆش کردوە و لە غەمی ئەودا نییە، بەڵکو بە پێچەوانەو هەمو ساتێ لەلایەتی و ئاوڕی بۆ دەداتەوە وەك ئاشقێکی دێوانە و شێت و شەیدا ڕێگای سەخت و دژواری ئاواتەکانی دەگرێتە بەر و خۆی دەکاتە ئامانجی تیری ناحەزان. بۆیە دەچێتە باوەشی گۆشەگیری و تەنیایی. پەیامی خۆی بەگریان گڕوگاڵەوە دەردەبڕێ و وەك ڕێبوارێکی دوورەپەرێز بانگ ڕادێڵێ و هاوار دەکات :- ئەی خەڵکینە کاتێك من بەهۆی چاوسوورکردنەوە و هەڕەشە و گوڕەشەوە و فشاری دوژمنان و ناحەزانەوە ئاوارەم، واتای ئەوە نییە لەگەڵ ولاٚتی خۆم زیزم بەڵکە بەپێچەوانەوە خزمەتکار و پاسەوانی و گەدایی دەرك و بان و سنووری خێڵ و ولاٚتی خۆمم بێ پاشایەتیە نەك میر بم و دیلی دوژمنان. وەك لە شیعری (کاوێژی دوورە پەرێزێك) دەڵێ:-

**لـــە گۆشەی دیدەوە ئــــــامانجی تیرم**

**لـــــەبــــەر وەی چاوەکەم وا گۆشەگیرم**

**گــــڕوو بوو یـــــان گڕوگاڵ تێم گەیشتی**

**دڵـــــت ژێر کردمەوە وا ئێستا ژێـــــرم**

**کـــە من ئـــــــــاوارەیی مۆڕەی ڕەقیبم**

**ئـــــەتۆ پێت وا نەبێ لـــە ولاٚت زویرم**

**گـــــــەدایی دەرك و بـانی خێڵی خۆم بم**

**ئـــــەوە ئـەو کـــــاتەیە پێم وایە میرم**

(دیوانی محەمەد نووری، بستووی ژیان، ل ٧٥)

## ٢- گەشبینی و ڕەشبینی:

گەشبینی و ڕەشبینی دوو دیمەنی جیاواز و دوو ئاراستەی ناکۆك و نارێك و ناتەبا و دژبەیەکن. کەم مرۆڤ هەیە هەر لەسەرەتاوە ڕەش بین بێ و تەسکبینانە تەمەشای ژیان بکات. مەگەر ئەو کەسە لەگەڵ لەدایکبوونییەوە ناتەواو بێ و، لەبارێکی دەروونیی ئاساییدا نەبێت. دیارە هەمووومان دەزانین ڕۆمانسیزم خەون و خەیاڵە. ئینجا ئەو خەون خەیاڵەیان بەرەو پێشەوە و داهاتوو و ئاییندەیە ، بەشێوەیەکی پێشکەوتنخواز و گەشبین. یان بەرەو دوواوە و ڕابردووە و سیمایەکی کۆنەپەرستانە و ڕەشبینانەی هەیە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆژگار و بارودۆخ و ژینگە و کەش و هەوا دەروونییەی کە شاعیر تێیدا دەژی. چونکە هەموو بەرهەمێکی ئەدەبی ڕەنگدانەوەی سروشتی شاعیر و ئەو سەردەم و ڕەوشەیە کە شاعیر و نووسەر و هونەرمەندانی تێدا دەژی، واتا ئەزموونی شیعری شاعیر ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێ لە لەدایکبوون و بەرهەمهێنانی هەر شاکارێکی ئەدەبیدا هەروەك (نۆڤالیس) دەڵێ:- ((هەموو ڕوداوەکانی ژیانی ئێمە کەرستەی خاون و، ئێمە هەرچیمان بوێ ئەوەی لێ دروست دەکەین))[(١)].

گەشبینی و ڕەشبینی هەریەکێکیان بەقەبارە و پانتایی و ئاستی کاریگەریان بەشدارن لە پێکهاتەی ژیانی هەموو شاعیرو نوسەر و هونەرمەندێکدا، بەڵام ئەوەی زیاتر بەدی دەکرێت لەنێو شاعیران و نوسەرانی ئێمەدا سیمای ڕەشبینییە نەك گەشبینی. ئەمەش زیاتر بۆ ئەو بارودۆخە ناهەموار و ڕەش و سەخت و دژوارە دەگەڕێتەوە، کە گەلەکەمانی تێدا دەژی، هەروەك ئەم دیاردەیەش لای شاعیران هێمن و محەمەدی نووری شتێکی زەقە.

ئەگەرچی گەشبینی لەشیعرەکانیاندا تاڕادەیەکی باش بەدی دەکرێت، بەڵام گەلێ جار بە ڕەهایی بەرچاو روون نین و تۆزی غەریبی و تەمومژی نائومێدی و ڕەشبینیان لەسەر لانەچووە.

گەشبینی و ڕەشبینیش لەشیعرەکانی هێمندا دیاردەیەکی ئاشکرا و ڕوونە، هەروەك لە ناونیشانی دیوان و شیعرەکانی دەردەکەوێت ((ئەو کۆمەڵە شیعرەی کە بە ناوی (تاریك و ڕوون)ەوەیە دەتوانین ئەو ناوك برینە بەو ناوەوە ، بە دانپێدانان و سەلماندنی کاك هێمن لەقەڵم بدەین، کە بەلای خۆشیەوە وەهایە کە بەشێك لە هۆنراوەکانی دڵتەنگ و تاریك بن و

(١) د. میترا (سیروس پرهام) ((ڕیالیزم و دژە ڕیالیزم لە ئەدەبیاتدا)) و: حمە کەریم عارف عارف، گ زمان، ژ ٣٧، ١٩٩٩ ل٤٤.

بەشەکەی تریان ڕووناکبین و دووربین و دڵفراوانن)) [1].بەڵام لەگەڵ ئەمانەشدا شاعیر جگە لە فراوانیی زۆری تەم و مژی ڕەشبینی ، ئەستێرەی گەشبینیش لەئاسمانی ژیانیدا بەدی دەکرێت، تەنانەت هێندێ جار لەوپەری گەشی و پرشنگداری و جوانیدا بووە و تیشکی ڕووناکی بەهەموو لایەکدا بڵاو کردۆتەوە. بەتایبەتی لەتافی لاویدا و لەو کاتانەی تەمەنی لە ترۆپکی جوانی و برەو و تین تاو هێزوگوڕی (ئیشق و ئازادی)دا بووە، زستان لە وادەی هەرەسهێنان و بەهاریش لە هەڕەتی جوانی ناسکی و تەڕو ڕازاوەییدا بووە مژدەی خێرو خۆشی و سەرکەوتنی بەگوێی ئاشقاندا چرپاندوە. هێمن ئەگەرچی بەشاعیری غەم و تەنیایی و نامۆیی ناسراوە، بەڵام لەشیعری گەشبینیدا باڵادەست بووە تا بڵێی شیعری جوان و بەرز و نەمر و پڕداهێنانی هەیە. تەنانەت لەم ڕۆژە ڕەشانەش دا کەغەم و مەینەت تەنگیان پێ هەڵچنیوە چرای هیوای ناکوژێتەوە بەبڕوایەکی بەهێز و پتەوەوە لە دیدێکی پڕ لە ئاسۆ و ڕوونەوە دەڕوانێتە ژیان و بەتایبەتی پاش ڕاپەرینی چەکداری خەباتی ئازادیخوازی گەلی کورد لەکوردستانی ڕۆژ هەلات(عەبدەلڕەحمان قاسملو) لەم بارەیەوە دەڵێ:- ((شیعرەکانی هێمن ئیتر بۆنی ناهومێدییان لێنایە، چەند ساڵە قۆناغێکی دی لەخەباتی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران دەستی پێکردووە، قۆناغێك کە جێی هیوای گەلی کورد، هەم لەپێکهێنانی هەم لە دەربڕینی ئەم هیوایەدا بەشدارە لە ((مەتەڕێزی شەرەف))، ((شەنگەبێری))، ((ئامێزی ژن))، ((ترۆپکی رزگاری))، ((شەپۆلی تۆڵە))، ((شەو و شەیتان))، ((گاو گەردوون))، ((کاروانی خەبات))لە ((دەستکەوتی خەبات))دا شیعری کۆمەلایەتی و شۆرشگێری چ لەبارەی ناوەرۆك و چ لەبارەی شێوەوە گەیاندۆتە پلەیەکی بەرزی ئەوتۆ کە کەمتر شاعیری کورد گەیشتوویەتیێ)) [2].

هێمن وەك لاوێکی خوێنگەرم و شاعیرێکی هەست ناسك و شۆرشگێر و خاوەن هەڵوێست، و ئازار و ئەشکەنجە و ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت دەردی زەمانە سەری پێ نەوی ناکەن و دەنگی پێ کپ ناکەن، بەڵکو بەپێچەوانەوە شاعیر دەنرکێنێ و دەنگ هەڵدەبڕێ و هاوار دەکا مەشخەلی ئازادی و خەبات بەرزدەکاتەوە. لە شیعری (ڕۆژی شادی)دا دەڵێ:-

---

(١) خالید دلێر، هێمن وهەژار دۆست و دژوار،سلیمانی،٢٠٠٣، ل١١٠.

(٢) هێمن، تاریك وروون، ل ی.

**جێژنی سـەربەستی و دەمــی ئازادییە**
**کاتی عەیش و نۆش و شایی و شادییە**
**بــەرگی ڕەش ئیتر لـــەبەرمان دادڕا**
**بــەندەکی دیلــی و ئەسارەت هەڵبڕا**
**سـەر بڵندین چـونکە وا ئـــاڵاکەمان**
**هــەڵـکراوە گەییە تەشقی ئـــاسمان**

(تاریك و ڕون ل ٦٨)

لێرەدا شاعیر ئازادی بەشێوەیەکی گەشبینی و وەك یەکێك لە بنەڕەتەکانی ڕۆمانسیزم لەچوارچێوەیەکی هونەریی جوان و بەرزدا بەکارهێناوە و، کە باس لە جەژن و سەربەستی ئەو خۆشی و شادی و شایی و هەڵپەرکێیەی گەلی کورد دەکات کە لە ئاماجی خەبات تێکۆشان شۆرشی میللەتەکەمان و دامەزراندنی کۆماری مەهاباد بەدەست هاتووە.

پاشان شاعیر هیوا و ئاواتەکانی بەرز دەبێتەوە گڕ و کڵپەی ئیشقی خاك و نیشتمانەکەی وەها دەگەشێتەوە و دانامرکێ وەك لەشیعری (ئاواتی بەرز) دا ئەم گەشبینییەی خۆیمان پیشاند دەدات و دەڵێ:-

**مــافی کورد هــەر دەبێ بستێندرێ**
**دوژمنی کورد تێگەیشتووە ناکرێ باشاری کورد**
**وا گـــزینگی دا بەیانی جوانی ئـازادیی بەشەر**
**ڕۆژی ڕووناکە، نەماوە زوڵمەتی شەوگاری کورد**

(تاریك و ڕوون ل ١٢٣)

هێمن گەرچی چۆتە نێو تەمەنەوە و جەستەی زامدار و ژاکاو و بێ بڕستە، بەڵام لەگیان و بیرو باوەڕدا هێشتا گەنجەو دووربین و بەگوڕ خۆڕاگر و بەتوانایە و ململانێ لەگەڵ چەرخی سپڵە و دوژمنانی گەل و نیشتمانەکەی دەکات و وەك سەربازێکی نەناسراو تێدەکۆشێ زۆر بەتوندی بەرهەڵستی دەسەلاتی زۆڵم و زۆرداری دەکات و، بەگژ کۆسپ و بەربەستەکانی کاروانی سەربەستیدا دەچێت و ورد و خاش و تەختیان دەکات تا بە ئاسانی بووکی ئازادی لەباوەش بگرێت و بەمەبەستی داخوازیەکانی شاد بێت وەك لە شیعری(ترۆپکی رزگاری) نەخشەیەکی جوان و دروست و ڕاستەقینەی گەشبینی ئازادیمان پێشان دەدا و دەڵێ:

**کـــــــەند و کۆسپ هـــەنگاوم پێ ناکاشل**
**بێنە ســــــــەرڕێم هەزاران گـا بەردی زل**
**بـــــــەهێزی شـــان و باهۆ پێی دەدەم تل**
**دەڕۆم بـــــــەرەو ئاسۆ، بـەرەو ئاسۆی ڕوون**
**دەڕۆم دەڕۆم تـــــــــا ترۆپکی رزگاربـوون**

(تاریك و ڕوون ل٢٢٠)

شاعیر ئاوڕ لەڕابردووی نەتەوەکەی دەداتەوە و شانازی بەمێژوو و کەلتور و داب و نەریت و بیرو باوەڕی میللەت و گەلەکەیەوە دەکات و پەند و عیبرەتیان لێ وەردەگرێ. وانەی خەبات و تێکۆشان و بەرگری و کۆڵنەدانیان لێوە فێر دەبێ ، بۆیە لێرەوە بەباوەڕێکی پتەوەوە مژدە دەداتە گەلەکەی و هەواڵی ئازادی و دڵنیایی بەگوێچکەی خانی و نالی و حاجی و شاعیرانی تر ڕادەگەیەنێ و، خۆشحاڵە بەو بناغە بەهێز و چەسپاوەی بۆ کوردیان داناوە.

بۆیە لەمەودوا هەرەسهێنان و توانەوە و بەزین و سەنگەر چۆڵکردن بە خەون و خەیاڵ دەزانێ و لە شیعری (دەسکەوتی خەبات) دەڵێ:

**بـــــەلاّم تـــۆ دڵنـــیابە پیری زانا**
**بـــناغێکی وەهات بــۆ کوردی دانا**
**ئیتر ســـەنگەر بەتاڵکردن مەحـــاڵە**
**ئیتر کورد و بەزین خەون و خەیـــاڵە**

(تاریك و روون ل ٢١٧)

جگە لە ئازادی، خۆشەویستیش بەبنەمای سەوزبوونی هەموو شیعرێکی رۆمانسیزمی دادەنرێت. شیعری خۆشەویستی بەشێکە لەخستنە ڕووی خود و پێشاندانی حەز و خواست و ویست تەوژمی سۆزو ئەندێشە. خۆشەویستی بابەتی سەرەکی شاعیرانی ڕۆمانسیزمە، لەهەمانکاتدا لانەیێکی ئارامیشە لەکاتی غەم و بێزاریدا. شاعیرانی ڕۆمانسیزم بەوپەڕی تێڕامان و کاریگەریەوە ئاوێتەی خۆشەویستی دەبن و، پێیان وایە هەر خۆشەویستیەك لەسەر بناغەیەکی ڕاست و دروست نەبێت، بێ نرخ و بەها و پووچەڵە. بۆیە بەچاوێکی پڕ ڕێز و خۆشەویستی و پیرۆزەوە تەماشای ئافرەت دەکەن و، ستایشی جوانی و خۆشەویستیان دەکەن

:- هۆگۆ دەڵێ:- ((ئەگەر گەردوون بێ خۆشەویستی بوو ئەوا ڕۆژ دەکوژێتەوە))[1].
خۆشەویستی چاوگەی بوونەو بەهارێکی هەمیشە ڕەنگین و دارستانێکی هەردەم سەوزو نەگۆڕاوە. تەمەنێکە تێپەر نابێت و کاتێکە بەسەر ناچێت. بورکانێکە لەهەست و سۆز و حەز و هەڵچوون، سنورێکە بێ کۆتایی. بۆیە ژیان بێ خۆشەویستی هیچ واتایەکی نییە، چونکە بنچینەی سروشت و ئەم گەردوونە پڕ نهێنییە خۆشەویستییە و هەموو شتەکان بەهۆی ئەوەوە دروست بوون. خۆشەویستی ڕووناکییە و هەموو جیهان دەگرێتەوە ئەو هێزەیە خۆر و زەوی و مانگ و ئەستێرەکان دەسووڕێنێ. دیارە لەدێر زەمانەوە خۆشەویستی هەر هەبووە و لەپێناویدا ڕووباری خوێن ڕژێنراوە. کێوی بێستوونیان هەڵکەندوە و سەدان و هەزاران بەم هۆیەوە تاکو ڕۆژی حەشر وێل و سەرگەردان بوونە و دەستیان داوەتە کەشکۆڵ و عەسا، و پاشان گۆڕغەریب بوون یان بەدەردی (ڕۆمیۆ جولێت) و (لەیلا و مەجنوون) و (مەم و زین) و هاوشێوەی ئەوان ڕۆیشتوون، کەم کەس هەیە تیری خۆشەویستی دڵی نەپێکابێ و جەرگی نەبڕیبێ و، دڵ و دەروون و هۆشی داگیر نەکردبێ. ئەو بەرهەمانەی کە خۆشەویستی هەوێنی دروستبوونیان بووە، بێ پایانە و بەژمار نایەت. سەرەتایی خۆشەویستی ڕۆمانسی لەفەرەنساوە پەلی هاویشت بۆ وڵاتانی تر، نووسەرێکی وەك (ڕۆسۆ) (شەریعە و قانون) بەکۆسپێك دەزانێ لە ڕێگای ژیانی ئاسایی و ئاسوودەیی و پێگەیشتنی دوو دڵدار و داوادەکات هەموو دڵدارەکان لەسەر نیزامی سروشت بگەن بەیەك — هەروەها ڕۆمانسی خۆشەویستی و یەزدان پێکەوە دەبەستێ)) [2]. جگە لەمەش نووسەری بەناوبانگ ((ئەلفرێد دی فینی)) بەشێوەیەکی ڕۆمانسیزمیانە بەخۆشەویستەکەی دەڵێ:- ((کاتێك لە نیگای خەونەکانت ڕادەمێنم، هەموو شتێکم لە دروستبوونییەوە خۆش دەوێ...... وەرە دەست بخەرە سەر دڵە تێکشکاوەکەم. هەرگیز لەگەڵ سروشت بەتەنیایی جێم مەهێڵە، دەزانم دەترسێم بەتەنیایی دەڕۆین جگە لە سێبەرەکانمان. هیچ شتێك لەسەر ئەم زەوییە نەگریس و سپڵەیە بەجێناهێڵین))[3].((ڤیکتۆر هیگۆ))یش دەربارەی خۆشەویستی ڕۆمانسیزمی دەڵێ :- ((مرۆڤ بوونەوەرێکە بە دووباڵی گەورە دەفڕێ یەکێکیان بیرە، ئەوەی تریان خۆشەویستی))[4].

---

(١) د. شفيق بقاعى، د. سامى هاشم،المدارس الانواع الادبيه،ل٧٠.

(٢) ئومێد ئاشنا،هەمان سەرچاوە ل٢٩٠.

(٣) د. محمد غنيمى هلال،هەمان سەرچاوە,ل ١٨٥-١٨٦.

(٤) هەمان سەرچاوە، ل ١٩٢.

کەواتە دەتوانم بڵێم شیعریش لە سیحری جوانی و هۆگری و خەندەی خۆشەویستیەوە، یان دابڕان و ناڵەی گریانەوە دروست دەبێ، (هێمن) دەڵێ:- ((شیعرم تەنیا بۆ دەربڕینی ئیحساسی خۆم داناوە)) [1]. ئەم بۆچوونەش تەواو لەگەڵ ئەم وتەیەی (هێردەر) یەك دەگرێتەوە کە دەڵێ:- ((شیعری ڕەسەن ئەوەیە کە دەربڕینی هەست بێ)) [2].

لەڕوانگەی شیعرە خۆشەویستیە پڕ لە گەشبینی و ڕەشبینییەکانییەوە لە جیهانبینی هێمن بگەین و بزانین خۆشەویستی چ پلە و پایەکی لە بیر و بۆ چوون و خەون و خەیاڵ و هەست و سۆزی ڕۆمانسیزمی ئەو داگیر کردوە. خۆشەویستی و گەشبینی لە شیعرە ئەوینییەکانی هێمندا لەئاستێکی بەرزدا تەنانەت بیر و سۆز و ئەندێشەی هەندێك لەو شیعرانەی گەشبینانە لە خۆشەویستی دەدوێت، گەیشتۆتە لوتکە، ئەمەش لە شیعرەکانی (ماچی خودایی و پەیامی ڕانەگەیەنراو، گۆمی خوێن، جۆلانە، پەری شیعر، شەنگەبێری، موونا پسێنم) هتد بە ئاشکرا دەردەکەوێت وەك لەشیعری (ماچی خودایی) دا دەڵێ:

**وەرە ئەی نەونەمـــــامی باخی ژینم !**
**وەرەئـــــەی شاگوڵی مێرگی ئەوینم !**
**وەرە کـاروانکوژەی کاتی بـــەیانیم !**
**وەرە بیرەوەری و ئـــــاواتی جوانیم !**
**وەرە ئـــەی بوت هەتاکو بتپەرستم !**
**وەرە مەمکۆڵەکەت بگرم لە مستم !**

(ناڵەی جودایی ل ٥٣-٥٤)

لێرەدا شاعیر بەوپەڕی دڵنیایی و هومێدەوە ڕوو دەکاتە یارەکەی، چاوەڕێی شادی و بەختەوەریی لێ دەکات، هیوا و ئاوات و خواست و حەز و ئارەزووەکانی لەناخی ئەودا دەدۆزێتەوە و، چەندەها وێنەی سادە و لێکدراو بەشێوەی لێکچواندن دەخاتە ڕوو، بۆیە دەبینین زۆریی ڕادەی بەهێزی خۆشەویستی یارەکەی وای لێدەکات کە بە چەندەهاو جۆرەها شتی جوان و بەرز و گرنگ بیچوێنێت و جێگایەکی بەرزی لەدڵ و دەروونی خۆیدا دابنێت.

هێمن پەپوولەی خۆشەویستی لەهیچ شوێنی ئارام ناگرێ و نانیشێتەوە، بەڵکو هەمیشە لە باڵە فرکێ دایە لەم چڵ بۆ ئەم چڵ و لەم گوڵ بۆ ئەم گوڵ دەفڕێ. تاوەکو بەمەرام دەگات

---

(١) د. شوکریە رسول، ئەدەبی کوردی وهونەرەکانی ئەدەب، ل ٢٣.

(٢) هێمن، تاریك وروون، ل٢٠.

شاعیر لەگەڵ ئەوەی نقومی دەریای پەرێشانی و چارەڕەشییە، کەچی هێشتا لە قووڵایی دڵیەوە بەئاواتی خاڵ و پەرچەمێکی ترەوە دەژی و هەتاوەکو دواهەناسە دەبێتە دێوانە و ڕێبواری ئەوین و سەربەستییە. هەرچەندە چرای ئومێدو بڕوای گەیشتن بەئامانجەکانی کز و لاوازە. بەلاّم هەردەم مەلی هیوای بڵند دەفڕێ، هەروەك لە شیعری (عیشق وئازادی)دا دەڵێ:-

**پـــەپوولـەی خۆشەویستیی من لە شوێنێ ناگرێ ئارام**
**دەنیشێ و باڵی دەبزێوێ لـــەسەر سینەو مەمێکی تر**
**هــــەزار هێندە پەرێشان و سیاچـــارە بژیم هێشتا**
**لـــەنێو دڵدا هەمـــە ئاواتی خاڵ و پـــەرچەمێکی تر**
**هـەتاکو دوا پشوو ڕێبواری ڕێگای عیـــشق و ئـازادیم**
**ئـــەگەر بێجگە لـــە ناکامیش نەبینم بەرهەمێکی تر**

(ناڵەی جودای ل ٦٠-٦١)

لێرەدا شاعیر تا سەر ئێسقان پابەندە بەو چوارچیوەی کە خۆشەیستیی ئافرەتی تێدا ئەخولێتەوە. زیرەکانە هەست و نەستی ئەویندارى خۆی چڕکردۆتەوە. توانیویەتی بە شێوازێکی جوان و ناسك و هونەریانە گوزارشت لە ناخی خۆی بکات و سەرکەوتووانە حەز و مەبەست و ئارەزووەکانی دەربڕێ و سەرنجی خوێنەر بۆ لای خۆی ڕابکێشێ.

چونکە شاعیر بە جوانترین شێوە پەیامەکەی خۆی ڕازاندۆتەوە بۆ ئەوەی پێشکەشی خۆشەویستەکەی یان پەیاموەرگری بکات، هێمن یەکێکە لەو شاعیرانەی لە ئەزموونی خۆشەویستیدا بێوێنەیە و لە گەلێك ڕووەوە جیاوازە لە شاعیرانی دی. چونکە شاعیر خۆشەویستی ئافرەت و نیشتمانی لە بۆتەیەکدا تواندۆتەوە و، ئاوێتەی یەکتری کردووە لە شیعری (شەنگە بێری)دا بڵێ:

**زۆری نەمـــــــاوە بێتەبەر نـــەمـــامی هـــەوڵ و خەباتم**
**لـــــــە داگیرکـــەر پاك بێتەوە، خـــاکـی پیرۆزی ولاّتـم**
**چـــــــەك دادەنێم، گۆچانەکـــەی جارانم هەڵدەگرمـــەوە**
**تۆ هەر بێری بە، من هەر شوان، فریشتەی تاسە و ئـــاواتم**

{ تاریك و ڕوون ل١٦٩ }

هێمن لە شیعری (شەنگە بێری)دا ئاوڕ لە ژیان و گوزەرانی لادێیەکانی کوردستان دەداتەوە بە کامێرای چاوەکانی، دیمەنە جوان و دڵڕفێنەکانی ژینی لادێمان بۆ دەکێشی و

دەگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو. باسی سالأنی کوێستانی کوردستانمان بۆ دەکات. ستایشی سروشتی بێگیان و گیاندارەکانی دەکا و، چەندەها وێنەی سەرنجڕاکێشمان پێشان دەدات، وەك شەنگەبێری بەر مەڕ و باسکی سپی مەڕ مەڕی کە لە نێوان مێگەلدا دێت و دەچێت و خەریکی مەڕدۆشینە لەگەڵ هاڕەی گۆبەرۆك و گوارە و کرمەك و بازن و ملوانکە، دڵی ئاشقان دەخورپێنێ و ڕای دەچەنێ یان بە چاوی ڕەش و کولمی گەش و ئالی و کەزی و بسکی و خاو و نەرمی بێبەزەییانە شوانی شێت و شەیدا دەکرد و لە ناخیەوە لە خاچی دەدا.

شاعیر لێرەدا لەگەڵ شەنگەبێری دەکەوێتە گفتوگۆ و ڕازو نیاز دەگۆڕێتەوە. هەست و نەستی پڕ سۆز و ئەوینی خۆی دەردەبڕێ.

لێرەدا شاعیر دووربینانە و گەشبینانە دەڕوانێتە ژیان و لەوە دلنیایە کە زۆی نەماوە بە هیوا و ئامانجەکانی بگات، بەهاری ئازادی بێت و نەمامی هەوڵ و خەباتی بەر بگرێت. خاکی پیرۆزی نیشتمانی کوردستانیش لە دڕك و دالی دوژمنان پاك بێتەوە پاشان بەوپەڕی سەربەرزی و شادیەوە چەکەکەی هەڵپەسیرێ. دیسان ببێتەوە شوان و گۆچانەکەی جارانی هەڵبگرێتەوە ئەویش ببێتەوە بێری و بۆ مەڕ دۆشین بەرەو نێو مێگەلی مەڕی بگەڕێتەوە.

شەو لای شاعیرانی ڕۆمانسیزم پیرۆز و خۆشەویستە لەبەر ئەوەی شەو ئێش و ئازار و غەمەکانیان لە ئامێزی خۆی دەشارێتەوە نهێنییەکان دەپارێزێ و سەبووری و ئارامی بەدڵ و دەروونیان دەبەخشێ. دەبێتە پۆشاکی هەژار و ڕووت و ڕەجاڵ بێ دەرەتانان و بۆ ئاشق و دڵدارانیش پەنا و پەسێوە و، حەشارگەیەکی هێمنە، بۆیە شاعیرانی ڕۆمانسیزم و بەڕادەیەکی زۆر باسی شەو دەکەن و لە نێو شیعرەکانیان ڕەنگی داوەتەوە، هەروەك سیمای ئێوارانیش کاریان لێ کردوون بەتایبەتی لە پایزدا. ((بۆیە ئومێدی و نائومێدی هێمن لەگەڵ شەودا زیاتر ئولفەت دەگرن و هۆگری دەبن و لەگەڵیانا دەروونی دەحەسێتەوە، کاتێ باسی شەومان بۆ دەکا، مەبەستی تەنیا کە وشەی (شەو) وەکو زاراوەیەك نییە، بەڵکو شەو لای هێمن و شاعیرانی ترمان زۆر پیرۆزە و شەو لە لای هێمن چەندەها جۆرە ڕەنگدانەوەی هەیە. ئەوەشیان دەکەوێتە سەر باری دەروونیی شاعیر))[١].

هێمنی شاعیر لە شیعری گریانی (نیوە شەو) بەو شێوەیە باسی شەومان بۆ دەکات و دەڵێ:

**شەوانە گــەر نـــەکەم ئەو شیوەن و نالین و گـــریانە**

**دەسووتێنی وجـــودم ئـــاگری ئەم جەرگـــە بریانـــە**

---

(١) محەمەد ئەمین ئەحمەد، هێمن و سکالا، گۆڤاری بەیان، ژ ٥١، ١٩٧٩، ل٢٦.

**بەڵێ گریانی نیوەی شەو دەکا ناسۆری دڵ مەرهەم**

**کوڵ وکۆم دادەمرکێنێ و بەجێ دێڵێ دڵی من خەم**

{ تاریك و ڕوون ل١١٦ }

لێرەدا شاعیر کاتێك غەم و مەینەت بەرۆکی دەگرن و، دەردەسەری و بێزاری ئۆقرەی لێ دەبڕن، پەنا دەباتە بەر گریانی نیوە شەو بۆ ئەوەی بەهۆی گریانەوە کڵ و کۆی دامرکێ و گڕ و بڵێسەی ئاگری دڵ و دەروونی بکوژێتەوە، لە دۆزەخی ناهەمواریدا ڕزگاری بێت. بۆیە خەو ناچێتە چاوی و دەبێتە شەوارەی شەوان و وەك دێوانە وێڵی دەشت و بیابان دەبێ تا لەوێدا بەسەربەستی لەگەڵ ئێش و ئازارەکانی سەر پێکەوە بنێ و لە شەوێکی پایزیدا بە کۆمەڵێك خەون و خەیاڵی چڕەوە شەونخوونی بکێشێ. هەروەك شاعیر لەشیعری (ئێوارەی پایز) لە وێنەیەکی هونەریی جوان و بەرزدا و بە ئاوازی مۆسیقایەکی خۆش و زمانێکی سادە و تەڕ و پاراوەوە دیمەنی شەومان وەك یەکێك لە شەنگەستەکانی ڕۆمانسیزم پێشان دەدات و دەڵێ:

**ئاخ دیسان چوومە ژێر بــــاڵی**

**ڕەشـــــی شەوگاری تـــەنیایی!**

**ئـــــاخ دەبـێ دیســـان بچێژم**

**ژەهـــراوی تـــــاڵی جــودایــی**

{ ناڵەی جودایی ل٤٢ }

شەو و تەنیایی سیمایەکی ڕەشبینی شاعیرانی ڕۆمانسیزمە و، ئەوان لە دەمی زەردی ئێوارانەوە، تاکو ئەو دەمانەی شەو دەگاتە کاتی نیوە شەو و ئەستێرەکان لە تاقی ئاسمانەوە بەبێدەنگی دەدرەوشێنەوە، ئێشك دەگرن و شنەی شەوبای مەستی و بێداری هەڵدەمژن. دەکەونە خەیاڵێکی پەشێو و ئاڵۆزەوە، کەس نازانێ لە شەودا چیان بەسەر دێ و تاریکیی شەو چیان لێ دەکا. بۆیە لەگەڵ شەودا دادەنیشن و ڕازی خۆیان بۆ یەکتر هەڵدەڕێژن، چونکە ئەوان جگە لە فرمێسکی شەوان هیچ هاودەمی دیکەیان نییە. بۆیە بۆ ئەوەی بێکەس و بێ هاودەم و تەنیا نەبن. قوولپی گریانی نیوە شەو هەڵدەڕێژن و فرمێسکی غەم دەبارێنن. لە دووریی یاران و خۆشەویستان و ئازیزان، ئەوانەی بەدەستی ستەمکاران و داگیرکەر و زۆردارانەوە پەریوە کراون، ئەمەش وا لە شاعیر دەکات کە قین و ڕقی لە ستەم و ئازار ببێتەوە. وەك لە شیعری (شەوگاری تەنیایی)دا دەڵێ:

**هەتا نـــێڵەی نەیە ئاورگی دڵ چەم پڕ لە نەم نابێ**
**هەتا نـــەم دانەبارێ تینی ئەو ئاورگە کـــەم نابـــێ**
**لــــە ناو ئاورینگ و ئاونگا شەوم ڕادەبرێ بێ هاودەم**
**بـــەڵێ شەوگاری تەنیایی بەبێ فرمێسك و خەم نـابێ**
**ســـتەمکاری منی دوورخستەوە لـەو یـــارە شیرینەم**
**ئیتر مـــن چۆن ڕقـی زۆرم لــــە ئازار و ستەم نـابێ؟**

{تاریك و ڕوون ل٢١٨}

ڕەشبینی بەتەواوی پێچەوانەی گەشبینییە و، داماڵین و ڕووتبوونەوەی مرۆڤە لە هەموو ئەو خواست و خۆزگە و حەز و ئارەز و و خولیا و هیوا و ئاواتانەی کە لە کاتی گەشبینیدا هەیەتی. ڕەشبینی ڕەشەبا و گەردەلوول و زریانێکی لەناکاو و بێ کات و ساتە، لە دەرگای هەموو ماڵێك دەدا و خۆی بە ناخی هەموو کەسێکدادەکات. بەبێ ئەوەی بەزەیی بە کەسدا بێت و دڵی بەکەس بسووتێ، بەتایبەتی کەسانی ڕۆمانسیزم. ئەوانەی کە وێڵ و سەرگەردان و ئاوارە و دەربەدەر و بەدبەخت و چارەڕەش و داماو و قوڕبەسەر و تەنیا و بێکەس و گۆشەگیر و نامۆن. یان لە دەریای ئیشقێکی ناکامدا مەلە دەکەن و جەستەیەکی لاواز و بێهێز و گیان و دڵێکی ناسك و شکاو و غەمناکیان هەیە و لە خەونی یەکجار فراوان و گەورەدا دەژین و خاوەنی ئەندێشەیەکی بێ سنووریشن.

ئەوەی لێرەدا جێگای ئاماژەپێکردنە هەموو مرۆڤێك لە کاتی خۆشی و شادیەکاندا ناخۆشیەکانی لەبیر ناچێتەوە. دەترسێ ڕۆژێك لە ڕۆژان توشی ببێتەوە بەڵام لەکاتی ناخۆشیەکاندا هەرگیز ڕۆژە خۆش و شادو بەختەوەر و ئارامەکانی خۆی بەبیر نایەتەوە. بە هیچ شێوەیەك ئاوڕی لێ ناداتەوە و بەلایەوە ناچێ. هەروەك ئەوەی قەت نەی دیتبێ و نەیناسیبێ. ئەمەش وای لە مرۆڤ کردووە کە زیاتر لەگەڵ ئێش و ئازار و ناخۆشیەکانی ڕەشبینی بژین و فرمێسك و گریان و ماتەمی خۆیان بۆ هەڵبڕێژن، دووچاری ئەشکەنجەی دەروونی بن لە زۆر کاتدا بەکەسایەتیەکی لاواز و کورتبین و تەسکبین بمێنێتەوە. بێ گومان ڕەشبینی کەم تا زۆر بەپێی باری کەسەکان و ژینگە و بارودۆخ و ئەو ڕەوشەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕامیاری و ئایینی و مرۆڤایەتی و کەلتووریەی کە تێیدا دەژی، دەگۆڕێت و جیاوازە. ڕەشبینی لای هەریەکە لە شاعیران هێمن و محەمەدی نووری دیاردەیەکی یەکجار زەق و بەرچاوە، سیمایەکی تایبەتی هەیە تەنانەت کەم شیعریان هەیە کە بەرگی ڕەشبینی و نائومێدی نەپۆشی بێ و فرمێسك بەچاوەکانییەوە نەبێ گەر هیچ نەبێ ئەوا تۆزی غوربەت و

نائومێدیان پێوە دیارە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو بارودۆخە ئاڵۆز و ناخۆش و ناهەموار و پڕ کارەساتەی نیشتمانەکەی تێدا دەژی ئەو نیشتمانەی گەلێکی زامدار و بێکەس و هەژار و چەوساوە و ستەملێکراوی بەخۆوە گرتووە. برینەکانی بەردەوام دەکولێتەوە و سارێژ نابێ و هەر خوێنی لێ دەتکێتەوە. شاعیرێکی وەك هێمن کە لە نێو ئێش و ئازار و غەم و مەینەت و ناخۆشی دا بە دیلیەتی لە دایك بووبێ دەبێ چ جۆرە شیعرێك لە کانیاوی دڵ و دەروونە پڕ هەست و سۆز و سووتاوەکەیەوە هەڵقوڵێ. بەکام وشەی بێ ناز و غەریب داڕێژرێ دەبێ چۆن بتوانێ شیعرێك بڵێ بۆنی نامۆیی و بێنەوایی لێ نەیە و ڕەنگی ڕەشی نەپۆشیبێ. لەم بارەیەوە شاعیر دەڵێ: ((من ژیانێکی سەخت و پڕ کوێرەوەریم ڕابواردووە، بیرەوەری خۆش و شیرینم کەمن)) [1]. دیارە شاعیرێك کە زۆربەی ژیانی سەخت و دەردەسەری و کوێرەوەری بێت دەبێ چۆن گوزارشت لە خودی خۆی بکات. چ جۆرە شیعرێك لە دایك بێ. بەتایبەتی شاعیرێکی وەك هێمن کە درۆ لەگەڵ ئیحساس و هەست و نەستی خۆی ناکات و دەڵێت: ((بەلای من شیعر کوڵ و کۆو هەستی دەروونی ئینسانێکە لە هەریەك لە حیسەکانی ئینسانییەوە. یان من چ لەحاڵەتی شادیدا دەربڕینی ئەم هەستە دەبێتە شیعر. چ لە حاڵی ناخۆشیدا. کە بەداخەوە من بە شاعیری غەم مەشهوورم، چونکە ژیانیشم هەر سەرتاسەر پڕ بووە لە غەم و داخ و ئەویش هەر ئیلهامم لە نەتەوەکەم وەرگرتووە، چ بکەم؟! وەختێکی من شاعیری نەتەوەیەکی بووم کە هەمووی بۆ خۆی خەم و داخە، منیش هەر غەم و داخم دیووە لەبەروەی شیعرەکانم هەموو بۆنی غەمیان لێ دێ)) [1].

بەڵێ وەك دەردەکەوێ شاعیر لە نێو گەلێکدا چاوی هەڵهێناوە و ژیاوە، دوورگەیەك بووە لە غەم وستەم. بۆیە ئەمەش لەسەر دەروون و شیعرەکانی ڕەنگی داوەتەوە بەشێوەیەك کە نەی توانیوە خۆی لێ دەرباز بکات. بۆیە ئەم دیاردەیە وەك مۆرکێك بەڕووی شیعرەکانییەوە دیارە. هەروەك شاعیر لە شیعری ((پەری ئازادی)) جەخت لەسەر ئەم ڕاستیە دەکاتەوە و دەڵێ:

**شـــینم گـــەلێك گێڕا شادیم کـــــــەم دیوە**
**خـــــــــۆشی دەڵێن هەیە بەلاَم نـــــەم دیوە**
**هــــــەڵوەدا بووم لــــــە دووی پەریی ئــازادی**
**تـــــووشی نەبووم نە لـــــەو دیوو نە لەم دیوە**

{ تاریك و ڕوون ل٢٣٠ }

(١) هێمن، دڵی شاعیر، کۆکردنەوەی ئەسعەد عەدۆ، بەغدا، چاپخانەی عەلاء ١٩٨٠، ل٣٨.
(٢) هێمن، چەپکێ گوڵ و چەپکێ نێرگز، ل ١١٥.

شاعیر لەو کاتەوەی ڕەش و سپی و سارد و گەرمیی لێك جیاکردۆتەوە لە غەمی میللەت و گەل و نەتەوەکەی دا بووە. لەو پێناوەدا لە خەبات و تێکۆشانێکی سەخت و ئاڵۆز دا بووە. لەگەڵ دەسەڵاتی داگیرکەران و زەبرو زەنگی ڕۆژگاردا لە ململانێدا بووە، بۆ تەنیا ساتێکیش وچانی نەداوە، خۆی لە کێشەکانی نیشتمانی و نەتەوەیی و مرۆڤایەتیدا کەنارگیر نەکردووە، هەرگیز نەی ویستووە خۆپەرستانە و هەڵپەرستانە بژی و پەسەندی ژیانی سەر شۆڕی و ژێردەستی نەکردووە. بۆیە تەمەنی پڕ بووە لە شین و گریان و ناڵە ناڵ و پرسە و ماتەم و نائومێدی. بەدەگمەن ڕۆژانی خۆشی و شادی و ئاسوودەیی بینیوە، بەڵام وێڕای ئەمانەش شاعیر عەوداڵ و گرفتار و ڕێبواری شەو ڕۆی بەدەستهێنان و گەیشتن بە بووکی ئازادی بووە. بەڵام بۆ بەدبەختی و چارەڕەشی بەڕێکەوتیش لە هیچ جێگایەك، نە لە کوردستانی ڕۆژهەڵات نە لە کوردستانی باشوور تووشی نەبووە و بە هیواکانی شاد نەبووە. شاعیر کاتێك ئاوڕ لە ژیانی میللەتەکەی دەداتەوە لە گرتن و کوشتن و بڕین و ڕاونان و هەژاری و کولەمەرگی و زۆرلێکردن و چەوسانەوە چیتر نابینێت و تروسکاییەکی هیوا بەدی ناکات. چونکە دەزانێ شەمشەمە کوێرەکانی تاریکی کۆرن و (شەلم کوێرم ناپارێزم) کەوتوونەتە جەستەی میللەتەکەی، وشك و تەڕ بەیەکەوە دەسووتێنن. ئەمەش وا لە شاعیر دەکات تەسکبینانە بڕوانێتە ژیان و بڕوای کز و لاواز بێت، بەرەو کۆڕی پرسە و ماتەم و شین بچێت و، لەوێ کۆچ و باری بخات هەروەك شاعیر لە شیعری (ڕۆژگاری ڕەش) بەم شێوەیە هەست و نەستی ڕۆمانسیزمیانەی خۆی دەردەبڕێ و دەڵێ:

**ئـــــەوساڵ جێژنەمان تاڵە**
**دوژمنی زاڵـــــم زاڵـــــە**
**لاو جێیان ســـــــیا چاڵە**
**دەســـــــتی دۆیان بــەتاڵە**
**گــاڵتە و گـەپ و پێکەنین**
**شـــــەو داوەت و هەڵپەڕین**
**جێـــگای خۆیاندا بــە شین**
**دیســـان خەمیـان دابەشین**

{ تاریك و ڕوون ل١٥٣ - ١٥٤ }

شاعیر کەش و هەوای ئەو ساڵە و ئەو ساتەی تاریك دێتە بەرچاو جگە لە تفت و تاڵی هیچ خۆشی و شیرینی تیا نابینێ. کە دوژمنی زۆردار بەسەریاندا چەسپاندویەتی. بەمەش

لاوان ئالۆدەی چاڵ و ئەشکەوت بۆتن لەیار و خۆشەویستانیان دوور خراونەتەوە. جەژن و شادی هەڵپەرکێیان لێ بۆتە شین و گریان و ماتەم و پرسە.

خۆشەویستی لای هێمن هەناسەیە، خۆراکە، ئاوە، ترپەی دڵە، بوونە، ژیانە، شاعیر زیاتر لە هەموو ئاشقانی تر سەری گەرمە و زیاتر لە هەموو ئاشقانی تر بریندار و گرفتاری خۆشەویستی بووە. جوانی ئافرەت دڵ و جەرگی پێکاوە و مەست و شێت و شەیدای کردووە. هەروەك لە شیعری (یادگاری شیرین)دا چەند وێنەیەکی ئەزموونی ژیانی خۆی لە دڵداریەکی **ناکامدا دەخاتە ڕوو دەڵێ:**

**زامی جەرگی من بە فەرموودەی گراوی سواری کــــورد**
**مەڵهەمی هەر ژەنگی گـــــوارە و ئـــارەقی بـــەر گەردنە**
**ئارەزوومە هیچ نەبێ جـــارێکی ماچ کـــــەم زاری تـــۆ**
**ئـــارەزووی مــــن چووکە، ئەمما تــــا بفەرمووی شیرینە**
**دڵ بەگرمــــەی تۆپی گەورەی دوژمنیش ڕانەچڵەکــــێ**
**دادەخورپێ ئــــــەم دڵــــە ئەمما بە خــرمەی بــــــازنــە**

{ تاریك و ڕوون ل٦٩ }

لێرەدا شاعیر کاتێك بەتیری خۆشەویستی زامدار بووە چاوەڕێی ژەنگی گوارە و عارەقی گەردەنی یارەکەیەتی. بۆ ئەوەی بیکاتە مەرهەم سارێژی زامە سەختەکەی پێ بکات، چونکە باشدەزانێ هیچ هێزێك ناتوانێت کاری تێبکات. تەنانەت گرمەی تۆپی دوژمنانیش بەقەدەر خرینگە و خرمەی بازنی دەستی یارەکەی، ڕای ناچڵەکێنێ و دڵی داناخورپێنێ. بۆیە هەر چاوەڕێی سۆز و بەزەیی خۆشەویستەکەیەتی ئەگەر ببێتە ((ئاوی حەیات)) و ژیانی پێ ببەخشێتەوە ((هێمن وەك بولبولێکی سەرگەرم و خولیای بەستەی بەسۆز و شیعری شۆڕەشوانی بۆ نەتەوەی زۆرلێکراوی کورد بۆ کوردستانی جوان و پێشێلکراو، بۆ خەباتی نەتەوایەتی و سروشتی و جوانی و ژن و ئەڤین و بۆ ژیانی دەربەدەری و ئاوارەیی و بۆ هێلانەی شێواو و تێکدراوی میللەتی کورد، خوێندوویە و هۆنویەتیەوە)) [(١)].

---

(١) کەریم حیسامی، شاعیری ناوداری کورد هێمن، گۆڤاری پەیڤ، ساڵی یەکەم، ژ ٢، مەڵبەندی ڕۆشنبیری کورد، لەندەن، ١٩٨٦، ل١٣٥.

شاعیر خۆشەویستی ئافرەت و نیشتمانی لە بۆتەیەکدا تواندۆتەوە. تا ڕادەیەکی زۆر هاوتەریبن و لەگەڵ یەکتری لە پێشبڕکێدان، ئەمەش خەسڵەتێکی شیعری هێمنە و لە زۆربەی شیعرەکانیدا ئەم تایبەتمەندییە وەك سیمایەکی دیار و بەرچاو دەردەکەوێ. بۆیە زۆربەی کات شیعرەکانی زیاتر لە واتاو خۆشەویستیەك لە ئامێز دەگرن. هێمنی ئەویندار و جوان پەرست کاتێك دەبینێ کە یار و دۆست و عاشقانی وەك ئاردی ناو دڕکیان لێ هاتووە و هەریەکە پەڕیوەی لایەکن. ئیتر خۆی دەچوێنێ بە (وەلی دێوانە)،بەلاّم پەری خان ئاگای لە دەربەدەرییەکەی ئەو نییە، بەغەم و ئازارەکانی نازانێ تاکو پێیدا هەڵبڵێ و بەند و باوی لەسەر دانێ هەروەك لە (ناڵەی جودایی)دا دەڵێ:

**کـــــوا پەریخان بەند و بـــــاوم بۆ بلّێ ؟!**
**بـــۆ نەسووتێم نەبمە پۆلوی ســــەر کلّێ؟!**
**ئـــــەو لەزۆزان من لــە ئـــارانی دەژیـم**
**کــێ دەڵێ ئەمنیش (وەلی دێوانە) نیم؟!**

{ ناڵەی جودایی ل٣٠ }

ولاّتی خۆشەویستی هێمن بێ سنور و ماڵەکەی بێ دەرگا و پەنجەرە، هەمیشە والاّبووە بۆ ئەوەی سروەبای خۆشەویستی پێدا بچێتە ژوورەوە، (من) لای ئەو منێکی لاواز و بێ دەسەلاّت و هەژار و دەستکورتەو چاوەڕێی خێر و ڕەحم و سۆز و بەزەیی یارەکەیەتی، بۆ ئەوەی سلاّوێکی لێ بکات و بەسەری بکاتەوە و چاکەی لەگەڵدا بکات جارێکی تر تەزوویەکی گەرمی هیواو ژیان بەگیان و جەستەی بداتەوە، بەلاّم بۆ بەدبەختی و چارەڕەشی ئەو تیغی بێ مەیلی جەور و جەفای یاری شیرین و نازەنینەکەی جەرگی لەت لەت دەکات، سینەی دەئەنجنێ و ئاگری لە دڵ و دەروونی بەردەدات، بە شێوەیەکی هەوڵی کوشتنی دەدات، بۆیە شەش خانەی ئومێدی لێ دەگیرێ. هەرچەند بە ئومێدی ژیانێکی خۆشی و بەختەوەر و بردنەوە مۆرە هەڵداوێ، کەچی هەوڵەکانی دەبێتە بڵقی سەر ئاو بەفیڕۆ دەڕوات، بۆیە شاعیر گەلێك نائومێد دەبێت و خەمی هێندە زۆر دەبێت کە ئەگەر بەسەر خەڵکی شارەکەی دابەش بکات ئەوا زەردەخەنە لەسەر لێوانی کەس نامێنێتەوە و نابیندرێ. هەروەك لە شیعری (فرمێسکی گەش) دا دەڵێ:

**تیغی بـــێ مەیلی و جەفای ئـــەو نازەنینە دڵــرەقە**
**جـــــەرگی لـــەت کردم بە جارێك ئەنجنیوە سینەشم**

**کـوشتمی و شەش خانی ئومێدی لەمن گرتن حەریف**
**مۆرە هـــەڵداوێم و بێهودە بـــە هیوای دووشەشـــم**
**نـــابینی زەردە لـەسەر لێوی کـــەسێ لـــەم شارەدا**
**گـــەر خەم و دەردی دڵی خۆمیان بەسەردا دابـــەشم**

{ تاریك و ڕوون ل ١١٥ }

شاعیر لەگەڵ ئەوەی مرۆڤێکی بەهێز و خۆڕاگر و بەتوانا و کۆڵنەدەر بووە و، هیچ کاتێك لە ناخۆشترین و دژوارترین و خراپترین ڕۆژگار و بارودۆخ دا ملکەچ نەبووە و ژێر دەستی و دیلیەتیی پەسند نەکردووە، نەبۆتە داشی دامە بەدەست ئەم و ئەو و گوێی نەداوەتە فەرمانی دەسەلاَت و زۆرداران و ئازایانە و بێباکانە ستەم و چەوسانەوەی ڕەت کردۆتەوە، بەلاَم کاتێك دەکەوێتە داوی خۆشەویستەکەیەوە بە ئاسانی دەگیرێ و بە دندووك پێوە دەبێ، دەستی شۆڕ دەکاتەوە و گرفتار دەبێت و بەبێ دەنگی سەری دادەنوێنێ. چونکە شاعیر دڵنیایە لەوەی کە تازە کارلەکار ترازاوە و لە پەلوپۆ کەوتووە و دەسەلاَتی ئەوەی نەماوە تاڵە موویەك بپسێنێ.

بۆیە لە شیعری (موو ناپسێنم)دا ئەوپەڕی نائومێدی و ناکامیی ئەویندارییی خۆی بە قالبێکی ڕۆمانسیانەدا پێشان دەدات و دەڵێ:

**ئەمن دەمگوت لـــە دنیا تـــا بمێنم**
**لـەبەر کەس ئەستەمە سەر دانوێنم**
**کـەچی ئێستا لـە داوی بسکی تۆدا**
**گرفتارم گـــــوڵم مـــوو نـــاپسێنم**

{ تاریك و ڕوون ل ١٢٩ }

پاشان شاعیر نامراد و ڕەنجەڕۆ خۆی دێتە پێش چاو، کاتێك دەبینێ شادی خۆی لێ شاردۆتەوە بە هەڵکەوتیش تووشی نابێت، لە کاتێکدا دڵی یەکجار تەنگ و بچووك بۆتەوە وەك زیندانێکی ئینفرادیی لێ هاتووە، لە خۆشەویستەکەی زیاتر جێی هیچ کەسێکی تری لێ نابێتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە شاعیر لە ئەزموونی خۆشەویستیدا پاك و بێگەرد و خاوێن بووە. ئەگەرچی لە ناخۆشی و ڕەشبینی بەو لاوە هیچ بەراتێکی خۆش و شیرینی لێ نەدیوە، وەك دەڵێ:

**ژیـانـم پـڕ لـــە ڕەنجە و نــــــامــرادی**
**بـــە هەڵکەوتیش نـەهـاتم تووشی شـادی**

**دڵم هێند تەنگە هەرجێی تۆ دەبێ و بەس**
**ئەتۆش مەحکوومـی حـەپسی ئینفرادی**

{ تاریك و ڕوون ل ١٢٩ }

بەڵام شاعیر ڕۆژانی ڕەش و شەوانی تاڵ و خامۆش گەر یارەکەی پێ خۆشتر و جوانتر بووە لەم ڕۆژ و شەوانەی کە لە یارەکەی دوور بووە. بۆیە هەردەم یادی دەکاتەوە بەیادی ئەوەوە شاد دەبێت، وەك لە هەمان شیعردا دەڵێ:

**ئەگەرچی ڕۆیی قەت ناچێ لە یـادم**
**دەکـەم یادت بە یادی تۆوە شـــادم**
**کە بارگەت بۆ هەوار تێك نا عەزیزم**
**شکا ئـەستوندەگی تـاوڵی مـرادم**

{ تاریك و ڕوون ل ١٢٩ }

گەشبینی و ڕەشبینی لە ژیانی محەمەدی نووریی شاعیردا وەك دوو دیاردەی دژیەکی ڕووناکی و تاریکی و سپی و ڕەش بە ئاسانی و زەقی بەدیار دەکەون، بەڵام ئەوەی جێگای ئاماژە پێکردنە لەبەر ئەوەی شاعیر لە ڕۆژگارێکی زۆر سەخت و دژوار و ناهەمواردا ژیاوە و چەرمەسەری و کوێرەوەریی زۆر چێشتووە و هەژاری و نەداری و دەستکورتی گەلێك دیووە، شەونخونی زۆری کێشاوە. گەشبینی لە چاو ڕەشبینی کەمتر دەردەکەوێ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ خراپیی ئەو بارە ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕامیارییەی کە لەپاڵ خراپیی باری دەروونیدا دەوری شاعیریان داوە. هەرچۆنێك بێت گەشبینی لە شیعرەکانی محەمەد نووریدا تا ڕادەیەك خۆی دەنوێنێ و لەگەڵ ڕەشبینی لە ململانێدایە و ئەم گەشبینییەش لەلای ئەو بابەتەکانی ئازادی و خۆشەویستی دەگرێتە خۆی.

گەشبینی و دووربینی و بەرچاو ڕوونی لە گەلێك شیعری محەمەدی نووریدا ڕەنگی داوەتەوە، هەروەك شاعیر لە شیعری(تیشکی سەربەستی)دا گەشبینیی خۆی پێشان دەدات و، بەرامبەر ئازادیی گەل و نیشتمانەکی لە چوارچێوەی هەست و نەستێکی ڕۆمانسیزمیدا دەڵێ:

**ڕۆژی بەدبەختی تـەواو بوو بـەختی نوێمان هـــاتەوە**
**تیشکی سـەربەستی وەدەر خست ها بەشاخ و زەردەوە**
**سەیری ئێستای خۆش نییە چون زۆر زووە سبحێنەکەی**
**خۆشـــی ڕوونی کـاتی چێشتانە بـــە کێو و هـــەردەوە**

{دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل ٢٤}

محەمەدی نووری شاعیر هەردەم ئاشقی سەربەستییە و حەز دەکا، وەك بولبولی سەرمەست بە ئازادی بخوێنێ و گۆرانیی خۆشەویستی و سەرفرازی بۆ گەل و نیشتمانەکەی بڵێ، نەفرەت لە دیلیەتی و ژیانی ناو قەفەز بکات، چونکە شاعیر گەلێك ژینی ترش و تاڵی لە ژێردەستی و دەربەدەریدا دیووە، نرخ و بایەخی ژیانی ئازادی دەزانی چەندە و، چییە و لێی تێدەگا، بۆیە لەگەڵ ئەهریمەنی شەڕ و تاریکی دەکەوێتە زۆرانبازغی ڕێگای سەخت و دژواری خەبات و تێکۆشانی گەر میللەتەکەی هەڵدەبژێرێ لەو پێناوەدا ئەرك و باجی زۆری داوە. ئازادی بەلای شاعیرەوە باشترین و پیرۆزترین ڕێگایە بۆ ڕزگاربوون لە بەدبەختی و ژێردەستی و هەژاری. هەروەك لە شیعری (دەکا پیرۆزی سەربەستی)دا بە بیرێکی بەرز و پتەوەوە و زمانێکی سادە و ساکار و تەڕ و پاراو بەشێوازێکی هونەریی جوان، بە کێش و مۆسیقایەکی پڕ ئاوازی ناسك و بەسۆز هەستی خۆی دەردەبڕێ و، وەك یەکی لە شەنگەستەکانی ڕۆمانسیزم بەگەشبینییەوە گوزارشت لە ئازادی دەکات و دەڵێ:

**ئەمن وەك بولبولی بەربوو لە تەنگانەی قەفەز ئەوڕۆ**
**دەڵێم پیرۆزە ســــەربەستی بەهەر دەشت و نزارێکـــی**
**دڵم ئـــازادی دەس غەم بوو بە ئـــازادی دەژیم ئەمڕۆ**
**ســـەرم سەربەرزە ئەوڕۆکـــە بەقەد بەرزی چنارێکـی**

{محەمەدی نووری، بستووی ژیان، ل٢٧ }

محەمەدی نووریی شاعیر لەگەڵ ستایشکردنی جیهانی پاك و بێگەردی ئەویندارییی خۆی و دەربڕینی هەست و نەستە پیرۆز و جوان و ناسکەکانی بەرامبەر بەو خۆشەیستیەی کە وەك ڕۆحی پەپوولە بۆکزی شەم مات و زیزە، دەناڵێنێ و کوڵی غەمی هەڵگرتووە و بەرەو هەوراز هەنگاو دەنێ و، شاعیر بەو پەڕی ورەبەرزیەوە دروشمی ئازادی و خۆشەویستی بەرز دەکاتەوە و ڕێگای پڕ مەترسی و بۆسەی ڕەش و ڕۆژگار دەگرێتە بەر و، سڵ لە هیچ هەڕەشەیەکی ترس و تۆقاندنی ناحەز و دوژمنان ناکاتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە پەیمان و بەڵێنی داوە هەنگاوەکانی توند و تیژ و بەهێز بکا و سات لە دوای سات لەسەر بەدیهێنانی خەون و خەیاڵە پیرۆزەکانی زیاتر سوور بێ و چاولێك نەنێ. تا ئەو کاتەی بووکی ئازادی لە باوەش دەگرێ. نەیار و دوژمنانیش نقوم دەبن و دەخنکێن. شاعیر هەموو ئەو وێنانەمان پێشان دەدات کە گوزارشت لە ڕادەی زۆری خۆشەویستی و گەورەیی و ئومێد و گەشبینی خۆیان بۆ دەکات. کە دەڵێ:

**هەرچەندی ڕێی هومێدم بەستەڵەك بێ**
**غەمی دنیا لەسەر شانم کەڵەك بێ**
**دەبێ هەنگاوی هیوام توند و تیژ کەم**
**نەیار با هەر لە دووم بکشێ یەدەك بێ**

{ محەمەدی نووری، بستووی ژیان، ل١١٩}

ڕەشبینی وەك تەقینەوەیەکی بەهێزی بوڕکانێکی گەورە لە زۆربەی شاعیرانی ڕۆمانسیزم بەدی دەکرێت. محەمەدی نووری شاعیریش بەدەر نییە لەو شاعیرە ڕۆمانسیزمیانەی کە تۆز و غوباری ڕەشبینی دای پۆشیوە و بەشێکی زۆری شیعرەکانی داگیر کردووە. لە شیعرەکانی شاعیردا هەریەکە لە گەشبینی و ڕەشبینی وەك یەکێك لە بنەماکانی ڕۆمانسیزم دەردەکەون کە ئاماژە بە هەڵوێستێکی شڵەژاو و بارێکی نائارام و پەشێوی دەکەن لە ڕووی هەست و سۆز و ئەندێشە و بیرکردنەوەی کە شاعیر تێیدا بووە، بۆیە دەبینین شاعیر لە نێوان بەردە ئاشی واقیع و خەیاڵ و ڕەشبینی و گەشبینی و خۆشی و ناخۆشیدا زۆر جار بە هەڵواسراوی ماوەتەوە. گەلێك جاریش بە پێی بارودۆخی دەروونی شاعیر و ئەو ڕۆژگارەی تێیدا ژیاوە، بەلایەك داکەوتووە. لە گۆڕانکاری و ئاڵوگۆڕدا بووە و ئەم دیو و ئەودیوی کردووە.

محەمەدی نووری وەك شاعیرێکی ڕۆمانسیزم، شیعرەکانی جارێك بە خۆزگە و هیوا و ئاوات و جارێکی تر بە پرسیاری کورت و خێرا و دیمەنی شڵە ژان و جووڵانەوە و تێکچوون و تراژیدی. کە زۆر سەرسووڕمان و تێڕامانی لێ دەکەوێتەوە و دەردەکەون. وەك لە شیعری(کوا لە ڕازی باز دەگا کوندێك، قەلێك؟)دا دەڵێ:

**کام هونەرمەند گەیوەتە ئاواتی خۆی؟**
**یان بە پێی ویستی گەڕا دەوران، چەلێك؟**
**هونەرمەند هاواری بەرزە و بێ هونەر**
**بێ هەرا بۆی دێتە پێش هاتێك هەلێك.**
**نەیچنیوە قەت گوڵی هیوا و هومێد**
**هەر لە لاقی ڕادەچێ چقڵێك، پەلێك**

{ محەمەدی نووری، بستووی ژیان، ل٥٩}

شاعیر لێرەدا کاتێ لە تەم و مژی ڕەشبیندا بیر دەکاتەوە زنجیرە پرسیارێکی کورت و خێرایی پڕ لە نائومێدی دەکات و دەڵێ: ئایا کام خەڵکی بەکەڵك و خێر و خێرخواز یان شاعیر و نوسەر و هونەرمەند گەیشتۆتە ئاواتی خۆی و، جارێك لە جاران چەرخی زەمانە بە ئاراستەی خواست و ویستەکانی ئەو سووڕاوەتەوە، لەگەڵ خۆزگە و هێواو ئاواتەکانی دۆست و کۆك بووە؟ لەگەڵ ئەوەشدا هونەرمەندان بە هاواری بڵندەوە داوای خواستەکانی خۆیان کردووە. وێرای ئەوەی نەیان توانیوە بە گوڵی هیوا و ئومێدەکانیان بگەن. بەڵکو بە پێچەوانەوە لە دڕك و داڵ بەولاوە هیچی تریان نەبینیوە. تەنانەت دەیان و سەدەهای وەك هەژار و هێمن و ئاوات، کە تەمەنی خۆیان وەك مۆم بۆ ئازادی و خۆشی و بەختەوەریی گەلەکەیان سووتان بە نامرادی سەریان نایەوە. یان وەك ئەو مەلەی کە لە ئێوارەوە تاکو کازێوەی بەیانی دەینالاند و بۆ ڕزگاری و ئاسودەیی و شیوەنی دەکرد، بەلاّم کووندەبوو قەلەکانی ولاّتی شووم و وێرانە، لە زمانی نەدەگەیشتن و گوێیان بە ڕاز و سکالاّی ئەو نادا. لەگەڵ ئەوەی ((کاك نووری هەرچی شیعری هەیە هەموویان هیوا بڕاوانەن، ئەمەش ئەگونجێ هەر لەبەر ژیانی ناساز و نەهاتی بێ، وا دەرئەکەوێ کە هەرگیز تینی هومێدێك لە دڵی کاك نوریا نەبووبێ)) [١]. هەروەك لە شیعری (زەمانە و زانا)دا خەم و پەژارە و نائومێدیی خۆی نیشان دەدا، بەرامبەر ئەو زەمانە بێ وەفا و سپڵەیەی کە لەگەڵ زانایان دڵڕەق و خراپ و نەبانە کە دەڵێ:

**کە زانا بام منیش وەك خەڵکی دیکە**
**خەتی سەربەستی ژینم پێ دەزانـــــی**
**قـولی ڕەش خواجەی سەر ســــەرایان**
**دەژین ئازا بـــە خۆشی و ســـامەڕانی**
**هەموو زۆرداری مێژوو بوونە داشدار**
**منیش وا چـــاو لـــە بەختی ئاسمانی**

{ محەمەدی نووری، بستووی ژیان، ل٦٧ }

شاعیر کاتێك گەردەلوولی زوڵم و زۆرداری و بێوەفای چەرخی بەدکار بەرەو بیابانی نائومێدی و غەم و ئازار ڕاپێچ دەکات، ئیتر گلەیی و گازندە لە خۆی دەکات و نارەزایی بەرامبەر هەست و نەستی خۆی دەردەبڕێ. کە نەی توانیوە ئەویش وەك خەڵك ڕێگای

---

(١) سوارەی ئێلخانی زادە، تاپۆ بوومە لێل، چاپییەکەم، چاپی سالمان، تاران، ١٣٧٩، ل ٣٢١.

سەربەستی و ئاسوودەیی بدۆزێتەوە و هەنگاوی سەرکەوتن و پێشکەوتنی ژیان بهاوێژێ. پاشان ئەوپەڕی پەست و بێزار دەبێت لەو گەردوونە بەد فەڕەی کە پێچەوانەی خواستەکانی دەسووڕێتەوە و خراپەکار و زۆرداران سەربەست دەکات و دەیانخاتە شادی و کامەڕانی و بەشی ئەویش دەبێت هەر ژێردەستی و بەدبەختی و چاوەڕوانی بێت.

محەمەدی نووریی شاعیر جگە لەوەی تاڕادەیەکی زۆر ڕەشبین بووە لە بەدیهێنانی ئازادی، بەهەمان شێوە لە بواری ئەوینداریش دا ئومێد کز و هیوابڕاو بووە. بەتایبەتی ئەو وەك تاکێکی ئەو کۆمەڵگایەی کە چوار دەوری بە دڕك و داڵ و زی چنراوە، دەیان دیوار و بەربەستی کۆمەلآیەتی و ئایینی و کەلتوریش پێشی تەنیوە و هەناسەیان لێ بڕیوە. بۆیە شاعیر خۆی وەك منداڵێکی هەتیوی جمۆکی بێکەس و بێدەر پێشان دەدات، کە لە ڕۆژی ڕەشدا دەژی و چاوەڕوانی خۆشەویستەکەیەتی کە دڵی پێ بسووتێ و بەزەیی پێدابێتەوە و، دەستی بگرێ و ئاوڕێکی لێ بداتەوە، وەك ئەو دڵۆپە فرمێسکانەی لە چاوانی دەکەونە خوارەوە لە باوەش بگری. یان بەهۆی چرپە و هەناسەیەکەوە گیانی زیندوو بکاتەوە و بیگەشێنێتەوە. چونکە شاعیر خۆشەویستەکەی بە هێما و سونبولی ژیانی خۆی دەزانێ، بۆیە حەز دەکا هەردەم لە باوەشی و یادەوەریەکانی بژیت. هەروەك لە شیعری لە (کوێ یادم کە) دەڵێ:

**بەیادم بـــڕۆ و بیگرە بـــاوەش بەتاو**

**لـــە گۆنەی سڕی پاکەوە ئەشك و ئاو**

**من ئەو دانە ئەشکەم لەنێو چاوی ویم**

**گوڵی ڕوومەتی سیس و ژاکـــاوی ویم**

**هەنـــاسەی سـڕی، سۆزی گیانی منە**

**نیشانێکی دەوری ژیـــــانی منـــە**

{ محەمەدی نووری، بستووی ژیان، ل١٧}

خۆشەویستی بە پێی ڕۆمانسیزم دەرخستنی ئەو نهێنیانەیە لە ناخی مرۆڤدا حەشار دراون محەمەدی نووری شاعیریش بەهەمان شێوە لەو ڕوانگەوە هەست و نەست و سۆزی خۆشەویستی خۆی بۆ دوڵبەرەکەی دەردەبڕێ. بۆ ئەو کەسەی ژیان و ئایندە و چارەنووس کەوتۆتە دەستی و بەتیری نیگا ئەفسوناویەکانی زامدار و ئەنگواوتە بووە و جەرگ و دڵ و هەناوی وەها کون کون بووە، بۆتە پالأوگەی خوێن و گیان و جەستە شەکەتەکەی، چاوەکانیشی بەردەوام دەگریێ و فرمێسك دەڕێژێ و باوەش لەو ئەژنۆ شکاوانە دەگرێ کە لە دووری خۆشەویستەکەی هێز و پڕستی لێ بڕاوە، بەڕادەیەك شاعیر هێندە بێزار و ڕەشبین و نائومێد دەبێ، بەرامبەر گەیشتنی بە

خۆشەویستەکەی لە پەل و پۆ دەکەوێت و دەستبەرداری ژیان دەبێت و تەنانەت دڵ و ئاینیشی لەسەر دادەنێت، لە ململانێی ژیان و ئەوینداری دۆڕاو و دەست بەتاڵ دەردەچێ. بۆیە بەڵێن دەدات هەروەکو مەجنوونی بێکەس ڕێگای دەشت و کێو بگرێتەبەر تاکو بە ئامانج دەگات وەك لە شیعری (تیری نیگا)دا دەڵێ:

**بەکـــام تیری نیگایەك ئـــەنگواوم**

**دەپاڵێوێ دڵۆپەی خـــوێن هەنـــاوم**

**لـــە ئامێزی غەمی دووریتی دەگـرم**

**هەتـــا باوەش دەبـــا ئەژنۆی شکاوم**

**ئەوا ڕۆیین بـــە دووی یەکدا دڵ و دین**

**ئەمن لــــەو نێوەدا پێچارە، مـــاوم**

{ محەمەدی نووری، بستووی ژیان، ل١٨ }

شاعر لەگەڵ ئەوەی لە ژیانیدا ترش و تاڵی و ساردی و گەرمی هەوراز و نشێوی زۆر دیوە. بەلاّم ئەمانە هیچیان وەك بێ مەیلی یارەکەی گورزی گورچك بڕیان لێ نەداوە و جەرگی لەت لەت نەکردووە و کاریگەریکی وەها بەهێزی نەبووە، قەت دەردی وا ناخۆشی نەدیووە و لە ناخەوە نەسوتاوە و زریانی غەم و ئەشکەنجەی وا بێ هاوتای بەسەر نەهاتووە. وەك لە شیعری (دەردی بێ دەرمان)دا شاعیر ئەوپەڕی ڕەشبینی و بێ ئومێدی خۆی پێشاندەدات و دەڵێ:

**زۆر تیری تـــــانووت جەرگی پێکاوم**

**مـــــەودای برینی ئـەو دیو ئەو دیوە**

**زۆر کـــــات لێم بۆتە سەر دڕی نەیار**

**ئـەو کــــــرو ڕیسەی بۆ خۆم تەنیوە**

**بەلاّم ئـەی نازدار فریشتەی جوانیم**

**هەســـتی بزۆزی هـۆی زیندەگانیم**

**بزەی هـــــــەتاوی سەر لە بەیانیم**

**هەمـــوو لەبیر چوو کاتێ کە ڕوانیم**

**وەك بێ مەیلی تـــۆ دەردم نەدیوە!**

**دڵ نـــەبرژیوە، غـــەم نـــەباریوە!**

{ محەمەدی نووری، بستووی ژیان، ل٣١ }

پاشان شاعیر گلەیی و گازندەی خۆی لە ڕۆژگاری ڕەش دەکات و کە هەر جارێ بە بیانوویەك و جۆرە ڕەنگێك ڕێگای لێ دەگرێت. غەم و دەرد و مەینەتی خۆی پێ دەڕێژێ. دەبێتە بەربەست لە پێش درووست بوونی تەلاری هیوا و ئومێدەکانی و ناهێڵێت بە مراز بگات، ئامانجەکانی دەکوژێت و لە گۆڕیان دەنێ هەروەك ڕەشبینانە هەستی خۆی دەردەبڕێ و دەڵێ:

**زەمــانە هـــەردەمەی ڕەنگــێ دەڕێـــژێ**

**هـــــــەرچەندی مەینەتە بەمنی دەچێژێ**

**هـومێدێکـــــی لـــە ژینا پێك نەهێنام**

**هـەزار هیوام بە ڕۆژێکـــــــــی دەنێژێ**

{ محەمەدی نووری، بستووی ژیان، ل١١٩ }

شاعیر جگە لەوەی ڕەشبین بووە بەرامبەر بەئازادی و ئاسوودەیی ژیان، لەهەمان کاتدا وەك هەموو شاعیرێکی تری سەر بەم ڕێبازە، شەوی خۆش ویستووە. دیمەنەکانی سروشتی گۆڕاو و غەمگین و ماتەمەکانی سەرنجی ڕاکێشاوە، چونکە گونجاو و هاوتەریب بووە لەگەڵ دەروونی تاریك و ڕەشی پەڕ غەم و مەینەت و بێ ڕوناکی و بێ هیوایان. ئەمانەش پەیوەندیان بە بیرکردنەوە و تێڕوانین و چارەنوسی خودی شاعیرەوە هەیە، وەکو لە شیعری (لەسەر بستووی ژیان)دا بەشێوەیەکی ڕۆمانسیزمی وەسفی خۆشی و جوانی و ئارامیی شەومان بۆ دەکات و هانای دەباتە بەر و دەڵێ:

**شەوی تاریك وەرە بکشێ بەسەرما**

**کـــە ئامێزت پەنای ڕۆژگارڕەشانە**

**وەکوو ژینە چـرای ئەستێرەکـــانت**

**کـە ڕووزەردیم لەبەر تالیع گەشانە** { محەمەدی نووری، بستووی ژیان، ل١٦ }

## ٣- گەڕانەوە بۆ ڕابردوو منداڵی:

گەڕانەوە بۆ ڕابردووی منداڵی وەك یەکێ لە شەنگەستە سەرەکیەکانی ڕۆمانسیزم ئاستێکی بەرزی لە شیعری شاعیرانی سەر بەم ڕێبازەدا هەیە، چونکە شاعیرانی ڕۆمانسیزم، هەر لە کۆنەوە بایەخیان دەدا بە یادگاریەکانی ڕابردوو و، گەڕانەوە بۆ تافی منداڵی و لاوێتی و چێژیان لە مێژوو و کەلتوری میللەتەکەیان وەردەگرت و، حەزیان بە دیمەنی گەردەلوول و زەردەپەڕی ئێواران و گەڵاڕێزانی پایز دەکرد. لەسەر گۆڕستانەکان و لە قەراغی شوێنە

کۆنەکان فرمێسکیان دەڕشت، چونکە لەو کاتانەدا ژیانی ڕابردووی باوك و باپیران و پیاوە مەزنەکانی گەلەکەیان دەهاتنەوە یاد، بۆیە دەبینین ((هەرکەسێ بێ کەلەپوور و یادگار بژی، شاعیر بێ ئەو شتانە ئۆقرەی نییە و لاوك بۆ ڕابردوو دەڵێ، ئێستای درێژەپێدانی ئەوسایە))[1]. هەریەکە لە هێمن و محەمەدی نووریی شاعیریش لە شیعرەکانیاندا ئاوڕی زۆریان لە ڕابردوو و ژیانی منداڵی داوەتەوە. بەوپەڕی تاسە و ئاواتەوە بۆ نێو باوەشی گەرم و ئاسوودەیی ئەو ڕۆژە ئارامانەی کە پڕ بەسەرهات و بیرەوەریی جوان و پیرۆزن دەگەڕێنەوە، چێژ و خۆشیان لێ وەردەگرن. ڕەنگە ئەمەش زیاتر پەیوەندیی بە قۆناغەکانی تەمەن و باری دەروونیی مرۆڤەوە هەبێت، چونکە هەموو مرۆڤێك سەرەتای تەمەنی کە قۆناغی منداڵییە، پڕە لە سادەیی و پاکی و بێگەردی و جوانی و بەرائەت. دواتریش کە دەچێتە قۆناغی هەرزەکاری وردە وردە بیرکردنەوە و ئەندێشەکانی فراوان دەبێت، غەم و مەینەت و ئێش و ئازارەکانی زیاد دەکات، لە گەڵ زیادبوون و گەشەسەندن و چالاکبوونی هێز و توانای جەستەیی و فیکریدا. دواتر لە قۆناغی پیریدا ڕۆژەکانی تەمەن وەکو پەڕەی گوڵ وردە وردە بەرەو کزبوون و فەوتان دەچێت. شاعیر دڵی بەهیچ شتێك ئارام نابێ و ناگەشێتەوە. جگە لە گەڕانەوە بۆ ڕابردوو ژیانی منداڵی و قۆناغی لاویەتی و ئەو ساڵانەی لەو پەڕی هێز و گوڕ و تین و تاوی چالاکیی جەستەیی و گیانی و فیکریدا بووە و گەشبینی و جوانی و ئاواتەکانیشی گەیشتووەتە لووتکە. لە ئەنجامی خوێندنەوەیەکی وردی شیعری ئەم شاعیرانەدا دەگەینە ئەو ڕاستیەی کە شیعرەکانی هێمن و محەمەد نوریش بەم قۆناغەدا تێپەڕبوون و ئەزموونەکانی شیعری خۆیان لەسەر بنیاد ناوە ((هێمن لەسەردەمی دانانی هۆنراوەکانی تاریك و ڕوون گەنج بووە، لەم دوایەدا کە هۆنراوەکانی ناڵەی جودایی داناوە، پیر بووە))[1]. بۆیە لە (تاریك و ڕوون)دا کۆمەڵە شیعرێکی یەکجار گەشبین و پڕ لە هیوای بەخۆوە گرتووە، بەلاّم لە (ناڵەی جودایی)دا کە لە تەمەنی پیری و لە دوا قۆناغی پەنجا ساڵی تەمەنیدا ووتوویەتی، هەرهەمووی ڕەشبینییە، کەمتر گەشبینی پێوە دیارە. وەك شیعرەکانی (مانگە شەو، ناڵەی جودایی، جوانی ڕەشپۆش، تاوانی بێ هێزی، ئێوارەی پایز، سازی ناساز)و گەلێکی تر. هێمنی شاعیر کاتێ غەم و مەینەت بەرۆکی دەگرن و جەورو ستەم و زۆرداری فشاری دەخەنە سەر یان

---

(١) محەمەد فەریق حەسەن، هەمان سەرچاوە، ل١١.

(٢) خالید دلێر، هێمن و هەژار دۆست و دژوار، ل١١٠.

بە پێچەوانەوە لار و لەنجەی شۆخ و شەنگی جوانان و بۆنی گوڵان هەستی دەبزوێنن. ئیتر هانا بۆ لاویەتی دەبات و ئاوڕ لە ڕابردوو دەداتەوە، بۆ ئەوەی گوزارشت لە کانیاوی هەست و سۆزی هەڵقوڵاوی ناخەوەی خۆی بکات. کەف و کوڵی پەنگخواردووی هەناوی خۆی بتەقێنێتەوە، بۆیە شاعیر لە شیعری (کوانێ؟)دا بەشێوەی چەند کورتە پرسیارێکی خێرا و لە چەند وێنەیەکی هونەریی جواندا و بە زمانێکی سادە و تەڕو پاراو و ناسك و بە ئاوازێکی پڕ جۆش و سەرنجڕاکێشەوە بەرەو ڕابردوو دەگەڕێتەوە و، ئاوڕ لەو کاتانە دەداتەوە، کە گەنج و بەهێز و چالاك بووە. بەگوڕو تینەوە دەستی کچۆڵانی گوشیوە و، یان بە پێیان بێ باکانە و ماندوونەناسانە گوند بە گوند بۆ جێژوان ڕۆیشتووە و بۆ ئەوەی بە دوڵبەرەکەی بگات. یان خۆزگە دەخوازێ بۆ ئەو کاتانەی کە چاوەکانی تەنیا جوانی و ناسکی دەبینی و مەلی بیر و خەیاڵیشی هەر بەرەو بەرزایی و لوتکە هەڵدەفڕی و دەڵێ:

**کوانێ ئەو پەنجەی کە توند دەگوشێ مەمکی توند؟**
**کوانێ ئەو پێیە کـە بۆ ژوانی دەچوو گونداو گوند؟**
**کوانێ ئـــەو چاوە کە هەر جوانی دەبینێ و چی دی**
**کوانێ ئەو بیرە کە هـــەڵدەفڕی بەرەو بەرزی دوند؟**

{ناڵەی جودایی ل٥٦ }

هەروەها شاعیر لە شیعری (دەستی تەزیو)دا غەم لەو دەستانەی ئێستا دەخوا کە چۆن ڕۆژگاری ملهوڕ و پیری، سیس و شەکەت و بێ هێزی کردووە، خستوویەتیە لەرزین، پێشی هەموو چالاکیەکی لێ گرتووە، ناهێڵن بە هیچ خۆشی و ڕاز و حەز و ئاواتێك بگات. لە هەمان کاتدا داخ بۆ ئەو ڕۆژانە دەخوات و بیرو خەیاڵی بۆ ئەو کاتانە دەگەڕێتەوە، کە دەستەکانی و گوڵ و گوڵزاری دەچنی دەیکردە دەستە و پێشکەش خۆشەویستانی دەکرد. یان ئەو دەستانەی یارەکەی لە ئامێز دەگرت، قەڵای زۆرداری و داگیرکەرانی پێ دەڕووخاند و دەڵێ:

**حەیفە ئەو دەستە کە گوڵزاری دەنەخشاند، بشکێ**
**حەیفە ئەو دەستە کــــە دڵداری دەگەوزاند، بشکێ**
**حەیفە دەستێ کـــــە بەلـەرزی و بەتەزیوی دیسان**
**دوژمنی ملهوڕی زۆرداری دەلــــەرزاند، بشـــکێ**

{ناڵەی جودایی ل٥٥ }

هێمنی ئاشق و جوان پەرست لەو کاتانەشدا کە چۆتە نێو تەمەنەوە، جەستەی سیس و شەکەت بووە، بەلاَم بەدلّ و گیان هەر لە دەمی لاویدایە و یادی ژوانی کوچە و کۆلاَن و بن سیلە و پەسێوی سەردەمی لاوێتی دەکاتەوە و حەز دەکات لەو کاتانەدا بمردایە نەك پیری بەچاوی خۆی ببینیّ. بۆیە ئەو ڕۆژانە دێنێتەوە بەرچاوی کە سەرچۆپی دەگرت و هاواری بۆ دۆی قۆلّ بە بازن و پەنجە نەخشین دەکرد وەك لە شیعری (فرمێسکی رونو)دا دەلّیّ:

**ژوانــی بن سیلە و پەسێوی لاوەتــی یــادی بەخێــر**
**بــۆ ئەوەی پیرانــە نەمرم یــادی دێرینــــم دەویّ**
**کوانیّ ئەو شەوگارە بیّ دەنگە لە ژوانگەی جیّ هەوار؟**
**کچ ڕەوەك بوو. من گوتم: هێـدی بە، حەجمینم دەویّ**
**کوانیّ ئەو ڕۆژەی کــە سەرچۆپیم دەگرت بانگم دەکرد**
**دۆم دەویّ، دۆی قـۆلّ بەبازن و پەنجە نەخشینم دەویّ؟**

{ دیوانی هێمن موکریانی ٣٤٦ }

شاعیر کاتێك بیر لە ڕابردوو دەکاتەوە و هەرِەتی لاویەتی دێتە خەونی، لە غەم و ئەشکەنجە و ئازاری دەروونی بەولاوە، هیچی تری لیّ بەدی ناکات، چونکە ئەو دەزانیّ کە تازە پیر و پەکەوتە بووە و خەون و خۆزگە بە جێژوانی لاویەتی بێسود و ئامانجە و لە تارمایی نائومێدی و سێبەری مەرگ و بێزاری چیتر لەدوای خۆی بەجیّ ناهێلّێت، وەك لە شیعری (بارگەی یاران)دا لە چوارچێوەیەکی ڕۆمانسیانە دەلّێت:

**ژوانـــی خۆشی هەرەتـــــــی لاوەتی دێتە خـــــەونم**
**کاتـــی ئاویلکە دەگەلّ زیندەخەوان من چ بــــــکەم؟**
**شــــەو هەتا ڕۆژیّ لــــەبەر ئێشی لـەشـــم نالّەم دیّ**
**دێتە گوێم دەنگی (گەلۆ) و (نیوە شەو)ان من چ بکەم؟**

{ دیوانی هێمن موکریانی ٣٥١ }

هێمن وەك شاعیرانی ڕۆمانسیزم زۆر ئاوڕ لە دواوە دەداتەوە و ڕابردوو لەبیر ناكات، دیمەنەكانی سەردەمی لاویەتیی خۆی وەك فیلمی سینەمایی دێتە پێش چاو و بەناخی بیرەوەریەكانیدا شۆڕ دەبێتەوە. وێنەكانی جێژوان دێنێتەوە گۆڕێ. یەك یەك تەماشایان دەكات و لێیان ورد دەبێتەوە. فرمێسكی نائومێدیان بەسەردا دەڕێژێ و لە شیعری (جێژوان)دا دەڵێ:

**ئەو چـــاوانەی سۆمایی لێ بـــــڕاوە**

**هێند لـە جـوانان داگیرا داگـــیراوە**

**ئەو لێوەی وا ئێستا باری گــــرتووە**

**كوڵمەی نەرم و نۆڵی یــــاری گرتووە**

**ئەو باهۆیەی زەمــــانە لێی بڕی هێز**

**كام كیژ جــوانە گرتوویەتە نێو ئامێز**

{ دیوانی هێمن موكریانی ل ٣٥٦ }

گەڕانەوە بۆ ڕابردوو و منداڵی لە شیعرەكانی محەمەدی نوریشدا وەكو تیشكی هەتاو وایە، لە كانیاوی هەست و سۆزی دا شەوق دەداتەوە. یان وەك ئەو كۆلكە زێڕینەی پاش بارانێكی زۆر بەوپەڕی جوانی و ڕازاوەیە ڕەنگدەدەنەوە و سەرنج ڕادەكێشن و هەست دەبزوێنن ((ژیان هەرچەندێك دوورودرێژ بێ و لێك بڕەوێتەوە، ناكرێ بیرەوەریەكانی دەورانی منداڵی لە كۆزەرەی ڕەنگا و ڕەنگی ژیاندا بەسەر نەكاتەوە و تاڵ و شیرینی كات و ساتە گوزەراوەكان نەخاتەوە بەر زەینی خۆی. دەورانی تێگەیشتن و پێگەیشتنی كاتی منداڵی، لە ئاسمانی خەیاڵ و هەولێدا هێندە ڕووناكە كە لە تەواوی تێپەڕی تەمەنیدا دیمەنەكانی هەر دەدرەوشێتەوە و گەشدارن، ئەو مەڵبەندەی تێدا گووراوە هیچ كاتێك لە خەیاڵیدا ناكوژێتەوە)) [1]. شاعیر پاشان دەڵێ: ((هەر ئەم هەست و خوستە بوو كە هۆنراوەی (یادێك لە زادگا) هەرەسی خستە نێو ڕەوان و دەروونمەوە و لە لێواری زار و زمانەوە سەرڕێژی كرد و شێلاگەی بەست و هەڵڕژا بە نێو مەزار و ویستگە ڕۆی تەمەنی پیریمەوە)) [1]. وەك لەم دەقەدا دەر دەكەوێت:-

**مـــــەڵبەندی ژیان جێی بیرەوەریم**

**ڕۆژگاری خۆشی بێ دەردە سەریم**

---

(١) دیوانی محەمەدی نوری، ل ١١١.

(٢) هەمان سەرچاوە، ل ١١١.

**بـــەهاری سەوزی شلکی و خاویم**
**هـــــەوارە بەرزەی دەورانی لاویم**
**ڕەوڕەوەی هەست و ژیانی دڵگیرم**
**وەك خەونی هاڵۆز دێتـــــەوە بیرم**

{ محەمەدی نووری، بستووی ژیان، ل١١١ }

پاشان شاعیر دوای تەمەنی حەفتا ساڵی و دوای ساڵانێکی دوور و درێژ لە جیابوونەوە و دابڕان و دووری بە خەیاڵ دەگەڕێتەوە، دێیە دڵگیر و بچکۆلانەکەی گلۆلان و لەوێدا پشوو دەدات و هەناسەیەکی پڕ شادی و ئارامی هەڵدەمژێ و بەنێو باخ و مێرگ و دار و درەخت و گولاڵە ڕەنگینەکان و چیمەنە هەمیشە سەوزەکانی یادگاریدا دەخولێتەوە. دڵی دەکەوێتە هەڵپەڕکێ و گیانی دەکەوێتە سەما و دەڵێ:

**دێـــی گلۆلان و لانکەی گـــــولان بوو**
**باغچۆڵە و مێرگ و ڕووگەی دڵان بوو**
**کـووچە و کۆلان و ڕێچکـەی منداڵیم**
**دەخزێنە زەینی دوا حـــەفتا ســــاڵیم**

{ محەمەدی نووری، بستووی ژیان، ل١١١ }

محەمەدی نووری شاعیر ساتەکانی تەمەنی گەنجی و جحێڵی دێتەوە یاد کە قەفەکانی بڕبڕەی پشتی بەهۆی پیری و غەمی دنیاوە وەك گۆچان چەماوەتەوە. لێك دەترازێ و دەفیزێ. کاتێکیش دەڕوانێتە ڕۆژانی تەمەنی کە لەنێو هەوری ڕەشی مەینەت و تەم و مژی ناخۆشیدا ون بووە. وەکو شۆڕەبی بەر ڕەشەبا لەرزیووە. بەم شێوەیە شاعیر دەگاتە ئەو ڕادەیەی ئومێدی بە دڵ نامینێ و دەترسێ لەوەی وەك شتەکانی تر ڕۆژێك دابێ، بەجێی بهێڵێ و ئەویش ببێتە یادگاری. هەروەك لە شیعری (بیرەوەرییەکی کاتی جوانی)دا دەڵێ:

**هــەواری زیندەگـی کێچـــی هەڵێنا**
**تەك و توێی تێکەوت ناو ماڵی خێڵی**
**دەزانم دڵ ئەتۆش باربەستی کۆچـــی**
**لــــە نێو تاوڵی لەشا تەنیام دەهێڵی**

{ محەمەدی نووری، بستووی ژیان، ل٣٩ }

# تەوەرەی سێیەم

# هەندێ بنەما و بابەتی ڕۆمانسیزم لای ئەم شاعیرانە

## أ- سۆز و ئەندێشە لای ئەم شاعیرانە:

### ١- سۆز :

سۆز ئەو هێزە سیحریە یە کە لە هەست و نەست و ناخ و دەروونی مرۆڤەوە، بەهۆی کۆمەڵێ هۆکاری کاریگەر و وروژێنەوە دروست دەبێ و، لە چاوگەیەکی قووڵ و ڕاستەوە هەڵدەڕژێ و بە توندی مرۆڤ دەتەزێنێ. یان دەیخاتە جۆش و خرۆشەوە و جەرگ و دڵ و هەناوی دەسووتێنێ.

وۆردزورث دەڵێ: ((شیعر لافاوێکی بەهێزی ڕاستەوخۆی سۆزەکانە)) [(١)]. هەروەها (مەدام دی لەمبیر) دەڵێ: ((بەبێ بوونی هەست مرۆڤایەتی و کەسایەتی نییە، تەنیا سۆزێك یان ترپەیەك لە ترپەکانی شایەنی ئەوەیە ناوی بنێین بە گیان. زیاتر لەوەی دەسەلآتی فەلسەفە ناوی دەبات)) [(٢)].

سۆز لە شیعری ڕۆمانسیزمدا لە گوزارشتکردنی شتەکان و وێنەگرتنی بیر و هزرەکاندا ڕۆڵێکی کاریگەر دەگێڕێ و جووڵە و زیندویەتی پێ دەبەخشێ. لەم ڕێبازەدا بە پێچەوانەی کلاسیکیەکان ڕۆڵی هۆش کەم دەبێتەوە)) [(٣)]. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە سۆز لای ئەوان بنەمای سەرەکیی شیعر بووە. بۆیە دەبینین ((ڕۆمانتیکیەکان هەوڵی ئازادکردنی هەست و سۆزیان ئەدا و جوانییان لە دیمەنە سروشتیەکان و ژیانی ساکاری دێهاتەکاندا دەبینی))[(٤)]. بەم شێوەیە ((لای ڕۆمانتیکیەکان سۆز، چونکە بالآترین هەستی ئینسانە، کرۆکی شیعرە و خەیاڵیش شاباڵی فڕینی سۆزە)) [(٥)].

---

(١) مجموعة من المؤلفين، تأريخ الأدب الأوروبى، ص ٢٠٧.

(٢) د. محمد غنيمى حلال، الرومانتيكية، ص ٢٣.

(٣) د. سالم احمد حمدانى، مذاهب الأدب الغربي و مضاهرها فى الأدب العربي الحديث/،ص ١٠٢.

(٤) یاسین صابر صاڵح، ئینسایکلۆپیدیای گشتی، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، چ ١، سلێمانی، ٢٠٠٥، ل ٥٢٧.

(٥) حەمە سەعید حەسەن، شیعری ڕۆمانتیك، گ ڕۆمانسی، ژ ١٥، بەهاری ٢٠٠٧، ل ٦.

کەواتە ((شیعر بە هێزی سۆزەکەی خۆی دەتوانێ ڕازیمان بکا بەوەی هەموو شتێ وێنەیەکە بۆ ڕاستی)) [(١)]. جگە لەمانەش لەبەر ئەوەی ڕۆمانسیزم لەسەر بنەمای سۆز و ئەندێشە بنیاد نراوە، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی گوزارشت لە خود بکات و خۆیی بێت و هەڵچوون و سۆز و خرۆشی مرۆڤ و ئەوشتانەی کە لە ناخیاندا پەنگیان خواردووە بەنووسین دەریان ببڕێت[(٢)] وەك ئاشکرایە لە شیعردا ((سۆزی کارتێکەر و ئەندێشەی داهێنەرانە یان هێزی خوڵقێنەر، هەریەك لەمانە جۆرێك لە بەرزبوونەوە و دوورکەوتنەوەی لە واقیع (کەتوار) فەرز دەکەن)) [(٣)].

شاعیرانی ڕۆمانسیزم نقومی دەریای سۆز و خەیاڵن. بەسۆزەوە بیردەکەنەوە بەسۆزەوەش دەڕواننە جیهان و هەڵوێستی خۆیان دەردەبڕن و گوزارشت لە ئێش و ئازارەکانیان دەکەن. بۆیە زۆر جار لە واقیع دوور دەکەونەوە، وەك لافاوێکی بەخوڕ و تەوژم بەربەستەکان دەڕووخێنن و هێڵی سوری سنوورەکان دەبەزێنن. چونکە ئەوان خەون و ئەندێشەکانیان لە سۆزدا تواوەتەوە و ئاوێتە بووە. زۆربەی کات بەشێوەی دیمەنی زەردەپەڕی ئێوارانی پایزی ڕووت و سارد و سڕ خۆی دەنوێنێ، یان لە وێنەی ئەو ئاشقە دڵشکاوانە دەچێ کە لەگەڵ تەنیایی و غەمدا، پیاسە دەکا، لەبەر خۆیەوە ئەو گۆرانییە دەڵێتەوە کە لە نووزەی گریان و هەنیسکی قووڵ و فرمێسکی چاو سەرچاوەی گرتووە ((شیعری ڕاستەقینەی خاوەن جیهانبینی کە خودی مرۆڤ دابڕێژێتەوە لە سۆز و خەونی ڕۆمانسیانە بەدەر نییە، ئەگەر شیعریش لە سۆز و خەونی ڕۆمانسیانە ڕووت کرایەوە، بەهیچ جۆرێك ڕاستەقینە و خاوەن جیهانبینی نییە کە خودی مرۆڤ دابڕێژێتەوە)) [(٤)].

هەروەها دکتۆر عەزیز گەردی دەڵێ: ((سۆز کڵپە و گرێکە ئەکەوێتە دڵ و ڕای ئەچڵەکێنێ، یاخود سەرچاوەیەکی ڕوونە لە پەڕەکانی دڵەوە هەڵئەقووڵێ. ئەم سۆزەش وائەبێ کە ئامانج بێ بۆ ڕاگەیاندنی بیرێك بەهۆی بزواندنێکی ڕاچەنینانەی دەروونییەوە)) [(٥)].

---

(١) سیسل دی لویس، الصورة الشعرية، ت: أحمد نصيف الجنابي وأصدقائه، دار الرشيد لنشرة، بغداد، ١٩٨٢، ص ٣٢.

(٢) محمد روحى فيصل، المدرسة الرومنطيقية- نشأتها و خصائصها و مكانها بين المدارس الأدبية، مجلة الكتاب، مجلد ٢، مطبعة دار المعارف، مصر، ١٩٤٦، ٧٤٩.

(٣) رُوز غريب، تمهيد في النقد الحديث، ط ١، مطبعة دار المكشوف، بيروت، لبنان، ١٩٧١، ص ٢١٠.

(٤) سەباح ڕەنجدەر، شتێك لە نوسین، گ ئایندە، دەزگا و پەخشی سەردەم، ژ ٥٣، ٢٠٠٤، ل ٦٦.

(٥) عەزیز گەردی، ئەدەب و ڕەخنە، چاپخانەی (الحوادث)، بەغدا، ١٩٧٤، ل ٣٤.

بێگومان هەر شیعرێك چەند لە ڕاستیەوە نزیك بێت و ئەزموونی شاعیریش تازیاتر بە نێو قوولاّیی ئێش و ئازارەکاندا شۆڕ بێتەوە. ئاوا سۆزی شیعرەکە بەهێزتر و کاریگەرتر دەبێت و زووتر دەگاتە ناخی پەیاموەرگرەوە و توندتر هەست و نەستی دەورووژێنێ و کاری لێدەکات و شوێنەواری خۆی لەلا بەجێ دەهێڵێت. بەم شێوەیە ((سۆزی ڕاستەقینە ئەوەیە کە خودی شاعیر خۆی هەست بەخەم و خەفەت و نیگەرانی یان هەست بە خۆشی و جوانی بکا، ئەوسا دەتوانێ گیانێکی نەمر بە بەرهەمەکەی بکا، بەم ڕێگایە دەتوانێ گیانمان بخاتە جۆش و خرۆشەوە)) [٤]. سۆز وەك یەکێك لەبنەما سەرەکیەکانی ڕۆمانسیزم بەڕادەیەکی زۆر بەهێز و گەورە وەك تین و تەوژمی شەپۆڵەکانی دەریا لە شیعرەکانی هێمن و محەمەدی نووری هاژەیان دێ و شەپۆڵ دەدەن. ئەمەش بۆ ئاشنابوون و نزیکی ئەم شاعیرانە لە کارەسات ڕاستی ئەو ڕوداوانە دەگەڕێتەوە، کە بوونەتە هەوێن و خورپە بۆ لەدایکبوونی ئەو شیعرانەی پڕن لە هەست و سۆزی ڕاستەقینە. سۆز سیمایەکی زەق و دیاری زۆر لە شیعرەکانی هێمنەو کەم شیعری هەیە سۆزێکی گەورە و بە هێزی وەك کانییە ئاگرینەکانی گڕکان لە قوولاّیی هەناویدا حەشار نەدابێ و لە سات و کاتی خۆیدا نەتەقێتەوە و هورژم بە هەموولایەکدا نەبات. بۆیە شاعیر ((ناچارە پەنا بەرێتە بەر خەیاڵ و سۆز و سکالاّ و جۆرە ڕۆمانسیەتێك. وەئەم سەربانە ڕۆمانسیەتەی هێمن زیاتر شیعرەکانی دەڕازێنێتەوە، بەڵکو کاریگەرتر دەبێ، لەگەڵ گیانی کوردەواریدا دەگونجێ)) [١]. هێمن لە شیعری ((موو ناپسێنم))دا سۆزی کەسی ڕاستەقینەی خۆی دەردەبڕێ و دەڵێ:

**ئەگەرچی ڕۆیی قەت ناچێ لـــەیادم**
**دەکەم یادت بە یــــادی تۆوە شـادم**
**کە بارەگەت بۆ هەوار تێك نا عەزیزم**
**شکا ئــەستوندەگـی تـــاوڵی مــرادم**

{ تاریك و ڕوون ل ١٢٩. }

---

(١) فەهمی شوکری عەبدولاّ، هەمان سەرچاوە، ل ١٧٣.

(٢) محەمەدەمین ئەحمەد، مەی و مەیخانە لە شیعری هێمن دا، گ ڕۆشنبیری نوێ، ژ ٧٩، ئاداری ١٩٨٠، ل٦٣.

لەم دەقەدا شاعیر لە قوولاّیی دلّێکی پڕ لە هەست و سۆزێکی ڕاستەقینەوە، وێنەی ژیانی جودایی و دابڕان و ئەشکەنجەی دەروونی خۆیمان بۆ دەخاتە ڕوو و، ئەزموونی خۆشەویستی پڕ لە ناکامی و ناخۆشی و تالّی ئەو ساتانەمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە بە هۆی جوودابوونەوە و مالّئاوایی لە خۆشەویستەکانییەوە درووست بووە، بەلاّم شاعیر بۆ ئەوەی بەوەفایی دلّسۆزی خۆی بسەلمێنێ، بەلّێن دەدات کە هەرگیز لە یادیان نەکات و هەربەیادی ئەوانیشەوە شاد بێ و بژی. دیارە کاریگەری و شوێنەوار و ڕووبەری ئەم دابڕانە وەك خۆی نامینێتەوە، بەپێی گەورە بوون و ئالّۆز بوونی ڕووداو گۆڕانکاریەکان شەپۆلەکانی دەریای سۆزی شاعیریش گەورەتر و بەهێزتر دەبن، چونکە غەمەکانی شاعیر زیاتر لەڕەنگ و شێوەیەکی گرتۆتە خۆ، هەر ئەوەش وای لێدەکات کە سۆزی شیعرەکانیشی زیاتر لە بابەت و ئێش و ئازارێك بگرێتە خۆ. بۆیە دەلّێ:

**نابێ قەت نالّەی جودایی بێ ئەسەر**
**جا چ نەی بیکا چ پیاوی دەربەدەر**
**بۆیە نالّەم تێکەلّی نـــەی کـــردووە**
**شیوەنێکـــم پێیە نــە نەی کـردووە**

{ نالّەی جودایی، ل ٢٦. }

لەم دەقەدا شاعیر تا ئەوپەڕی سنور سۆزی ڕاستەقینەی خۆی دەردەبڕێ و بە دەنگێکی کاریگەر و سۆزێکی بەتین و سووتێنەریش پەیامەکەی دەگەیەنێتە لای پەیاموەرگرەوە. چیرۆك و کارەساتی جودایی خۆی دەگێڕێتەوە، پێیان دەلّێ کە نالّەنالّەی نەی یان کەسانی دەربەدەری وەك من بێ هۆ و ئەسەر نییە. دواتر شاعیر وێنەیەکی جوانتر و سۆزێکی بەهێزترمان پیشان دەدات کاتێك دەیەوێت جەخت لەسەر ئەوە بکاتەوە ئاماژە بەو ڕاستیە بکات کە ئەو نالّەنالّ و شیوەنەی خۆی کردوویەتی و دەیکات هەرگیز لە توانای نەی نییە و نەی کردووە و نایکات.

بێگومان ئەمەش لافاوێکی سۆزی ڕاستەقینەی کەسیەتی شاعیری لە پشتەوەیە، کە بەهۆی دووری لە زێد و کەس و کار و خۆشەویستانی درووست بوو.

شاعیر لە پالّ سۆزی دووری خۆشەویستی ئافرەت و زێد و کەس و کاری، غەمە نەمرەکانی نیشتمانیش هەست و نەستی دەورووژێنێ و کانیاوی شیعرەکانی دەخاتە هەلّقولّین. بۆیە کەفوکولّی ئەم هەست و سۆزەی خۆی بۆ نیشتمانەکەی بە شێوازێکی ڕۆمانسیزمی دەردەبڕێ و دەلّێ:

**بەشەو تاکو بەسەرما زاڵ دەبێ خەو**
**بەرۆژ تـــاکـــو دوبارە دێتەوە شــەو**
**لــە کاتێکدا کە دەدوێنم ئـــەم و ئەو**
**ئەمن ئەی نیشتمان تۆم هەر لــەبیرە**

{ ناڵەی جودایی، ل ٦٢. }

لەم دەقەدا شاعیر ئەوە دەسەلمێنێ کە نیشتیمان هەناسە و خوێن و گیان و جەستەیە. لەبەرئەوە هەرگیز ناتوانێ بێ نیشتمان بژی، یاخود فەرامۆشی بکات، بۆیە هەمیشە وێنەکانی زیندوو و بەرز دەمێنێتەوە و لەبیری ناکات و کاڵ نابێتەوە.

سۆزی شاعیر تەنیا سەرچاوەیەکی نییە و تاکە ڕەنگ جۆر و مرازێکیشی نییە. ئەمەش وای کردووە بەزۆر شێوە و بابەتی جیاواز خۆی بنوێنێ و پەیتا پەیتا گەشە بکات و ئامانجی بەرزتر و گرنگتر بەرجەستە بکات، لە تاکەوە بەرو کۆ و لە تایبەتەوە بەرەو گشتی بڕوات. غەمی گەورەی کۆمەڵگاو، مرۆڤایەتی بە کۆڵەوە بگرێ. بۆیە دەڵێ:

**خـــۆم دەسووتێنم هەتا بەزمی خەڵك ڕۆشن بکەم**
**کێ لە ڕێی خەڵکا وەکو شاعیر دەسووتێ شەم نەبێ**

{ تاریك و ڕوون ل١٣٢ }

لەم دەقەدا شاعیر ئەوپەڕی سۆزی ڕاستەقینەی مرۆڤایەتی خۆی دەخاتە ڕوو، کاتێك بڕیار دەدات وەك مۆم خۆی بسووتێنێ، تا بەم هۆیەوە ژیانی خەڵك و مرۆڤایەتی ڕۆشەن بکاتەوە.

لە شیعرەکانی **محەمەدی** نوریش دا هەست و سۆزێکی ناسك و قووڵ کاریگەر و ڕاستگۆیانە دەبینرێت. شاعیر بەلای زۆر لەخۆکردن فشاری زۆرەملێی ڕێکخستن و بنیاتی پێکهاتەی شیعرەوە ناچێ، بۆیە بابەتی شیعرەکانی ئەوانەن کە بەهۆی لافاوی سۆزێکی بەهێزەوە لەدایك بوون. وەك لە هەردوو لایەنی سروشتی گیاندار و بێگیاندا دەبینرێت.

شاعیر وەك هەر مرۆڤێکی تری ئاسایی تیری نیگای چاو جوانان و دڵی دەپێکێ و جەرگی لەت لەت دەبێ و، خوێناو لە هەناوی دەتکێتەوە و، دەکەوێتە ئامێزی غەم و پەژارەوە، بەڵام هێشتا بێئومێد نییە و مەلی هێوای بەرز دەفڕێ هەروەك لە شیعری (تیری نیگا)دا سۆزی ئەم خۆشەویستیە ڕۆمانسیزمییەی دەردەبڕێ و دەڵێ:

**بەئاواتت دەژیم تا هەم لەگەڵ غەم**

**لە تانووتی ڕەقیب گورچـــووبڕاوم**

{ دیوانی محەمەدی نووری و بستووی ژیان ل٢٠ }

لەم دەقەدا شاعیر لەگەڵ ئەوەی لەنێو ئازار و ئەشکەنجە و غەم و مەینەتی ئەویندا دەناڵێنێ، بەڵام هەمیشە بە ئاواتی دڵبەرەکەیەوە دەژی و لێی زیز نابێ. هەرچەندە تانە و وتەی ناحەزانیش گورزی گورچکبڕی لێ دەدەن و هەرەسانی دەکەن، بەڵام هەرگیز ناگاتە ئەو سۆزەی کە لە کانیاوی خۆشەویستی خاك و گەل و نیشتمانەوە سەرچاوەی گرتووە و هەڵدەقوڵێ. ئەمەش فراوانی و قووڵی و بەهێزیی هەست و سۆزی شاعیر بەرامبەر نیشتمانەکەی پیشان دەدات، کە دەڵێ:

**دوژمنی بـــەدخو ئەگەر تۆ بمدەیەی زێڕی وڵات**

**دار و بـــەرد و خاك و خۆڵم بۆ بکەیتە حاسڵات**

**بمکەیە سەرداری دنیا تـاجی شاهیم کەی خەڵات**

**شەرتە تێی هەڵدەم لەتاجت بیگەیەنمە ڕۆژهەڵات**

{ دیوانی محەمەدی نووری و بستووی ژیان ل٢٠ }

لەم دەقەدا شاعیر لەبازنەی هەست و سۆزێکی ڕاست و ڕەوانەوە هەڵوێستی شۆڕشگێڕانەی خۆی بەرامبەر دووژمنانی نیشتمانەکەی پیشان دەدات و، مل بۆ داگیرکەران کەچ ناکات و زەڕەیەك لە خاکی وڵاتەکەشی بە تاجی پاشایەتی و هەموو سەروەت و سامانی دونیا ناگۆڕێتەوە. بۆیە بە شانازییەوە دروشمی یا وەتەن یا مردن بەرز دەکاتەوە.

### ٢- ئەندێشە:

ئەندێشە یەکێکە لە ڕەگەز و بنەما سەرەکی و بەهادارەکانی شیعر و ئەدەب، بەتایبەتی لە ڕێبازی ڕۆمانسیزمیدا. لە هەمان کاتدا بە بڕبڕەی پشتی هەموو داهێنانێکی شیعری دادەنرێت. چونکە هیچ بەرهەمێکی شیعری ناگاتە لووتکە و نەمری بە خۆوە نابینێ ئەگەر ئەندێشەیەکی فراوان و مەزنی لە پشتەوە نەبێ. ئەمەش بۆ ئەو ڕۆڵە کاریگەر و بەهێزەی ئەندێشە لە پێکهاتەی شیعردا هەیەتی دەگەڕێتەوە. شوپنهاوەر دەڵێ: ((ئەندێشە یەکێکە لەو کەرستانەی هونەرمەند هەرگیز لێی تێر نابێت. چونکە بە هاوکاری ئەندێشە نەبێت هونەرمەند ناتوانێ تێڕوانینی خۆی بۆ شت و ڕووداوەکان لە وێنەی بەرز و زیندوودا

بنوێنێ))[1] کەواتە شاعیر و نووسەر و هونەرمەندان گەر بیانەوێ بەرهەمەکانیان بەرز و زیندوو بن، دەبێ بەدوای ئەندێشەی فراوندا بگەڕێن. کیتس دەڵێ: ((من وەسفێ شتێ دەکەم لە ئەندێشە و خەیاڵم دابێ)) [2]. دیارە ئەندێشەش لە هەڵچوونەوە سەرچاوە دەگرێ، بۆیە ئەلفرێد دی مۆسیە دەڵێ: ((هەموو ئەوشتانەی کە شاعیر پێویستی پێی هەیە هەڵچوونە))[3] یان دەتوانین بڵێین ئەندێشە ئەو خەونە چڕو ئاڵۆزانەیە کە لە ئەنجامی حەز و خولیا و تامەزرۆیی مرۆڤەوە یان بە پێچەوانەوە دروست دەبێت. عەلائەدین سەجادی دەڵێ: ((ئەندێشە کە خەیاڵە، بێگومان تەوژمێکی تیژ تێپەڕی پەنهانییە لە دڵا، وەیا هێزێکی پەنهانییە تاپۆی ئەو یادانە ئەهێڵێتەوە، کە مایەکانیان ون بوون. بێگومان ئەگەر ئەندێشە نەبێت، ئیشی بەیان و ئەدەب ئەوەستێ)) [4].

عەزیز گەردی دەڵێ: ((هەر ئەندێشە پەیکەری شتە مادیەکان ئەهێڵێتەوە، بێگومان ئەگەر ئەندێشە نەبێت، بەیان و ئەدەب ئەوەستێ، ئەو پەیکەرەی ئەدەب هەیەتی نامینێ. چونکە ئەگەر ئەندێشە نەچێ پەیکەرەکەی بۆ دروست بکا، پاشان وشەکان دەربڕن، وشە ناتوانێ بچێ ئەو گوزارانە ببینێت بە شێوەیەکی کاریگەر بیانخاتە ڕوو)) [5].

ئەمەش ئەو ڕاستیە دەسەلمێنێ کە شاعیر و نووسەران چەند دەریای ئەندێشەیان قووڵ و فراوان بێت هێندە بەرهەمەکانیان چڕ و باڵاتر دەبێت و لەباری ئێستاتیکیەت و وێنەی شیعریشدا بەرز و بەهێزتر دەبێت، چونکە ((لە ڕەوتی هونەریدا خەیاڵ هەر بەتەنیا ئامرازێکی گشتیکردن و ڕێکخستن نییە، بەڵکو هێزێکە کە وێنەی هونەری پێك دێنێ)) [6].

دیارە شتێکی ئاشکرایە کە ئەندێشە گەلێك جۆری هەیە، بەڵام لە هەموویان دیارتر ئەوەیە کە کولیردیج باسی کردووە.

---

(١) محمد رضا مبارك، اللغة الشعرية في الخطاب النقد العربي، مطبعة وزارة الثقافة، بغداد، ١٩٩٣، ص ١٦٥.

(٢) مجموعة من المؤلفين، تاريخ الادب الاوربية، قسم الثالث، ص ٢٠٨.

(٣) د. انطونيوس بطرس، الادب (تعريفه، انواعه، مذاهبه)، ص ٢٨٨.

(٤) علاءالدين سجادی، ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی، چاپخانەی معارف، بەغدا، ١٩٦٧، ل ٧٨.

(٥) عەزیز گەردی، ئەدەب و ڕەخنە، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، ١٩٧٤، ل ٣٤.

(٦) ئیحسان تەبەری، ئیستاتیك و هونەر، و: هێدی، چاپییەکەم، ئەڵمان، ١٩٩١، ل ٢٩.

کولیردیج ئەندێشەی سەرەکی و لاوەکی لەیەکتر جیا کردۆتەوە، ئەندێشەی سەرەکی ئەوەیە کە هەموو مرۆڤێك هەیەتی. بەلاّم ئەندێشەی لاوەکی، ئەندێشەی هونەریە کە بە تواناکانی مرۆڤ ناو دەبرێ. تەنیا بەهرەدارەکان ئەوانەی خاوەنی پێشبینی و ئەفراندنی داهێنەرانەن هەیانە. ئەوەش کەرەسەی هونەرمەند و شاعیرە گەورەکانە.[1]. بەلای (وردز ورث و کولێردیج)ەوە ئەندێشە ڕاستگۆترە لە هزرو هۆش، بەلای ئەوان ئەندێشەی شیعری باس لە ڕاستیەکان دەکات[2].

هەرچەندە کە ئەندێشە لە ڕەگەزە گرنگ و کاریگەرەکانی شیعرە، بەلاّم ئاست و پایەکانی لە شاعیرێکەوە بۆ شاعیرێکی تر و لە ڕێبازێکەوە بۆ ڕێبازێتر دەگوڕێ. ((ڕۆمانسیزمییەکان پێیان وایە کە ئەندێشە مەلەکەی یەکەمە لای مرۆڤ، داهێنەرە و توانای گەیشتنی بۆ ڕاستی هەیە)) [3]. بۆیە ((ئەندێشە لە ڕاستیدا بریتییە لەو توانایەی، کە هۆنیار بەهۆیەوە دەتوانی وێنەی ئەندێشەیی تاقیکردنەوەکانی ڕابردووی دروست بکاتەوە))[4]. شاعیرانی ڕۆمانسیزم هەردەم بە خەون و ئەندێشەوە دەژین. ئەندێشە لە کۆیلایەتی و چەوساندنەوە و ستەم و زۆرداری ڕزگاریان دەکات، چونکە ئەوان بەهۆی ئەندێشەوە لە خۆشەویستیی بێسنوور بەهاری بێ کۆتایی و جیهانی بالاّدا دەژین. لە غەم و مەینەتییەکانی ڕۆژگار دوور دەکەونەوە و بەرەو ئاسمان و بەهەشتی خەونەکان دەفڕن، تا لەوێدا پشوو بدەن و هەناسەیەکی ئارام هەڵبکێشن. شاعیرانی ڕۆمانسیزم شوێنی (ڕۆسۆ) دەکەون کە دەڵێ: ((ئەگەر خەونەکانم بگۆڕێت و ببێتە ڕاستی بەس بە هێندە کۆتاییم پێ نەدەهێنا، بەڵکو دەمامەوە بۆ ئەوەی ئەندێشە و خەون ببینم، ئارەزووشم لە سنورێك نەدەوەستا. لەبەر ئەوەی بەبەردەوامی لە دەروونی خۆمدا هەست بە بۆشاییەك دەکەم، کە هیچ شتێك شرۆڤەی ناکات و پڕی ناکاتەوە، ئەمەش جۆرێکە لە دڵ

---

(١) عاطف جوده نصر، الخيال مفهوماته و وضائفه، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ١٩٨٤، ص ٢٤٠ – ٢٤١.

(٢) د. سالم احمد الحمداني، مذاهب الأدب العربي و مظاهرها في الأدب العربي الحديث، ص ١٠١.

(٣) د. عبدالمنعم تليمة، مقدمة في نظرية الآداب، ط ٢، كلية الآداب، جامعة القاهرة، دار العودة، بيروت، ١٩٧٩، ص ١٩٢.

(٤) عادل مەجید محمەد گەرمیانی، وێنەی بابەتی لە هۆنراوەکانی گۆران و سەیابدا، نامەی دکتۆرا، کۆلیژی پەروەردە (ئیبن روشد)، زانکۆی بەغدا، ٢٠٠٠، ل ٩٥.

چوون بۆ ژێدەری چێژ، کە زانیاریم لێی نییە، بەڵام هەست بەوە دەکەم کە پێویستیم پێیەتی))[1].

ئەم بۆچوونەی (رۆسۆ) ئەوە پیشان دەدات، کە حەز و خواست و هێواو ئاواتەکانی مرۆڤ بێسنوورن و هەرگیز تەواوبوون و تێر بوونیان نییە، جەختیش لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە خەون و ئەندێشە، ڕووبەرێکی یەکجار فراوان لە ژیانی ئادەمیزاددا پێك دەهێنن، بۆیە دەبینین هەمیشە بەبەردەوامی لە جیهانی خەون و ئەندێشەدا دەژی و هەرگیز لێیان جیا نابێتەوە. ئەندێشە لای شاعیرانی ڕۆمانسیزم زیاتر بەدی دەکرێت و وەك سیمایەکی گەش و دیاریش خۆی دەنوێنێ، بەتایبەتی ئەو جۆرە ئەندێشانەی کە تایبەتن بەم ڕێبازەوە. وەك (ئەندێشەی ئێستاتیکی، ئەندێشەی داهێنەرانە، ئەندێشەی ڕاڤە کاری، ئەندێشەی میللی، ئەندێشەی گاڵتە جاڕی، ئەندێشەی پێکهێنەرانە، ئەندێشەی سیاسی، ئەندێشەی ئامادەکاری)[2]. دیارە زۆربەی ئەم جۆرە ئەندێشانەش کە لە ڕێبازی ڕۆمانسیزمیدا هەیە، لە شیعرەکانی هێمن و محەمەدی نووری دا بەدی دەکرێت و تا ڕادەیەکی زۆر جوانی و ڕازاوەیی و بەرزی و زیندویەتی بە شیعرەکانیانی بە خشیوە. ئەندیشە لە شیعرەکانی هێمندا ئاست و پلە و پایە و بەهایەکی بەرزی هەیە و قووڵی و ئێستاتیکیەتێکی ڕۆمانسیزمی بێ هاوتای پێ بەخشیوە، ئەمەش بۆ باڵا دەستی و فراوانی ئەزموونی شاعیر لەم بووارەدا دەگەڕێتەوە. ئەندێشەی ئێستاتیکی ئەو ئەندێشەیەیە کە شاعیران تا ڕادەیەکی زۆر بۆ جوانکردنی بنیاتی شیعری پەنای بۆ دەبەن، بۆ دۆزینەوەو خستنەڕووی ئەو جوانییە شاراوانەی تەمومژ داپۆشین و کەسانی ئاسایی بە ئاسانی هەستی پێ ناکەن و نایبینن. یان ئەو ئەندێشەیەیە کە شاعیر لە ڕێگای ئەزموونی خۆیەوە ((وێنەی شتە بچووك و فەرامۆشکراوەکان دەکێشێ و لەئاستی خۆی بەرزیان دەکاتەوە، وا لە خوێنەر دەکات، بە چاوێکی تر بۆیان بڕوانێ)) [3]. هەروەك هێمن لە شیعری ((دڵی شاعیر)) دا لە ڕێگای ئەندێشەیەکی ئێستاتیکیدا و لە قاڵبێکی هونەریانەی بەرزدا هەست و سۆزی خۆی دەردەبڕێ و دەڵێ:

---

(١) د. محمد غنيمى هلال، الرومانيكية، ص ٧٤.

(٢) ریزان ساڵح مەولود، ئەندێشەی شیعری لە نێوان ڕێبازی کلاسیکی و ڕۆمانتیکی کوردی لە کرمانجی خوارووداا، نامەی ماستەر، کۆلێژی زمان، زانکۆی کۆیە، ٢٠٠٧، ل ١٣٣.

(٣) هەمان سەرچاوە، ل ١٠٤.

**دڵی شاعیر وەکـــو ئاوێنە دەچێ**
**گوڵکەم تۆ دڵەکـــەم مەشکێنە**
**ڕاستە زۆر ناسکە، ئەمما کە شکا**
**وەکـــو خەنجـەر دەبـــڕێ ئاوێنە**

{ تاریك و ڕوون، ل ٢٢٩ }

لەم دەقەدا شاعیر ڕوو دەکاتە دلبەرەکەی و تکای لێ دەکات کە بە هەست و سۆز و بەزەییەوە تێی بڕوانێ و ئازاری نەدات و دڵی نەشکێنێ، چونکە دڵی خۆی ئەگەرچی ناسکە بە ئاوێنەی دەچوێنێ و کاتێ دەشکێ، وەك خەنجەری لێدێت و هەموو شتێك دەبڕێ.

ئەندێشەی داهێنەرانەش کە یەکێکە لە گرنگترین و سەرەکیترین جۆرەکانی ئەندێشە، لە شیعری ئەم شاعیرانەدا خۆی دەنوێنێ. کە لە ئەزموونی شیعریدا سەرکەوتوون و توانای داهێنان و گۆڕانکاریان لە هێنانە کایەوەی ئەندێشە و دروستکردنی وێنەدا هەیە، چونکە ((ئەگەر هاتوو وێنە ئەنجامدراوەکان هونەریانە پشتی بەوێنە ڕابردوو بینراوەکان بەستبێ و بەهۆیانەوە وێنەی تازە و گونجاو سازدرابێ، ئەوا ئەندێشە بەرپاکەرەکەی بە ئەندێشەی داهێنەر ناو دەبرێ)) [1]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە شاعیر بە شێوەیەکی فۆتۆگرافی ڕوون وێنەی شتەکان ناکێشێ، بەڵکو گۆڕانی بەسەردا دێنێ و داهێنانی تێدا دەکات و، گیانی نەمری و بەرزی پێ دەبەخشێت. لە شیعری (یادگاری شیرین)دا ئەم ڕاستییە دەردەکەوێت کە دەڵێ:

**بەژنەکـــەت سێدارەیە، کـەزیەت تەنافـــە زوویە دەی**
**بیخە ئەستۆی من کـــە کوردم، کورد بەشی خنکاندنە**
**زامی جەرگی مـــن بە فەرموودەی گراوی سواری کـورد**
**مەڵهەمــــی هــەر ژەنگی گوارە و ئارەقی بەر گەردنـە**

{ تاریك و ڕوون ل ٦٩ }

لێرەدا شاعیر بە شێوازێکی ڕۆمانسیزمی ئەوپەڕی داهێنانی کردوە، کاتێك بە ئەندێشە فراوان و خوڵقێنەرەکانی بەژنی خۆشەویستەکەی بە سێدارە و کەزیەکەشی بە تەناف و پەتی خنکاندن دەچوێنێ، لەگەڵ ئەوەش شاعیر مەرهەمی زامی جەرگی خۆی لە ژەنگی گوارەکانی ئارەقی گەردەنی یارەکەیدا بەدی دەکات.

---

(١) دڵشاد عەلی محمد، بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردی دا، ل ٤٦.

ئەوەی لێرەدا جێی ئاماژە پێکردنە شاعیر ئەندێشە و وێنەکانیشی بە ئێش و ئازارەکانی میللەتەکەی پەیوەست کردووە لێی جیا نەبۆتەوە.

ئەندێشەی ڕاڤەکاری کە بەڕادەیەکی زۆر لای شاعیران بەدی دەکرێت و (ئەم جۆرە ئەندێشەیە ڕوو لە جوانییەکانی دەورو بەر دەکات و لە ڕێگای کۆمەڵێ توخم و بنەمای ترەوە، ئەو جوانیانە نیشان دەداتەوە و نهێنی جوانییەکانمان بۆ دەردەخات)[٢]. ئەم ئەندێشەیەیە زۆر لە شیعرەکانی هێمنی لەسەر بنیات نراوە وەك بنەمایەکی ڕۆمانسیزمیش لای لێکراوەتەوە. شاعیر گەلێك جار ئەو دیمەنانەی سەرنجی ڕادەکێشن بەهۆی ئەندێشەی ڕاڤەکاری خۆیەوە بەناویاندا گوزەر دەکات و، جوانییەکان ڕاڤە دەکات و بەها و سیحری ئەم جوانیانەی شاردراونەتەوە دەخاتە ڕوو، ئەمەش توانا و لێهاتووی و ئەزموونی شاعیرمان لە فراوانیی ئەندێشە و وەسف و وێنە کێشاندا بۆ دەسەلمێنێ، کە دەڵێ:

**ڕاستە تۆ جوانی، لەباری، نازداری، شۆخی، نەشمیلی**
**کوڵمت گەشترن لە گوڵ و خاڵت ڕەشترن لـــە زیلـــی**
**جیابوونەوەت دەردە، بەلاّم تۆش دەزانی تـامی نییە**
**ژوان و شەوڕاو و دڵداری، ڕازو نیـــازی بـــە دیلـــی**

{ تاریك و ڕوون ل ١٦٩ }

لەم دەقە شیعریەدا شاعیر هەوڵی داوە لە ڕێگای ئەندێشەی ڕاڤە کارییەوە پێشانی بدات کە ژوان و دڵداری لەگەڵ یاری جوان و شۆخ و نازداردا بە دیلی و ژێردەستی هیچ تام و چێژێکی نییە.

ئەندێشەی میللی (ئەندێشەیەکی جەماوەریە و بزوێنراوی سۆز و بیری کۆمەڵگایە، چونکە زۆر جار ئەو چیرۆك و داستانانە سیمایەکی کۆمەڵگەرایەتی وەردەگرن)[٢] و لەو ئەندێشانەیە کە ڕووبەرێکی فراوانی لە شیعری شاعیردا داگیر کردووە.

---

(١) ریزان ساڵح مەولود، ئەندێشەی شیعری لە نێوان ڕێبزی کلاسیکی و ڕۆمانتیکی کوردی لە کرمانجی خوارووداْ، ل ١٣٣.

(٢) هەمان سەرچاوە، ل ٦٩.

ئەمەش وەفا و دڵسۆزی و خۆشەویستی و پابەند بوونی شاعیر بە مێژوو کەلتور و ناودارانی گەل و نەتەوەکەی دەگەیەنێ، کە دەڵێ:

**کەوتمە نێو چاڵی دیلی وەك مەمێ**

**(یایە زین) لە کوێیە هاواری کەمێ**

**کوا (قەرە تاژدین)، (چەکۆ)و (عەرفۆ) لە کوێن؟!**

**بێنە هانام وەك پڵینگی چەنگ بەخوێن**

{ناڵەی جودایی ل ٢٩ }

لەم دەقەدا شاعیر ئەزموونی خۆشەویستیی خۆی دەگێڕێتەوە، کە چۆن وەك مەم کەوتۆتە چاڵەوە و بەدوای (زین)دا وێڵە تاکو هاواری بۆ بکا. دواتر بەشێوەی پرسیاری کورت و خێرا، خۆی بە مەم دەچوێنێ و هانا بۆ قەرە تاژدین و چکۆ و عەرفۆ دەبات، بۆ ئەوەی وەك پڵنگی دەست بە خوێن بە فریای بکەون و لە دەستی دوژمنان ڕزگاری بکەن.

لە پاڵ ئەمانەدا ئەندێشەی پێکهێنراو ئەو ئەندێشەیەیە کە شاعیر بەو هۆیەوە وێنەی شتە هەستپێکراوەکان دەکێشێ، لە ڕێگای هەندێ وێنەی ترەوە کە نزیك و هاوشێوە و هاوسۆز بن و لە گەلێك سیفەتەوە لەیەك بچن (واتە ئەم جۆرەی ئەندێشە وێنەیەك لەبری وێنەیەکی تر دەهێنێتەوە کە سەرچاوەی سۆزەکەیان یەك سەرچاوە بێ)[1]. ئەم جۆرە ئەندێشەیە لە شیعرەکانی هێمندا بەڕادەیەکی زۆر بەرچاو دەکەون کە دەڵێ:

**تکە ئاونگی سەر گەڵای زەردم**

**خەستە و دەردەداری چی دەردم**

**ئاخرین تیشکی خۆری پایزم**

**شاعیری پیری تووڕە و زیزم**

{ ناڵەی جودایی ل ٥٢ }

لەم دەقەدا شاعیر کاتێ دەچێتە ناو تەمەنەوە و پیر دەبێ سیماو ڕوخساری خۆی بەو وێنانە دەچوێنێ کە لە زۆر ڕووەوە لێی دەچن. وەك وێنەکانی گەڵای زەرد و نەخۆش و دەردەداری و ئاخرین تیشکی خۆری پایز، چونکە مرۆڤ کاتێ پیر دەبێ وەکو پایز ڕووت و لاواز و ژاکاو و زیز و هەناسە سارد دەبێت.

(١) هەمان سەرچاوە، ل٧٧.

وێڕای ئەم ئەندێشانە ئەندێشەی سیاسی لەو ئەندێشانەیە کە دەوری شاعیری گرتووە و تا ڕادەیەکی زۆر سەرقاڵی کردووە. خۆشی دانی بەو ڕاستیەوە داناوە بۆیە دەڵێ:

**هەتـا کـەنگێ سیاچـاڵی بـــەسـامـــــی دوژمنی زاڵم**

**پڕاو پڕ بێ لە ڕۆڵەی گەل، جەمەی بێ وا لــە دەستبەستان**

**هەتاکـــەی ئەشکی خوێنینی کچە کـــوردی برا کوژراو**

**لە جێی بادە و لە بەزمی دوژمنان بدرێتە دەست مەستان**

{ دیوانی هێمن موکریانی ل ٣٣٧ }

لەم دەقەدا شاعیر ڕوو دەکاتە میللەتەکەی و لە فێڵ و پیلانەکانی دوژمنان بە ئاگایان دێنێتەوە و پێیان دەڵێ:

لەخەو هەستن ڕاپەڕن تاکەی ڕۆڵەکانمان بچەوسێندرێتەوە و دیل و زیندەبەچاڵ بکرێن و فرمێسکی چاوی کچانیش لە جێی بادە دوژمنانی پێ مەست ببێ. بەم شێوەیە شاعیر لە ڕێگایئەندێشەی سیاسی و بەشێوازی لێکچواندنەوە وێنەیەکی ڕۆمانسیزمی جوانی بۆ کێشاوین.

ئەوەی لێرەدا جێی ئاماژە پێکردنە ئەندێشە ئامادەکاری جۆرەکانی تر لە شیعرەکانی هێمن دا تا بڵێی زۆر و فراوانە، بەلاَم بە پێچەوانەوە ئەندێشەی گاڵتە جاڕی زۆر بە کز و لاوازی تەنیا لەیەك دوو شیعریدا بەدی دەکرێت.

لە هەمان کاتدا هەریەکە لە جۆرەکانی ئەندێشەی ڕۆمانسیزمی کەم تا زۆر لە شیعرەکانی محەمەدی نووریدا بەدی دەکرێت و ئەندێشەی ئێستاتیکیەتیش وەك یەکێك لە ئەندێشە سەرەکیەکان لە لای شاعیر ڕەنگی داوەتەوە، بەهۆی شێوازی لێکچواندنەوە وێنەیەکی جوانی خستۆتە ڕوو و دەڵێ:

**لـــە ژێر تۆڕی دەسماڵ و زریوەی تـــــــاسکلاَودا**

**وێنـــەی مانگێك دەلەرزێ لە شـــەپۆلی گولاَودا**

**نیســێ و ڕووناکی گەردن، یەخەو دەرزیی بەرۆکی**

**خەرمانەی خۆری بـاران، لە گۆلی هەورو ســاودا**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل٢٩ }

لەم دەقەدا شاعیر ڕووی یارەکەی کە لە ژێر دەسماڵ و زریوەی تاسکلاوّدایە، لە جوانی و گەشی دا بە مانگی دەچوێنێ. دواتر دیمەنی سێبەر و ڕوناکیی گەردنی و یەخەو دەرزیی بەرۆکیش بەو خەرمانەیە دەچوێنێ، کە لە نێوان هەور و سامالّدا لە ئەنجامی ڕوناکیی خۆرەوە دروست دەبێ. هەروەها شاعیر توانیویەتی داهێنانیش لە هەندێ ئەندێشەی شیعری خۆیدا بکات و بە هۆی وێنەی بەرز و جوانەوەش سیمایەکی گەش و زیندوویی پێ ببەخشێت، دەڵێ:

**هەرچەنە و چۆکم لێك دەکەن سلاو**

**تـالاّن و بـرۆی هەست و خوستانـە**

**لـە کـاولی لەشا هەر گیانـە جێماو**

**هـــەر ئـەوم ماوە پـاشماوەی تالاّن**

**هـــەربینا هاتن بۆویّش بە سەرڕاو**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل٥٨}

لەم دەقەدا شاعیر دیمەنی پیری خۆی نیشان دەدات و وێنەکانی چەنە و چۆکی (بەکەس کردن)دەکات، کاتێ سیفەتی مرۆڤیان دەداتە پاڵی، سلاو لەیەك دەکەن، پاشان لەشی بە کاولگا دەچوێنێ کە گیانی تێدا بەجێماوە و تالاّن نەکراوە بە تەنیا ماوەتەوە. ڕاوچیش چاوی لێبڕیوە، بۆ ئەوەی ڕاوی بکات ئەندێشەی ڕاڤەکاریش بەهەمان شێوە زۆر جار شاعیری گیرۆدە کردوە. بۆئەوەی بەم هۆیەوە هەست و نەستی خۆی بکاتە وێنە و بەشێوەیەکی ڕاڤەکاری بیخاتە ڕوو وەك دەڵێ:

**بـــرۆی، چـــاوی، برژانـــگی**

**لـــــە رووی زەرد و ڕەشـــانگی**

**خـــوێنی لە نێو پێستی سوور**

**یـــان هەر سپی و دەریای نوور**

**گیانـــی لـە نێو هەمووانـــی**

**ڕەنـــگ و نـــەژاد نـــازانی**

{دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل٤٦}

لێرەدا شاعیر مرۆڤانە بیردەکاتەوە و لە ڕوانگەی مرۆڤایەتیەوەش دەڕوانێتە ژیان، هیچ جیاوازیەك لە نێوان مرۆڤ و ڕەگەز و نەتەوەکاندا نابینێ. هەست و باوەڕی مرۆڤانەی خۆی وەك گیان لە ناو هەموو بەشەکانی جەستەدا بەیەکسانی دەدۆزێتەوە. شاعیر لەم دەقەدا بە شێوازی

ڕاڤەکاری و بەهۆی چەند وێنەیەکی سادەوە وێنەیەکی گشتی بەرجەستە کردووە، بەلاّم شاعیر لە ئەندێشەی میللیدا زیاتر بۆ مێژوو و کەلتوری نەتەوەکەی خۆی گەڕاوەتەوە و وێنەی شیعرەکانی لەم سەرچاوەوە هەلّهێنجاوە و دەلّیّ:

**چیها ئـــاواتی شیرینم لــــــــە بێستوونی جەفا نەخشا**
**ئەوەی فەرهاد بە تێشەی کرد، هەلّمکەند من بەنینۆکم**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل٣٤ }

لەم دەقەدا شاعیر ئاوڕی لەبەسەر هات وڕووداوە تالّەکانی میللەتکەی دەداتەوە و ئاماژەی بە داستانی خۆشەویستی پڕ کارەسات و ناکامی شیرین و فەرهاد دەکات لە دەردەسەری و نائومێدیدا خۆی بە ئەوان دەچوێنیّ، بەلّکو زیاتریش دەچێتە پێش. بەمەش شاعیر بەهۆی ئەندێشەی میللییەوە چەند وێنەیەکی جوانی بۆ کێشاوین. جگە لەمەش شاعیر لە ئەندێشەی گالتەجاریدا دەستکورت نەبووە، بەلّکو چەند شعرێکی بە هۆی ئەم ئەندێشەوە بنیات ناوە وەك لە شعری (هەمبانەی درۆ) دا دەلّیّ:

**ئــەو کەسەی وادەی دەدا و نـــاییاتە سەر**
**گـــوێز لـــــە هەمبـــــانەی درۆ دێنێتە دەر**
**بـــیّ سـەمـــەر چـاوت لە وادەی وانەبیّ**
**داری بـیّ دارە بـــــەلاّم نـــــــــاهێنیّ بەر**
**قـــەندو تـــەسبێحی منـــــــە قووتی دەدەن**
**کاکە (سەعد) و کاکە (عەولاّ) وەك کەوەر**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل١٠٨ }

لەم دەقەدا شاعیر بەڕێگای شێوازی لێکچواندنەوە چەند وێنەیەکی جوانی بەهۆی ئەندێشەی گالّتەجاڕیەوە خستۆتە ڕوو. کەچی ئەم جۆرە ئەندێشەیە لای هێمن زۆر بە کزی و لاوازی بەدی دەکرێت.

ئەندێشەی سیاسی لای محەمەدی نووری پێگەیەکی باشی گرتووە. ئەمەش بۆ خراپیی باری سیاسیی کوردستان و ئەو بارودۆخە دژوارەی گەلی کورد دەگەڕێتەوە، کە شاعیر تێیدا دەژی کە دەلّیّ:

ئەی وەتەن گەر ژین هەبیٚ، حەققە کە تۆ ژینی منی
نـامەویٚ سـەیری گوڵستان، تۆ کـە پەرژینی منی
ئـاورم بـۆ هێزی دوژمن، چونکە تـۆ تینی منی
قیبلەکـەم، ئیمانەکـەم، پەیمانەکـەم، دینی منی

{دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل٢١}

لەم دەقەدا شاعیر نیشتمان بە گوڵی تەمەن و ژینی خۆی دەزانیٚ بۆیە پێی لە هەموو شتیٚ جوانتر و بەنرختره و تەنانەت بەقیبلەگاو باوەڕی خۆی دادەنیٚ و ئامادەیە لە ڕووی دوژمنان ببێتە ئاگر و خۆی بەخت بکا، بەمەش توانیویەتی ئەندێشەیەکی سیاسی بە شیعرەکەی ببەخشیٚ. جگە لەم ئەندێشانەی کە باس کران هەریەکە لە ئەندێشەگەلی پێکهێنراو و ئامادەکاریش بەڕادەیەکی باش بەدی دەکرێت و بوونی خۆیان دەسەلمێنن، بەلاٚم لەڕووی ئیستاتیکیەتەوە سیمایەکی دیار و زەقی نییە.

## ب- ڕۆمانسیزمی شۆڕشگێڕی و مەی و مەیخانە لای ئەم شاعیرانە:

### ١- ڕۆمانسیزمی شۆڕشگێڕی.

ئەمەش یەکێکە لە دوو لایەنە سەرەکیەکەی شیعری ڕۆمانسیزم و لە هەمان کاتدا کاردانەوە و ڕەتکردنەوەی کۆنەپەرستیەو لە گەڵیدا ناتەبا و نەبان و دژیەکە. ڕۆمانسیزمی شۆڕشگێڕی بریتیە لە هەوڵ و تێکۆشانی نیشتمانی و نەتەوەیی و هیوا و ورە بەرنەدان و بەرچاوڕووناکی. بە پێچەوانەوە ڕۆمانسیزمی کۆنەپەرستی، خەون و خەیاڵە بۆ دواوە و پەنابردنە بۆ سروشت و گۆشەگیری و بیرکردنەوە لە ڕابردوو گریان و شین و وەڕس و ئاخ هەڵکێشان و ڕەشبینییە[1]. دیارە هەریەکە لە شاعیران هێمن و محەمەدی نووری ئەگەرچی تارمایی ڕەشبینی باڵی بەسەر بەشێکی زۆر لە شیعرەکانیاندا کێشاوە، بەلاٚم لەگەڵ ئەوەشدا نەی توانیوە ئەو هەست و گیانە شۆڕشگێڕیە گەش و بەرزەی ئەم شاعیرانە بشارێتەوە، بەڵکو

---

(١) د. فازیل مەجید مەحمود، سروشت لە شیعری گۆراندا، چ ١، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ٣٠.

به پێچەوانەوە هەندێ جار لە هەندێ شیعردا بەرزی و بەتینی گڕ و بڵێسەی ئەم هەست و بیر و باوەڕە شۆڕشگێڕیە دەگاتە ترۆپك و دەدرەو شێتەوە، چونکە ئەم شاعیرانە بەهۆی توندوتیژی هەڵسوکەوت و سیاسەتی خراپ و کۆنەپەرستانەی دوژمن و داگیرکەرانەوە، لە ڕۆژگارێکی زۆر سەخت و دژوار و ڕەشدا دەژیان و، تەنانەت گەلێ جار ڕووبەڕووی شالاّوی زەبروزەنگ و گرتن و لێدان و ئاوارەیی بوونەتەوە، (ڕۆمانسیزمی شۆڕشگێڕی تا ڕادەیەك لە دژایەتیەکانی دەروونی نیزامی سەرمایەداری گەیشتبوون و، جوولاّنەوەی خەڵکیان خۆش دەویست، سەرنجی ڕوانینیان بەرەو دواوە نەبوو، بەرەو پێشەوە و بەرەو داهاتووبوو)(١).

هێمن لەپاڵ شیعر نووسیندا بەیەکێك لەو شاعیرە شۆڕشگێڕ و تێکۆشەر و خەباتگێڕە سیاسیانە دەدەنرێت کە لە سەردەمی خۆیدا خاوەنی دەنگ و سەدایەکی گەورە بووە و لەلای گەلەکەشی بەرز و ناسراو بووە، چونکە شاعیر نەك بە قسە بەڵکوو بەکرداریش بەشداری ڕووداو و گۆڕانکاریەکانی کوردستانی کردووە و، چەندین جاریش دەستەوتفەنگ شەڕی دوژمن و داگیرکەرانی ئازادیی کردووە، چونکە هیمن هەردەم لەو باوەڕەدا بووە ئەگەر شاعیر لە نێو ئێش و ئازارەکانی گەلەکەی نەژی و ناخۆشی و تاڵی نەچێژێ، نابێتە شاعیر و بەرهەمەکانی لە دڵەوە هەڵناقووڵێت و کاریگەر و ورووژێنەر نابێت و سۆز و ئەندێشەیەکی بەرز و نەمریش بە خۆوە ناگرێت. ((هێمن شاعیری گەل و جوانی و خۆشەویستی و خەبات. یەکێکە لەو سەر قافڵەچیانە. ئەو تەنیا شاعیرێکی داهێنەری سەردەمی خۆی نییە، بەڵکو فیداکار و شۆڕشگێڕ و مرۆڤ و سەوداسەری دنیای ئەفراندن و عاشقێکی سەردەستەی سروشت و جوانییە)) (٢).

هێمن هەر لەسەرەتاوە عەشقی خاك و گەل و نیشتمانەکەی خۆی بووە. بۆیە هەرزوو پەیوەندیی بە کۆمەڵەی (ژێ — کاف)ەوە دەکات و دەبێتە مرۆڤێکی خەباتگێڕ و سیاسی. هەربۆیە لە زۆربەی شیعرەکانیدا جوانی و ناسکیی ئافرەت و سروشتی لەگەڵ خەباتی سەخت و ڕەق و توندوتیژیدا گرێداوە ((شیعرەکانی هێمن خۆی لە خۆیدا کەلەپوورێکی ئەدەبی شۆڕشگێڕە، مەبەستمان لەو زاراوە تەنیا لایەنە ڕامیاریەکەی نییە، بەڵکو هەموو لایەنەکانی ژیان دەگرێتەوە، قنیلەیان دێ و شتی تازەی پوخت و پاراو و سفت دادەهێنێ، کە لەگەڵ

---

(١) ئحسانی تەبەری، ئیستاتیك و هونەر، و: هێدی، ل ٣٧.

(٢) هێمن، چەپکێ گوڵ و چەپکێ نێرگز، ل ١٤.

سیستەمی ئەو سەردەمەدا گونجاو بێ)) [1]. بەم شێوەیە هێمن وەك شاعیرێکی ڕۆمانسیزمی شۆڕشگێڕی لەو شیعرانەیدا کە لەم ڕوانگەیەوە نوسراون. داوای جیهانێکی پێشکەوتنخوازی و شۆڕشگێڕی بێ زوڵم و ستەم و زۆرداری و چەوسانەوە دەکات و بەرانگاری دوژمن و داگیرکەران و ئەو چەرخە دەبێتەوە کە تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرتی کردووە و دەڵێ:

**گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دەردم ئەمن**

**قـــەت لەدەس ئەم چەرخە سپڵە نابەزم، مەردم ئەمن**

{ تاریك و ڕوون ل ٤٩ }

لەم دەقەدا شاعیر وێڕای ئەوەی کەوتۆتە بەر شالاوی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و زوڵم و زۆری دوژمنانەوە، بەلاَم کۆڵنادات و باکی بە زنجیر و تەناف نییە. بۆیە ((سوێند دەخوا، هەتا هەتایە بیرو باوەڕی ئازادی و نیشتمانی لە یاد ناکاو کۆشش و خەبات دەکا بۆ هێنانەدیی ئەم ئازادییە)) [2]. شاعیر لە شیعری (مەتەریزی شەرەف) وێنەیەکی جوان و کاریگەری ترمان پێشان دەدات، کاتێ جوانی و خۆشەویستی ئافرەت بە خەبات و تێکۆشانی گەل و نیشتمانەکەی دەبەستێتەوە و دەڵێ:

**هەرچەند دوورم بەلاَم خۆش بێ خەیاڵم**

**ئـــــاوارە نیم وا دەزانـم لـە ماڵـــــم**

**هــەربینا دێت ڕمــی کۆشکی زۆرداری**

**گـەیشتینە لـــووتکەی چیـای ڕزگاری**

{ تاریك و ڕوون ل ٤٩ }

لەم دەقەدا شاعیر بۆ ساتێکیش خۆشەویستەکەی لەیاد ناچێتەوە و مەلی خەیاڵی تا لای ئەو هەڵدەفڕێ و هیچ کاتێك خۆی بە ئاوارەو دوورە ماڵ نازانێ، چونکە بەخەیاڵ و ئاواتی خۆش و بەرزەوە دەژی و بەڕووخاندنی کۆشکی زۆرداری و ڕزگار بوونی گەلەکەشی گەشبینە.

شیعری ڕۆمانسیزمی شۆڕشگێڕی لە شیعرەکانی محەمەدی نووریدا بەم شێوە و ئاست و پلە و پایە نییە کە لای هێمن دا دەبینرێ. ئەمەش بۆ جیاوازی ئەم بارودۆخە تایبەتیانەوە

---

(١) محەمەدەمین ئەحمەد، هێمن و سکالاَ، گۆڤاری بەیان، ژ ٥١، ١٩٧٩، ل ٢٥.

(٢) د. مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی پێنجەم، دەزگای چاپ و بلاَو کردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥، ل٢٠.

دەگەڕێتەوە کە ئەم شاعیرانە تێیدا ژیاون، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەوە واتای ئەوە نییە. شاعیر لەدانانی ئەم جۆرە شیعرانەدا دەست ڕۆیشتوو نزیك نەبێ. هەروەك لەم بارەیەوە دەڵێ:

**لاوەکان گـــــەر ڕۆح فیداکەن بۆ وەتەن هیشتا کەمە**
**گـــەر بدا ئـــــاوی حەیاتێ دوژمنت، ژەهرە، غەمە**
**خۆشـــــە دەردێکی کـــــە داکی نیشتمانی مـەرهەمە**
**ســـینگەکـــەم قەڵغانی تۆیە، ئەی وەتەن پێشمەرگەمە**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل٢٠}

لەم دەقەدا شاعیر لە چوار چیوەیەکی ڕۆمانسیزمی شۆڕشگێڕانەدا هەستی خۆی دەردەبڕێ و داوا لە لاوان دەکات گیانیان بکەنە قوربانی نیشتمان و بەسەروەت و سامانی دوژمنان فریو نەخۆن. لەهەمان کاتدا سینگی خۆی دەکاتە قەڵغان و حەز دەکات سەربەرزانە بمرێت، نەك بەژێر دەستی بژیت.

### ٢- مەی و مەیخانە:

مەی و مەیخانە لە شیعری شاعیرانی رۆمانسیزمیدا بەڕادەیەکی زۆر بەرچاو دەکەوێ. هەندێ لە شاعیرانی ئەم ڕێبازەش مەی بەکەرستەو هۆکارێکی سەرەکی و گرنگی شیعرەکانی خۆیان دەزانن وەك بابەتێکی سەربەخۆ و کاریگەریش مامەڵەیان لەگەڵ کردووە. ((مەی وەك کێشەی خەیاڵ و کێشەی هەڵهاتن و خودو ویستی و چوونەوە ناو خۆیەکەی ڕۆمانتیك، کارێکی گونجاو و تەواو کەری ژیانەکەیانە، بەڵکو یاریدەدەرێکی بەهێزی بەمەرام گەیشتنیانە)) [(١)]. هێمن یەکێکە لە پێشەنگەکانی ئەو شاعیرانەی کە بابەتی مەی و مەیخانە لە شیعرەکانیدا بە ڕێژەیەکی زۆر دەبینرێ. لەبەر ئەوەی کاتێك هێمن لەناو ئیشقا دەتوێتەوە و سۆزی دووری پەڕ و باڵی دەسووتێنێ و نامۆیی و ماتەم و تراژیدیا باڵ دەکێشێ بەسەر خەون و ئەندێشە بلاوەکانی و ڕوو دەکاتە ساقی و پەنا بۆ مەی دەبات و کە بە هانایەوە بێت. لە تەراوگەی شەوانی تار و درێژ و لە قوولایی دەریای غەم و بێزاریدا دەریبهێنن، چونکە ئەگەر مەیخانە لەلای کەسانی تر شوێنێك بێت بۆ کات بەسەر بردن و یاری و گاڵتەو جەفەنگ. مەیخواردنەوەش تەنیا بۆ چێژ و حەزو ئارەزوو هەوەس بێ. ئەوا لای هێمن مەی و مەیخانە زیاتر لە واتا و مەبەست و ئامانجێك

(١) ئەحمەد سالار، ڕێبازە سەرەکیەکانی ئەدەب و هونەر، ل ١٦٨.

و هۆكارێكی لە پشتەوە بووە. ئەمەش لە ناوەرۆكی ئەم شیعرانەییدا بەڕوونی خۆی دەنوێنێ، كە لە چوارچێوەی بابەتی مەی و مەیخانەدا دەخولێتەوە.هەروەك شاعیر لە شیعری (عیشق و ئازادی) بەم شێوەیە هەست و نەستی خۆی بۆ مەی و ساقی دەردەبڕێ و دەڵێ:

**ئەگەرچی شەو درەنگە ساقی بۆم تێكە كەمێكی تر**

**كـــەوا ئەمشەو سەری هەڵدا لەناخمدا خەمێكی تر**

{ناڵەی جودایی ل ٥٩ }

لەم دەقەدا كاتێ شاعیر غەم و مەینەت و ناخۆشی و ئێش و ئازار یەخەی دەگرن و زۆرداری و كەساسی و هەژاری و نائومێدیش دووچاری شكست و پەككەوتەیی دەكەن، بەناچاری پەنا بۆ ساقی دەبات و دەست بۆ جامی مەی درێژ دەكات. بۆ ئەوەی لە تیونوێتی و ئەشكەنجە و سووتان و تەنیایی ئەم شەوەدا ڕزگار بكات، چونكە بەتەمای ئەوە نییە تا ژەم و شەوێكی تر بژی. بەم شێوەیە هێمن زۆر بە وردی و ڕوونی و جوانی هاندەر و هۆكارەكانی مەستبوون و مەیخواردنەوەی خۆیمان بۆ ڕاڤە دەكات و لە شیعرەكانیدا دەیخاتە ڕوو. هەروەك لە شیعری ((ناسۆری تەشەنا))دا دەیەوێ مەیخواردنەوەكەیمان پێشان بدات بۆیە دەڵێ:

**ئێستا بـــۆ چاری غەمم گۆشەیی مەیخانەیە جێم**

**من كە ڕۆژێك دەمویست میللەتەكەم بێ خەم كەم**

{ تاریك و ڕوون ل١٦١ }

لەم دەقەدا شاعیر بۆ كەم كردنەوەی غەمی دڵی خۆیی، بەهۆی غەمی زۆری میللەتەكەیەوە، ئالوودەی گۆشەی مەیخانە دەبێ، لەوێ نەبێت ئارام ناگرێت. هێمن ڕۆڵەی بە ئەمەكی گەل و نیشتمانەكەی خۆی بووە، بەشێكیش بووە لە ئێش و ئازارەكانی ئەو. بۆیە غەمەكانی هێمن وەك فرمێسكی گەش و چاوی بێ ناز و ژێر دەستەكەی وەك برینی نیشتمانەكەی قووڵ و بە ئازار و گەورەن، كە بەدەستی ڕەشی چەرخی زەمانە و دوژمن و داگیركەرانەوە درووست بووە. لە شیعری ((موونایسێنم)) بەهۆی دووری لە ئازیز و خۆشەویستان و نیشتمانەكەیەوە هاونشین جامی بادە دەبێ و دەڵێ:

**شـــەوانە هاونشینی جـــامی بـــادەم**

**بـــەبادە با بەژارە و غـــەم بـــە بادەم**

**كـــــە دەستی ڕۆژگار بایدا سەری مـــن**

**ســـەری شوشەی شەڕاب واچاكە بـــادەم**

{ تاریك و ڕوون ل١٣٠}

لەم دەقەدا شاعیر کاتێك لە دەرەنگانی شەودا غەم و پەژارە دڵی ئەتەنێ. دەستی تاوان و چەپەڵی ڕۆژگار سەری بادەداو دەیشێوێنێ، لەدەریای ڕەشبین و نائومێدیدا نقوم دەبێ. ڕێی مەیخانە دەگرێتە بەرو دەبێتە هاودەمی بادە و وای بەباش دەزانێ سەری شوشەی شەراب بابدا و خۆی مەست بکات، بۆ چەند ساتێك لە شیوەن و گریان و ناڵەناڵی ژیان خۆی دوور بکاتەوە. چونکە شاعیر پێمان دەڵێ: ((مەی دەرمانی دەردی ئەو کەسانەیە کە خەمیان زۆرە و بێ کەسن و دەردیان کوشندەیە و ماڵ و جێ و ڕێیان لێ تێك چووە، لە پێشدا چارەکەی دیاری دەکا کەمەیە، ئەمجا دەردەکە دەڵێ)) [1]. هەروەك لە شیعری (ناڵەی جودایی)دا ئەم هەست و سۆزەی خۆی بۆ مەی دەردەبڕێ و بەشێوەیەکی ڕۆمانسیزمی گوزارشت لە غەم و ئێش و ئازارەکانی خۆی دەکا و دەڵێ:

**ئـــــەم شــــەڕابە تاڵە بــــۆ بــــێدەرد نییە**
**لێی حەرام بێ ئەوکەسەی ڕەنگ زەرد نییە**
**بـۆکەسێکە مــــەی کـــــــە دەردی کاریە**
**بــــێ خەمێـــــــك بیخواتەوە زۆرداریـــــە**

{ناڵەی جودایی، ل ١٨ — ١٩ }

لەم دەقەدا شاعیر لە خۆشیان نییە کە مەی دەخواتەوەو پەنای بۆ دەبا، بۆیە دەڵێ: (ئەم شەڕابە تاڵە...)واتە مەی خواردنەوە بە شتێکی ناخۆش و تاڵ دەزانی، بەلاّم چی بکات کاتێك ڕەشەبای شوومی خەزان، گوڵی تەمەنی دەژاکێنێ و لە نێو دەرد و مەینەتا دەیتلێنێتەوە. جگە لەوەش پەنجەی تاوان و شەرمەزاری بۆ ئەوانە درێژ دەکات، کە خەمیان نییە و تالاّوی زۆرداریان نەچێشتووە و زوڵم و ئازار و چەوساندنەوە و هەژاری و ئاوارەیی و دەربەدەریان نەدیوە و نەبۆتە نیشانەی تیری غەم و مەینەتیەکانی ژیان و شانیان دانەخزاوە لەبن باری ستەم و زۆرداریدا. بۆیە دەبێ بێنە مەیخانە و مەی بخۆنەوە. وەك دەڵێ:

**ئەوکەسەی نەکرا نیشانەی تیری خەم**
**شـــانی دانەخزا لـــە ژێر باری ستەم**

{ناڵەی جودایی، ل ٢٠}

---

(١) خالید دلێر، هێمن بیر و هەڵوێست و شیعر، چ ١، چاپخانەی دەزگای بلاّوکردنەوەی دیموکراسی، ١٩٩٣، ل ١٣.

دوایی دەڵێ:

**ئەو کەسە جێگای لە مەیخانێ نییە**

**ئـەوکەسە بادە و شەڕابـی بۆچییە**

{ناڵەی جودایی، ل ٢٣ }

لەم دەقەدا شاعیر بەهۆی مەیخواردنەوەی بۆ ئەشکەنجە و ئازاری ژیان و زوڵم و زۆرداری دەگەڕێنێتەوە. سەریشی سووڕدەمینێ لەوانەی بۆ گاڵتە و هەوەس دەست بۆ پێکی مەی درێژ دەکەن. بەم شێوەیە ئەگەر لەسەر خۆو بە ئاسپایی و بە هێمنی بەناخی ئەو شاکارە بەرز و بەهێزەی شیعری ناڵەی جودایی شۆڕببینەوە دەبینین ((ئەو پشوودرێژی و شین و فیغان و ناڵە و دەردە دڵییەی مامۆستا هێمن تێکەڵ بە دەردی ئاوارەیی و دنیای هونەر و جوانپەرستی و مەی کردوە. شینێکە (هێمن) نەبێ کەس نەی کردووە)) [1]. غەم و دەردی زەمانە هێندە دڵڕەق و بێزەییانە ژیانی هێمنیان شێواندوە و بەشێوەیەك لە پەل و پۆیان خستووە و وەکو هەور پێشی ڕۆژ ئازادی و هیواو ئومێدیان پێگرتووە. جگە لەمەی شتێکی تر بەدی ناکات تاکو ببێتە مەرهەم و زامەکانی سارێژ بکات. بۆیە بە ڕیشی بۆزەوە ڕێگای مەیخانە دەگرێتە بەر و دەچێتە مەیخانە و مەست و مەیزەدە دەبێت و، واز لە سۆفی و زاهید دەهێنێ و کونجی خانەقا و خەڵوەت نشینی بەجێدەهێڵێت و دەڵێ:

**سـۆفیی کونجی خانەقا بووم، ئێستە پیری مــــەیکەدەم**

**زاهیدی خەڵوەتنشین بووم، ئێستە مەست و مەی زەدەم**

{ناڵەی جودایی، ل ٤٨ }

لەم دەقەدا شاعیر واز لە سۆفی و زاهیدی دەهێنێ و، خۆی لە مەیخانە دەدۆزێتەوە. وێڕای ئەوەش شاعیر زۆر جار تا ڕادەی ئەو پەڕی لە ژیان و لە کۆمەڵگا و لە خودی خۆشی تووڕە دەبێ و لەڕەشبینی و نائومێدیدا بیر دەکاتەوە، دەیەوێ لەگەڵ مەیدا لە بێئاگایی و سەرخۆشیدا بژی، تا بزانێ ژیانی شێتی و مەستی و نەزانی چۆنەو چ جیاوازیەکی هەیە لەگەڵ ژیری و هۆشیاری و زانین دا، بۆیە لە شیعری (تووڕەیی)دا دەڵێ:

---

(١) سوارە قەڵادزەیی، ((دیالۆگێك لە دیداری (هێمن)ی گەورەدا)) ، گ کاروان، ژ ٢١٣، ل ٣٧.

**حـــاسڵی تێگـــــــەیشتن و زانین**
**چ بوو بۆ من، جگە لە کوێرەوەری؟**
**سەردەمێکیش پەنا دەبەم بۆ مەی**
**تـــا بزانم چلۆنە بـــــێ خەبەری**

{ تاریك و ڕوون ل ١٣١ }

لەم دەقەدا شاعیر بە شێوەی پرسیار ئەوە پێشان دەدات کە لە سایەی هۆشیاری و زانیاریدا جگە لە کوێرەوەری هیچی تری دەست نەکەوتووە. بۆیە حەز دەکا ژیان لەگەڵ مەی و مەستیش تاقی بکاتەوە، تا بزانێ ئەو چۆنە و چی بەسەر دێنێ؟! لەمەش زیاتر، شاعیر مەی بە هۆکارێك دا دەنێت بۆ جووڵانەوەی سەربەست و دەربڕینی بیروبۆچوونی ئازاد. وەك دەڵێ:

**جوانـــــی گوت شۆخی لەبـــاری بادە گێڕ**
**((ئەو کەسەی سەرمەستترە، سەربەسترە))**

{ناڵەی جودایی، ل ١٠٥ }

بەم شێوەیە دەبینین مەی لە لای هێمن پێگەیەکی بەرز و فراوانی هەیە و مەی و مەیخانەش وەك یەکێك لە شەنگەستانی ڕۆمانسیزمی لە شیعرەکانیدا بەکار هێناوە. بەڵام بە پێچەوانەوە مەی و مەیخانە لە شیعرەکانی محەمەدی نووریی شاعیردا بەدی ناکرێت و نرخ و پلە و بایەخێکی ئەوتۆی نییە. ئەوەش بۆ ئەو بارو دۆخ و چوارچێوە ئاینی و کۆمەڵایەتی شاعیر دەگەڕێتەوە کە تێیدا بووە، چونکە محەمەدی نووری کەسێکی ئاییینی بووە و لەم بوارەدا دیار و ناسراو بووە. هەر ئەمەش ڕێگر بووە بۆ ئەوەی لە دەرگای ئەم جۆرە شیعرە بدات.

## تەوەرەی یەكەم

## بایەخی زمانی شیعری لای ئەم شاعیرانە

زمان دیاردەیەكی كۆمەڵایەتیە و هۆیەكە بۆ پەیوەندیكردن و تێگەیشتن و پاڵنەرێكی سەرەكیی گەشەسەند و پێشكەوتنی ڕەوتی ژیان و كاروانی مرۆڤایەتییە. لە هەمان كاتدا تەنیا هێمایەكی ڕووت نییە بۆ گوزارشتكردن و شتە ئاماژەپێكراوەكان، بەڵكو زیندوون و لە جووڵە و گۆڕاندان. جگە لەوەی لایەنێكی بنەڕەتی هەموو شاعیرێكی گەورە و داهێنەرە، هەروەك هەموو شیعرێكی نەمریش بەبێ زمانێكی بەرز لە جوانی و ناسكی و تەڕوپاراوی و ڕەسەنایەتیدا نایەتە دی، چونكە زمانی شیعری لە گرنگترین بنەماكانی داهێنانی شیعرییەو لە دیارترین ئەو سیمایانەشە كە شاعیری پێدەناسرێتەوە. پۆل ڤالیری دەڵێ:

((شیعر زمانە لە مەودای زماندا)) [1]. بۆیە دەتوانین بڵێین زمان ناسنامەی شاعیرە، وەك (ئەلەن تەیت)دەڵێ: ((فەلسەفەی شاعیر هەرچییەك بێت، مەودای واتاكانی هەرچەندە فراوان بێت، لە ڕێگای زمانەكەیەوە دەیناسیتەوە)) [2]. بۆیە شاعیری باش ئەوەیە سەركەوتوو بێت لە هەڵبژاردن و بەكارهێنانی ئەو زمانەی كە پەیامەكەی پێدەگەینتە پەیام وەرگرەكە. ئەرستۆ دەڵێ: ((گەورەترین خەسڵەتی چاكی شیعری ئەوەیە كە ڕوون و ئاشكرابێت بێ ئەوەی سواو بێ)) [3]. ئەمەش جەخت كردنەوەیەكی بەهێزە لەسەر چۆنییەتی گەیاندنەكە و ئاستی قووڵی و ڕاستی و كاریگەریەكەی لەسەر پەیاموەرگرەكە. (((جان كوهین) دەڵێ: زمانی شیعری و دەربڕینی وشە دادەهێنێت نەك فیكر، هەر بۆیە گوتن پێوانەی شاعیرییەتە، نەك بیركردنەوە)) [4].

---

(١) د. عزالدين اسماعيل، الأدب و فنونە، ص ١٣٠.

(٢) محمد كوردۆ، گەڕان بەدوای شیعر و جیاوازیدا، بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بلاوكردنەوەی سلێمانی، ٢٠٠٦، ل ٢١.

(٣) ئەرستۆ، هونەری شیعر، و: عەزیز گەردی، چ گەنج، لەبلاوكردنەوەكانی چاپ و پەخشی ڕێنما، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل ٨٣.

(٤) ئاسۆ عومەرمستەفا، هەمان سەرچاوە، ل ٥٥.

شیللی ((دەربارەی زمان جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە شاعیر پەیوەندییەکی پتەوەی بەزمانەوە هەیەو هەر ئەو دەتوانێ زمان تازە بکاتەوە. وشەکان بوونەوەرێکی جیهانی شیعرن و شیعر بە زیندوویی دەهێڵنەوە))[1]. بەم شێوەیە زمان کەرستەی ئایدیای شاعیر یان نووسەرە، بەرزی و بەهێزی لە ناوەرۆك و واتاداو بێ، هاوتایی لە جوانی و ڕازاوەیی فۆرمدا و پێچەوانەش، پابەندە بە ئاست و پایەکانی دەسەلاتی شاعیر لە بنیاتی شیعردا. چونکە ئەو وشەیەی بەشداری دەکات لە دروستکردنی وێنەیەکی شیعریدا هیچ کاتێك وەکو خۆی نامێنێتەوە. بەڵکو گۆڕانی بەسەردا دێت و دەبێتە بوونەوەرێکی خاوەن گیان و جەستە و بە پێی توانست و لێهاتوویی و ڕۆڵی وەستاکەی، واتا شاعیر یان نووسەرەکە بەرزی و ڕاستی و تەڕو ناسکی و پاراوی کاریگەریەکەی بەدەر دەکەوێت. (هۆراس) دەڵێ: ((هەر بەتەنیا ئەوەندە بەس نییە کە هۆنراوە جوان بێت بەڵکو ئەو هێزە ئەفسانەی تێدا بێت کە ڕۆحی گوێگر ڕاکێشی بەرەو ئەو داخوازیانەی کە ئامانجیەتی))[2]. بۆیە سەرەڕای ئەو هەموو گرنگی و بایەخەی زمانی شیعری هەیەتی ((پێویستە زمان وەك ئامرازێك (وسیلە) نەك ئامانج مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ لەنێو هۆنراوەدا. چونکە زمان ئەگەر بووە ئامانجی هۆنراوەکە ئەوسا هۆنراوەکە وێنە بابەتیەکەی دەبێتە قاوغێکی زمانەوانی بارگران بەسەر پەیامەوەرگرەکە)) [3].

شاعیرە ڕۆمانسیزمیەکان بە پێچەوانەی کلاسیکیەکان، لەبەکارهێنانی زمانی شیعریدا بەڕادەیەکی یەکجار زۆر وشەی سادەو تەڕو پاراو و ڕەسەنی کوردی بەکار دەهێنن و، گرنگیی زۆری پێدەدەن، بەئازادییەکی ڕەهاو فراوانەوەش گوزارشت لە ناخی خۆیان دەکەن و، خۆیان بە کۆت و بەندەکانی کێش و سەروا و دەستوورەکانی شیعری نابەستنەوە. بەمەش توانیویانە تا ئاستێکی بەرزی داهێنان و گۆڕانکاری لە هەردوو لایەنی ڕووخسار و ناوەرۆکی شیعریدا بکەن، واتە شاعیر ڕۆڵێکی گەورە دەبینێ لە زیندوویەتی و واتابەخشی و ڕەنگ و بۆی ئەو وشانەی لە زمانی شیعریەکەیەوە خۆی دەنوێنێ، ئەمەش ئەوە پیشان دەدات کە (لە زمانی

---

(١) د. هیمداد حوسێن، هەمان سەرچاوە، ل ٩٥.

(٢) محسن ئاوارە، لەژێر ساباتی شیعردا، گ ڕامان، ژ٦٦، ساڵی ٢٠٠١، ل ١٣.

(٣) عدل مەجید محمەد گەرمیانی، وێنەی بابەتی لە هۆنراوەکانی گۆران و سەیابدا، نامەی دکتۆرا، کۆلێژی پەروەردە (ئیبن روشد)، زانکۆی بەغدا، ٢٠٠٠، ل ٧٩.

شیعری، ڕۆڵی زمان، بۆ بەکارهێنانێکی تر دەگۆڕێت، ئەویش بەکارهێنانی هونەریە)[1]. بۆیە (شاعیری گەورە بەدوای ڕەوتی زمانەکەوە ناڕوات بەڵکو بەردەوام پێشی دەکەوێت، وشەی نوێ و دەربڕینی نوێی پێ دەبەخشێت و زمانەکە دەوڵەمەند و جوانتر دەکات)[2]. بێگومان زمان هەرگیز نەیتوانیوە بەتەواوەتی گوزارشت لە ناوەوەی مرۆڤ بکات یان سەد لە سەد ڕەنگدانەوەی ئەم هەست و نەست و سۆزە بێت کە لە ناخی مرۆڤدا پەنگی خواردۆتەوە ((هەڵبەت زمان لە ئاست کەفوکوڵی ناخی مرۆڤدا کورتی هێناوە و نەگەیشتۆتە ڕادەی ئەو ترۆپکە بیرۆکانەی کە لە پەنجەرەی هزری نووسەرەوە چەخماخە دەدەن، گەورەترین شاکار لە ڕووی خودی بۆچوونەکانی نووسەرەکە هێشتا ماویەتی، ڕەنگە بەراورد لە نێوان ویستی خاوەن ئەو شاکارانەو ئەو شتانەی کە هەوڵیان داوە تەتەڵەی بکەن و بیڵێن. بەڵام دەستیان یاخود زمانیان بەسەر دانەشکاوە، بەراوردێکی ناهەق بێت، دیستۆفیسکی قەت بەسەر زاریدا نەهاتووە، بڵێت هەرچییەك نووسیومە ئاوێنەی دەروونمە و پڕ بەدڵی خۆمە)) [3].

وەك گۆران دەڵێت:

**هـــەرچەند ئەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم**
**بـــۆم ناخرێتە نــاو چوارچێوەی هەڵبەستم[4]**

هەرچۆنێك بێت شاعیرانی ڕۆمانسیزم تا ڕادەیەکی زۆر توانیویانە بە وشەی تەڕ و پاراو و ناسك وێنەی ناوەوەی خۆیان بکێشن و ڕەنگڕێژی بکەن. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو زمانە سادە و ساکارەی شاعیران لە بنیادی شیعرەکانیاندا بەکاریان هێناوە. ((شاعیری کورد، بۆ پەیداکردنی وشەی کوردی ڕەسەن، لە شیعری پێشوودا بەکار نەهاتووە، سەری کردە سەر سامانی ئەدەبی فۆلکلۆری و چونە ناو خەڵك بۆ ئەوەی لە وشەو قسەی ڕۆژانەوە سامانێکی گەورەی تازە پەیدا بکات و لەناو شیعری کوردیدا زیندوویی و جوانی بەو وشانە ببەخشن))[5].

---

(١) پەخشان عەلی ئەحمەد، شێوازی شیعری گۆران، نامەی ماستەر، کۆلیژی زمان، زانکۆی کۆیە، ٢٠٠٧، ل ١٦٦.

(٢) ئەکرەم قەرەداغی، زمان لە شیعری نوێدا، گ ئایینده، ژ ٦٥، ٢٠٠٦، ل ٥٥

(٣) کەریم دەشتی، ئەدەب و فەلسەفە، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، هەولێر، ٢٠٠٤، ل٤٥٦.

(٤) گۆران، دیوانی گۆران، ل ١٢١.

(٥) عیزەدین مستەفا ڕەسول، شیعری تازەی کوردی، گ ڕۆشنبیری نوێ، ژ ١٠٥، ١٩٨٥، ل ٢٠٠.

زمانی شیعریش لە لای هەردوو شاعیر (هێمن و محەمەدی نوریش)دا بە پێی ئەم کات و قۆناغەی پێیدا تێپەڕیوون، گەشەی کردووەو پێش کەوتووە. ئەم دوو شاعیرە توانیویانە بەزمانێکی ڕۆمانسیزمیانە بارێکی شیعری تازە بێننە کایەوە. زمانی شیعری ئەم شاعیرانە زمانی گوزارشتکردنە لە خودو زمانی سادە و ساکاری خەڵکی لادێ ، ناسك و تەڕ و پاراو و ڕەسەنی کوردەوارییە. هێمنی شاعیر ((بەشێوەیەکی زۆر شارەزا و سادە و ساکار شیعری نووسیوە و لە وشەی هەرە ڕەسەنی کوردی کەڵکی وەرگرتووە)) [1].

جگە لەوەش شاعیر هەوڵی داوە شیعرەکانی بە وشەی سادە و تەڕ و پاراوی کوردی برازێنێتەوە. تا بتوانی بەم هۆیەوە بە ئاسانی پەیامەکەی بە گوێی پەیامەوەرگرەوە بگەیەنێ و لەلایەکی ترەوە تا بتوانی شیعرەکانی بکاتە فەرهەنگێکی فراوان و دەوڵەمەندی وشەی ڕەسەنی کوردی و بەرەو ئاستێکی گەش و زیندوو و پێشکەوتووی ببات. هەروەك لە شیعری (یادگاری شیرین))دا دەڵێ:

**گوارەکەی زێڕت بەکار نایە لە گوێی بگرە قسەم**

**لایقی گــوێی تۆ عەزیزم شیعری سادەی هێمنە**

{ تاریك و ڕوون ل ٧٢ }

عەبدولڕەحمان قاسملو لە پێشەکیی تاریك و ڕووندا دەڵێ ((زمانی هێمن زمانی کوردیی پەتی و جوانە، نە پڕە لە وشەی بێگانە، نە وشەی دەستکردی تێدایە، زمانەکەی زمانی خەڵکی کوردستانە. (بەهاری کوردستان) فەرهەنگێکی بچووکی زمانی کوردییە)) [2]. شاعیر خاوەنی ئەزمونێکی گەورە و بەنرخ و گرنگی زمانی شیعریە. واتە زمانی شیعری ئەو زمانێکی هێمنانەیە و خەسڵەت و تایبەتمەندیەتی خۆی هەیە، لەم بوارەدا دەگمەن و بێ هاوتایە چونکە ((هێمن لە بەکار هێنانی وشەی کوردی و زاراوەی خۆماڵی و ئیدیۆم و دەستەواژەی کوردیدا، مامۆستایەکی کەموێنەیە هەر ئەوەشە کە نووسراوەکانی شیرین و

---

(١) ئیبراهیم ئیسماعیل پور، هێمن شاعیری عیشق و ئازادی، گ مهاباد، ساڵی چوارەم، ژ ٤٥، سەرماوەزی ١٣٨٣، ل ٢٣.

(٢) هێمن، تاریك و ڕوون، ل م.

دڵگیر کردووە و لەبەکارهێنانی وشەی زاراوەی نامۆ و داتاشراو بەتەواوی خۆی پاراستووە))[1].

ئەگەر گەشتێك بەنێو گوڵزاری شیعرەکانی هێمندا بکەین دەبینین ((ئەو زمانەی کە شاعیر شیعری پێدەڵێت کوردییەکی پاراوی خۆماڵییە، کوردییەك کە نە دروست کراوە نە داتاشراوە. بەڵکو کوردییەکە بە هەموو واتایەکی وشەوە ڕەسەن و خۆماڵییە. ئەوەتا شاعیر ئەو وشە کوردییە خۆماڵیانەی لە لا شیرینترە لە خونچەی لێوی دڵدارەکەی)) [2]. بۆیە لە شیعری (فریشتەی پەڕیوە)دا دەڵێ:

**بـــەڵێ تۆ کیژی، نازداری، لـــەباری**
**منـــیش پیرێـــکی زۆرهان و دزێوم**
**بـــــەلاّم شیرینترە لـەو شەکرە لێوە**
**وشەی کوردی کە هەڵدەڕژێ لە لێوم**

{ تاریك و ڕوون ل ١٩٣ }

هێمن لەگەڵ ئەوەی خەڵکی لادێ بووە و بەزمانێکی سادە و ساکاری لادێیی شیعرەکانی نووسیوە بە ڕواڵەت سادەن، بەلاّم کاتێ دەیخوێنیتەوە، خوێندنەوەی تری بەدوا دێت و بەشێوەیەکی سەرسووڕهێنەر و ئەفسوناوی و سیحراوی خۆی دەنوێنێ، چونکە ((زمانی نووسینی هێمن زەریایەکی بەرینە کە مەلەوانێکی شارەزای دەوێت، تا گەوهەرە شاردراوەکانی بدۆزێتەوە)) [3].

ئەمەش لە شیعری ((یادگاری شیرین))دا بەئاشکرا بەدی دەکرێت کە دەڵێ:

**چـــاوەکەم! چـاوی ڕەشی تــــۆ ئافەتی گیانی منــە**
**گیـانەکەم! بــــرژانگی تیژت نـــووکە ڕمبی دوژمنە**
**شێری دەســتی شێری ئـــالاّیە برۆ ڕاکشاوەکـــــەت**
**جـەرگی لاوێکی هەژاری کــــوردی ورد پـــێ بنجنە**
دیــدەکەی بــەخوماری تــــۆ تورکانە بەدمەستی دەکا

---

(١) مستەفا مەعروفی، یادێك لە مامۆستا هێمن، ڕۆژنامەی کوردستان، ژ ١٥٨، ٢١ مای ١٩٩٨، ل ٣.

(٢) بورهان شاسوار، هێمن مەهابادی شاعیرە ئاوارەکە کوردستان، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ ٢٢٠، ١٩٧٤، ل٢.

(٣) کۆسار فەتاحی، ئاوڕێك بۆ سەر پەخشانەکانی هێمن، گ ڕامان، ژ ١٧، تشرینی دووەم، ١٩٩٧، ل ٢٠.

بـــۆیه مـــەیلی وا بەکێشه و فیتنــــه و خـوێن ڕشتنه
**بـــەژنەکەت سێدارەیە، کـــــەزیەت تەنافە زووبە دەی**
**بیخە ئـەستۆی من کە کوردم، کـــورد بەشی خنکاندنە**

{ تاریك و ڕوون ل ٦٩ }

لێرەدا هەرکەسێ جوان لەو شیعرە وردبێتەوە و لەسەرەخۆ بەناوی شۆڕبێتەوە بێگومانم لەوەی کەزیاتر لە واتایەکی لا گەلاڵە دەبێت و زۆرتریش لە پرسیارێك سەرنجی ڕادەکێشێ. چونکە شیعرەکانی هێمن زۆربەیان خاوەنی خەسڵەت و تایبەتمەندیەکن کە لەلای شاعیرانی تر کەمە ئەویش ئەوەیە کە شیعرەکانیان دوو دیوی هەیەو بە گەلێك ڕەنگ خۆیان دەنوێنن و چەندەها خوێندنەوەیان بۆ دەکرێت. لەو شیعرەدا دیوی یەکەم بریتیە لە وێنەی کچێك بەتیری برژانگی چاوەکانی و بەتیری ئەبرۆی جەرگی لاوێکی کورد لەت لەت و ئەنجن بە ئەنجن دەکات، بەلاّم دیوی دووەم مەبەستی چەوساندنەوەو کوشتن و بڕینی لاوی کوردە لە ژێر ئەو ئالاّیەی کە وێنەی شێرێکی تێدایە شیرێکی بەدەستەوە گرتووە، کە ئالاّی شای ئێران بووە. پاشان باسی فیتنە و خوێنڕشتن و بەدڕەفتاری و خراپیی تورکەکان بەرامبەر بە کورد دەکات، بەم شێوەیە شاعیر ڕۆمانسیزمیانە بیری کردۆتەوە و تەسکبین و ڕەشبین بووە بەرامبەر ژیان، بۆیە قەد و بەژنی یارەکەی بە سێدارە و کەزی و زوڵفی بەتەنافی خنکاندن چوواندووە.

بەم شێوەیە هێمنی شاعیر ((زمانی داڕشتنی ڕۆمانسیانەیە و تەکنیکی سەرکەوتوانەیە. ئەگەر بەسەبکی شیعری درێژیش نووسیبێتی، توانیویەتی نێوەرۆکێکی هونەریی دەوڵەمەندی وەك داهێنان بەبەردا بکات و بیکاتە ڕۆحێکی زیندوو و مەزن بۆ دەقە شیعرییەکە)) [(١)].
هێمن فەرهەنگێکی گەورە و دەوڵەمەند و پڕ بایەخی زمانی کوردیە. لە دووتوێی شیعرەکانیدا سەدان وشەی جوان و ناسك و زیندوو و ڕەسەنی کوردی بەخۆوە گرتووە. هەندێ لەم وشانە تایبەتن بە شاعیرەوە، مۆرکی شاعیریان پێوە دیارە. چونکە هێمن لەم بوارەدا خاوەن ئەزموونێکی گەورە و فراوان بووە. توانیویەتی زیرەکانە سوود لە کەلتوور و مێژووی نەتەوەکەی وەربگرێ و زمانی شیعری خۆی پێ ببووژێنێتەوە بۆ هەمیشەیی بەرزی و نەمری پێ ببخشێت. ئەمەش بۆ ئەم هەمووهەوڵ و ماندووبوون و بەتەنەگەوە هاتنەی شاعیر دەگەڕێتەوە کە لە بواری خزمەت کردنی زمانەکەی کردوویەتی. هەروەك شاعیر لەم بارەیەوە

---

(١) سوارە قەلاّدزەیی، دیالۆگێك لە دیداری (هێمن)ی گەورەدا، ل ٣٤.

دەڵێ: ((من بێچووە لادیی بووم و، زانیومە ئەو وشەیە خەڵکی نەخوێندەوار لە لادێدا چۆنی بەکار دێنن، وەختێکی من لە لادێدا دەژیام زیاتر شیعرەکانی خۆم لە پێشدا بۆ پیرێژنێك دەخوێندەوە، تا بۆ ڕۆشنبیرێکی بخوێنمەوە، بزانم زمانەکەم چاك پێکەوە هاتووە، یان نە)) [1].

شاعیر بەشێوەیەکی لێهاتوو وەستایانە مامەڵە لەگەڵ وشەکان دەکات و لە دارِشتن و بنیاتی شیعرەکانیدا پشت بە زمانی سادەو ساکاری لادێ دەبەستێت و وێنەی شیعرەکانیشی لە دیمەنە جوان و سەرنجڕاکێشەکانی سروشتی لادێیەکانی کوردستان هەڵهێنجاوە. ئەمەش لە شیعری (بەهاری کوردستان)دا بە ڕوونی دەردەکەوێت کە دەڵێ:

**کـــابانی قۆڵ بــــەبازن**
**شـەنگەبێریی کێل گەردن**
**لـــەنێومــەڕ دێن و دەچن**
**وەك پــۆلی پـــۆڕان دەچن**

{ تاریك و ڕوون ل ١١٠ }

شاعیر لەم شیعرەدا هەروەکو دەردەکەوێت بەزمانێکی سادەو ڕەوان و بێ تەم و مژ وەسفی ژیانی لادێمان بۆ دەکات لە دانان و ڕێز بەندی وشەشدا هونەرمەندانە بووە و زۆری لە خۆی نەکردووە، وێڕای ئەمەش شاعیر وەستایانە بنیاتی شیعرەکانی دارِشتووە و بەشێوەیەکی زۆر لێهاتوو و زیرەکانە مامەڵەی لەگەڵ وشەدا کردووە. زانیویەتی وشەکان چۆن بەکاربێنێ و بە چ شێوازێك جوانی و قۆڵی و ڕاستی و نەمری و کاریگەری بەخۆوە دەگرن. بەم شێوەیە شاعیر خاوەنی زمانی شیعری سەربەخۆ و تایبەتی خۆیەتی و، زمانێکی (هێمن)انەی هەیەو جوداکاری و داهێنان و ئەفراندنی پێوە دیارەو لە جوانی و ناسکی و قۆڵی و ڕاستی و کاریگەریش دا بێ هاوتایە. لەبواری زمانەوانیش زۆر شارەزا و سوار چاك بووە، بەتایبەتی لە زمان و ئەدەبیاتی فارسی کەڵکی زۆری وەرگرتووە. لەهەمان کاتدا کەمێ شارەزایی زمانی عەرەبیش بووە. بەڵام سەبارەت بە زمانی زگماکی خۆی، ئەوا مامۆستایەکی زیرەك بووە و شوێن پەنجەی دیارە.

هەروەکو لە شیعری ((بەهاری کوردستان))دا ڕاستیی ئەم قسەیەمان بۆ دەردەکەوێ. وەك دەڵێ:

---

(١) هێمن، چەپکێ گوڵ و چەپکێ نێرگز، ل ١٢٢.

**لەکن کــارژیلەو بــەرخەل**
**لـــــەکن بزن و مەڕی شەل**
**کـە بۆیان هەڵکەویٚ هــەل**
**کــچ و کوڕ دەکەن هــەمزەل**

*** ***

**کیژۆڵەی شـۆخی جوان چاك**
**شـــۆڕەژنــی داویٚـــن پاك**
**ڕوو هـــەڵمالآو و بـێ بـاك**
**دەڕەتــــێنـــن زاوومــاك**

*** ***

**فیتەی شوان و ئۆحەی گاوان**
**دیٚ لـە مۆڵـــگەو دەراوان**
**دیٚتـــە گـویٚ لاوکـی لاوان**
**بـــالـۆرەی بــەڵـەك چاوان**

*** ***

**منداڵ لـــــە ڕۆد وهە ڵدیٚر**
**بـــــەردەدەنەوە تـــــاویٚر**
**تـێی تـووڕانـدووە لـە بلویٚر** { تاریك و ڕوون ل ١٠٨}

زمانی شیعری محەمەدی نووری شاعیریش ناسك و تەڕ و پاراو بووە و مۆرکی ڕەسەنایەتی و کوردەواریی پێوە دیارە، چونکە شاعیر هەوڵی داوە بۆ دەوڵەمەندکردنی زمانەکەی سوود لە کەلتوور و مێژووی نەتەوەکەی وەربگرێت. بەتایبەتی لەو زمانەی کە خەڵکی لادیٚ بەکاری دەهێنن. بەمەش شاعیر توانیویەتی ببێتە فەرهەنگێکی گەورە لەزمانی سادە و ساکاری لادیٚ و لەوشەی بێگانە پاکی بکاتەوە جگە لەوەی لەڕێگای شیعرەکانییەوە خزمەتێکی گەورەشی بە زمانی کوردی کردووە. ئەمەش لە شیعری (ئەمن و پەپولە) بەزەقی دەردەکەوێت کە دەڵێ:-

**خـــــەونە، خەیاڵە، ژین بەبێ ئەوین**
**ژینن، ئەوینن، شینکەی سەر زەوین**

**پـــــەپوولەی زانـــــای کوێرەڕێی ژیان**
**شـــــارەزای هەردی هەرێمی نەمـــــان**
**ئـــەتۆ شەم و شەو، شۆر و شەیدایـــی**
**ئەمن و بێ دە نگی، غەم و تەنیایی**
**کاتـــــی ئێـــــوارە کۆتـــــایی کارە**
**شـــــەم وەکـــو شەوان چاوەڕێی یـــارە**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل٥٥}

محەمەدی نووری شاعیر وەك لە یاداشتەکانیدا هاتووە و دەردەکەوێت شارەزاییەکی زۆر باشی لە زمانی فارسی و عەرەبیدا هەبووە و کەڵکی زۆری لێ وەرگرتوون و بەتایبەتی لە زمان و ئەدەبیاتی فارسیدا ئەمە جگە لەوەی زمانی کوردیی کە زمانی دایکییەتی زۆرباش زانیوە و وەستایەتی تێدا نواندووە. هەروەها محەمەدی نووری شاعیر زۆر تامەزرۆی وشەی شیرینی کوردی بووە و بەحەز و ئارەزوویەکی گەورە و زۆر بە پەرۆشەوە گرفتاری وشەی ڕەسەن و جوان و بە پیرۆزی کوردی بووەو بە چاوێکی پیرۆزەوە تێڕوانیوە و گرنگی و بایەخی پێداوە و بەشێوەیەکی وەستایانە لە شیعرەکانیدا بەکاری هێناوە. بەرادەیەك هەوڵێکی زۆری داوە بۆ ئەوەی وشەکان بە پێی پێویست و لە جێگاو شوێنی خۆیاندا بەکار بهێنێت و بەتەواوی ئامانجی خۆیان بپێکن. شاعیر گەلێ وشەی جوان و وەهای لە شیعرەکانی بەکار هێناوە کە تا بڵێی وشەی دەگمەن و ڕەسەنن. بەمەش شاعیر توانیویەتی زمانی کوردی ببووژێنێتەوە بە پێی توانا خزمەتی بکات. بەشێکی زۆر لەو وشە و زاراوانەی کە شاعیر لە شیعرەکانیدا بەکاری هێناون، بە سەرچاوەی ڕەسەنایەتی زمانی ستاندەری کوردی دادەنرێت، چونکە شاعیر هەمیشە لە بەکارهێنانی وشەی بێگانە تا ڕادەیەکی باش خۆی پاراستووە، نەی ویستووە بیکات. بەڵکو بە پێچەوانەوە هەموو هەوڵێکی بۆ ئەوە بووە خزمەتی زمانەکەی بکات لە لاوازبوون و فەوتان بیپارێزێ، ئەمەش ڕاستگۆیی و دڵسۆزی و نیشتمانپەروەریی شاعیر پێشان دەدات بەرامبەر گەل و نیشتمانەکەی. لەهەمان کاتدا جوان و ناسکی و تەڕ و پاراوی و ڕەسەنایەتیی وشەو زمانی شیعری لای شاعیر دیاردەیەکی زەقە و نەمری بە شیعرەکانی بەخشیوە. جگە لەمەش شاعیر زمانی شیعری خۆی لە زمانی ڕۆژانەی خەڵکەوە وەرگرتووە، ئەمەش پەیڕەوێکی شاعیرانی ڕۆمانسیزمە. وەك لە شیعری (بۆ سەر کێلی مەزارم) دەردەکەوێت و دەڵێ:

**خـــوا گیان باش ئەزانی هەست و خوستم**
**هــەڵەی هەنگاوەکەم، ویستی دروســـــتم**
**بــــەپێی نووسراوی پێنووسی ئــەزەل بوو**
**ئــــەوەی زانیم، ئــــــەوەی ڕوانیم و بیستم**
**لــە گــــــەردەلوولی گێژاوی زەمـــــان دا**
**لــە خوار و خێچی هەنگاوی ژیـــــان دا**
**دڵ و مێشکم بەکام زانســت پەرەی گرت**
**لــەویستی تــۆ بەدەر، کێ منی تــەکان دا**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل١٤}

بەم شێوەیە هەریەکە لە هێمن و محەمەدی نووری خاوەنی زمانێکی شیعری تایبەتی خۆیانن و بەهۆی تەڕ و پاراوی و جوانی و ناسکی و ڕەسەنایەتیی زمانی شیعریان، توانیویانە ئێستاتیکیەت و زیندوویەتی و نەمری بە شیعرەکانیان ببەخشن بەتایبەتی لە لای هێمنی شاعیردا گەیشتۆتە ترۆپك و لە ئاستی جوداکاری و تازەگەری و داهێناندا خۆی دەدۆزێتەوە و بەشێوەیەك شاعیر پێی دەناسرێتەوە.

## تەوەری دووەم

## بایەخی مۆسیقای شیعری لای ئەم شاعیرانە

مۆسیقای شیعری بنەمایەكی هونەریی گرینگە لە شێوازی شیعریدا، چونكە مۆسیقا كاریگەریی بەسەر هەستی بیستنی مرۆڤەوە هەیە. تەنانەت ڕادەی ناسكی گوێبیستنی شیعری لای هەندێ مرۆڤ بەشێوەیەكی زۆر بەجوانی لەگەڵ ترپەو ئاوازی مۆسیقای شیعرەكە تووشی هەڵچوونی دەروونی دەبێت. هەرچەندە شاعیر خاوەنی هەستێكی بەرز بێ لە پێشكەش كردنی مۆسیقای دەرەوەی شیعر، ئەوەندە زیاتر كاریگەری خۆی دەبێت، چونكە مۆسیقای شیعری ڕۆڵی تایبەتی خۆی هەیە لە چێش بەخشینی شیعردا. جگە لەوەش شیعر بەبێ مۆسیقا كاریگەریی هەڵچوونی دەروونی لەدەست خۆی دەدات. لەهەمان كاتدا بیستنی مۆسیقای شیعری، جۆرە هەستێكی ناسك لای گوێگری شیعر یان خوێنەرەكەی دروست دەكات. ئەمەش هەریەكە لە مۆسیقای دەرەوەو ناوەوەی شیعر ڕۆڵی خۆی تێدا دەبینێ ((بەلای (كامیل ژیر)ەوە مۆسیقا و ئاوازی شیعر سەرجەم بڕگەكانی ناو هەنگاوەكان دروستی دەكەن، نەكو بڕگەی كورت و درێژەكان بەتەنیا، بەلاٌم لەبەر ئەوەی لە كێشی خۆماڵیدا هەموو بڕگەكانی ناو هەنگاوەكان لە كورتی و درێژیدا وەك یەكتر نین، مۆسیقای شیعرەكەش بەلای ئەوەوە كاتێ دروست دەبێت، ئەگەر بڕگەكان وێڕاییەكێتی ژمارەیان چەندێتیشیان وەكو یەكتر بێت)) [1]. هەر لەپاڵ ئەمانەشدا ((مۆسیقاش هەستكردنی خوێنەر یان گوێگرە بەو ئاوازانەی كە دەنگەكانی وشەكان و جۆری هەست و سۆزی دەروون و مانای وشەكان. لە ئەنجامی ترپەی بڕگەكان و پێكهاتنی پییەكاندا بە كێشی هەڵبەستەكەی دەدات)) [2]. مۆسیقای شیعریش لە دوو بەش پێك هاتووە كە ئەمانەن:

---

(١) د. محەمەد بكر، كێش و ڕیتمی شعری فۆلكلاۆری كوردی، دەزگاو چاپ و بلاو كردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤، ل ٢١.

(٢) عبدالرزاق بیمار، كێش و مۆسیقای هەڵبەستی كوردی، چ ١، چاپخانەی (دار الحریە)، بغدا، ١٩٩٢، ل ١.

### ١- مۆسیقای دەرەوەی شیعر:

شتێکی ئاشکرایە مۆسیقای دەرەوەی شیعر وەك مۆسیقای ناوەوەی شیعر نییە، تەنانەت دەتوانین بڵێین هەستی بینین لە پاڵ هەستی بیستندا کاریگەری خۆی هەیە. چونکە شیعرەکە لەڕێی چاوەوە دەخوێندرێتەوە و لە ڕێی گوێوە دەبیسترێ. مۆسیقای دەرەوەی شیعریش زیاتر لەڕێی جۆری کێش و سەرواوە دیاری دەکرێت، چونکە شاعیر لە هەردوو شیعری کلاسیکی و نوێدا پابەندە بە پیڕەوی کردنی کێش و سەروا لەنێو شیعرەکەیدا. جا ئەگەر شاعیری کلاسیکی پابەند بووبێ بە پەیڕەو کردنییەك جۆرە کێش و یەك جۆرە سەروا لەسەرجەم بەیتەکانی شیعرەکەیدا، ئەوا شاعیری هاوچەرخ ئازادە لە هەڵبژاردنی چەند جۆرە کێش و سەروایەك لە نێو دێڕەکانی شیعرەکەیدا. ئەم جۆرە هەمە چەشنی کێش و سەروای شیعرەکە جۆرە مۆسیقایەکی دەرەوەی هەمە چەشنی پێ دەبەخشرێت و لەئەنجامدا شیعرەکە هەندێ بەئاسانی لەبەر دەکرێت. لێرەدا سەبارەت بە کێشی عەرووزی عەرەبی، خەلیل کوری ئەحمەدی فەراهیدی پازدە دەریای کێشی دەستنیشان کرد. (ئەخفەش) دەریای شازدەهەمی دەستنشان کرد. فەراهیدی لەم بوارەدا دانی بەوەدا ناوە، شیعری عەرەبی پێش ئەوەی دەریاکانی دەستنیشان بکرێت، لە ڕووی کێش و دەریاکانی شیعردا ڕاست و درووست بوونە. هەروەك لەم بارەویەوە دەڵێ: ((قد كان شعر الورى صحيحاً...من قبل أن يولد الخليلُ)) [1]. لە شیعری کلاسیکیدا سەرجەم بەیتەکانی شیعرەکە خاوەنی یەك سەروا بوو، بەڵام لە شیعری هاوچەرخدا ئەم کێشەیە نییە. ئەمەش کێشەیەك بوو بۆ ئەوانەی ئەم جۆرە شیعرەیان دەنوسی. چونکە خاوەنی کێش و سەروای هەمەچەشنە کە ئەمەش کاریگەریی خۆی هەیە، لە دروستکردنی مۆسیقای دەرەوەی شیعر. وەك کێش و سەروا:

#### أ- کێش:

کێش یەکێکە لە ڕەگەزە گرنگەکانی شیعرو لەپاڵ سەروادا مۆسیقای دەرەوەی شیعر پێك دەهێنن. بۆیە هەر شیعرێك بێ کێش بێت، بوونی خۆی لە دەست دەدات. هەرچەند کێش شان بەشانی سەروا تاڕادەیەکی زۆر هەست و نەست و بیری شاعیر کۆت و بەند دەکات و ناهێڵێت

(١) کامەڕان موکری، عەرووز، محازەراتەکانی بەشی کوردی زانکۆی سەلاحەدین، گ ڕامان، ژ ١١٣، ٥ / ١٠ / ٢٠٠٦، ل ٥٥.

بەشێوەیەكی ڕەها گوزارشت لە ناخی خۆی بكات. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا ئاوازێكی جوان و ڕازاوەی بەرز بە شیعرەكە دەبەخشیّ و نرخ و بەهای بەرز دەكاتەوە و زیاتر كار لە خوێنەر دەكات و دەیوروژێنیّ، چونكە ((كێش و ترپە و مۆسیقا بنەمایەكن لە بنەماكانی هەڵبەست. بەیەكەوە پەیوەندی دارن و بوونیان پێكەوە پێویستە و نەبوونی هەریەكێكیان كەم و كوڕیەك بە لەش و واتایی و شێوەو ڕووخساری هەڵبەست دەدات، كێش بریتیە لەسەرجەمی ئەو پیّ یانەی دێڕە هەڵبەستێك درووست دەكەن، كە لە عەرەبیدا تەفعیلەی پیّ دەڵێن)) [1].

لە شیعری كوردیدا كێشەكانی عەرووز و خۆماڵی و ئازاد بەرچاو دەكەون. هەرچەندە كێشی خۆماڵی ڕووبەرێكی گەورەو فراوانی داگیر كردووە. بەلاّم كێشی عەرووزیش بەهەمان شێوە ڕۆڵێكی بەرچاوی بینیووە، عەلائەدین سەجادی دەڵیّ: ((گوایا هۆنراوە دوور كەوتۆتەوە لە عەرووز، بەڵیّ دوور كەوتۆتەوە، بەلاّم ناكریّ بڵێی لێی بیّ بەشە، وەك ناشتوانریّ ئەو هۆنراوانە كەلەسەر عەرووز دەڕۆن، بیّ بەشن لە ژمارەی پەنجە)) [2]. بۆیە دەبینین كێشی عەرووز لە شیعری كوردیدا بەڕادەیەكی زۆر بەدی دەكرێت. تەنانەت لای شاعیرانی ڕۆمانسیزم و نوێخوازەكانیش بەتایبەتی كێشەكانی هەزەج و ڕەمەل. چونكە ئەو كێشانە سوك و ئاوازدارن و لەگەڵ خەسڵەتی شیعری كوردیدا دەگونجێت. د. عەزیز گەردی زیاتر بەلای كێشی هەزەجەوە دەچیّ و دەڵیّ : ((ئەم كێشە لە كێشە هەرە باو و بلاّوەكانە لە شیعری كوردیدا، ڕەنگە هۆی بلاّویش لە كوردیدا ئەوە بیّ كە لەگەڵ خەسڵەتی دەنگی زمانی كوردیدا دەگونجیّ)) [3]. هەرچەندە ئەم گونجانە سەد لە سەد و لەهەموو دەریاكانی كێشی عەرووزدا نییە. بۆیە د. عیزەدین مستەفا لەو بڕوایەدایە كە ((دوا ڕا ئەوەیە كە عەرووزی عەرەبی كت و مت لە كوردیدا نییە)) [4]. هەرچۆنێك بێت كێشی عەرووز لە شیعری كوردیدا سیمایەكی دیار و زەقی هەیە. هەریەكە لە هێمن و محەمەدی نوریش لە پاڵ كێشی خۆماڵیدا، بەڕادەیەكی زۆر بەكاریان هێناوە. د. عەزیز گەردی لە كتێبی ((رابەری كێشی شیعری كلاسیكی كوردی))دا

---

(١) عبدالرزاق بیمار، كێش و مۆسیقای هەڵبەستی كوردی، ل ١٠.

(٢) عەلائەدین سجادی، نرخ شناسی، چاپخانەی معارف، بەغدا، ١٩٧٠، ل ٩٩.

(٣) عەزیز گەردی، كێشی شیعری كلاسیكی كوردی، نامەی ماستەر، زانكۆی سەلاّحەدین، ١٩٩٤، ل ١٤٥ – ١٤٦.

(٤) عبدالرزاق بیمار، هەمان سەرچاوە، ل ٢٦.

زۆر بە ڕوونی و ووردی بەنموونەو ئامار کێشی شیعری (هێمن)ی خستۆتە ڕوو، پێی وایە کە هێمن (٦٥) شیعری لەسەر کێشی عەرووز داناوە کە (٣٢) شیعریان لەسەر کێشی هەزەجەو (٢٤) شیعریان ڕەمەلە و (١٩) شیعرەکانی تر لەسەر کێشی خەفیفە. بەم شێوەیە ئەم شیعرانەی کەلەسەر کێشی هەزەج نوسراون ڕێژەی (٤٩،٢٣ ٪)لەو شیعرانە پێك دەهێنێ کە لەسەر کێشی عەرووزە[1]. جگە لەوەش لەسەر کێشی خۆماڵیش زۆر شیعری داناوە. بەلاّم ئەوەی لێرەدا جێی ئاماژە پێکردنە، ئەوەی من ئاگادار بم، دەربارەی شیعرەکانی محەمەدی نووری هیچ لیکۆڵینەوەیەك لە هیچ ڕوویەکەوە نەکراوە. بۆیە من بە پێی توانا هەوڵم داوە هەندێ ئامار و زانیاری دەربارەی کێش و سەروای ئەم شاعیرە بخەمە ڕوو. شاعیر لە کۆی سەرجەمی شیعرەکانی کە (٦٨) شیعرە. (٤٣) شیعریان لەسەر کێشی عەرووزە. کێشی هەزەج (٢٣) شیعرەو ڕێژەی (٣٣،٨٩ ٪) پێکدێنێ. کێشی ڕەمەل (١٩) شیعرەو ڕێژەی (٢٧،٩٤ ٪) پێکدێنی و کێشی متقارب (١) شیعرەو ڕێژەی (١،٤٧ ٪)پێك دێنێ. شیعرەکانی تریش کە (٢٥) شیعرە لەسەر کێشی خۆماڵییەو ڕێژەی (٣٦،٧٦ ٪)پێك دێنێ. لێرەدا چەند نموونەیەك لەو کێشە باوانەی عەرووز شی دەکەینەوە کە لەلایەن ئەم شاعیرانەوە بەکار هاتوون:

- **کێشی هەزج:** ئەم کێشە لە لایەن (هێمن)ەوە، بەڕادەیەکی زۆر بەکار هاتووە و دەڵێ:

لە شاییدا لە وەختی هەڵپەڕینا
ب - - - / ب - - - / ب - -
مفاعیلن / مفاعیلن / فعولن
لە خۆشیدا لە کاتی پێکەنینا { تاریك و ڕوون ل ٦٢ }
ب - - - / ب - - - / ب - -
مفاعیلن / مفاعیلن / فعولن

ئەم دەقە لەسەر کیشی (هەزەجی شەش مەحزووفە) کێشی هەزەج لای محەمەدی نوریش لە پلەییەکەمەوە بەڕێژەیەکی زۆر بەکار هاتووە و دەڵێ:

بەناوی ئەو کەسەی بێ ناوی پاکی
ب - - - / ب - - - / ب - -

---

(١) عەزیز گەردی، ڕابەری کێشی شیعری کلاسیکی کوردی، چاپخانەی دێکان، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل ٧٦١.

مفاعیلن / مفاعیلن / فعولن

مەلۆتکێك نەی دەدی داوێنی داکی { دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل ١٢ }

ب - - - / ب - - - / ب - -

مفاعیلن / مفاعیلن / فعولن

ئەم دەقە لەسەر کێشی (هەزەجی شەشی مەحزووفە)

- **کێشی ڕەمەل:** ئەم کێشە لە لای هەریەکە لە هێمن و محەمەدی نووری بە پلەی دووەم دێت. هێمن دەڵێ:

چاوەکەم چاوی ڕەشی تۆ ئافاتی گیانی منە

- ب - - / - ب - - / - ب - - / - ب —

فاعلاتن / فاعلاتن / فاعلاتن / فاعلن

گیانەکەم برژانگی تیژت نوکی ڕمبی دوژمنە {تاریك و ڕوون ل ٦٩}

- ب - - / - ب - - / - ب - - / - ب —

فاعلاتن / فاعلاتن / فاعلاتن / فاعلن

ئەم دەقە لەسەر کێشی (ڕەمەل هەشتی مەحزووفە)

محەمەدی نوریش ئەم کێشەی بەکار هێناوە و دەڵێ:

کوڕ لە نێو کۆڕی گەلان دا وەك گوڵی بێ خار نەبێ

- ب - - / - ب - - / - ب - - / - ب —

فاعلاتن / فاعلاتن / فاعلاتن / فاعلن

بێ نیشان ون بێ لە ژینا شوێنەواری دیار نەبێ

- ب - - / - ب - - / - ب - - / - ب —

فاعلاتن / فاعلاتن / فاعلاتن / فاعلن

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل ٤٩ }

- **کێشی خۆماڵی:** ئەم کێشە کە پشت بە ژمارەی بڕگەکان دەبەستێ کورتی و درێژی بڕگەکان هیچ ڕۆڵێکی نییە. ئەم جۆرە شیعرە لەلای شاعیرانی نوێخوازدا بەڕادەیەکی زۆر بەکار دێت. بەتایبەتی کێشی هەشت بڕگەیی و دە بڕگەیی. ئەمەش لە شیعرەکانی هێمن و محەمەدی نووریدا بەدی دەکرێت:

**کێشی حەوت بڕگەیی: هێمن دەڵێ:**

شەماڵ هات بە گاڵە گاڵ
هەور بوون گـەواڵ گەواڵ { تاریك و ڕوون ل ١٠٤. }
کێشی حەوت بڕگەیی (٣ + ٤)ە
محەمەدی نووری دەڵێ:
من چی بڵێم بەجوانی
بەڕێکی و بە ڕەوانـــی { دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل ٤٥ }
کێشی حەوت بڕگەیی (٣ + ٤)ە

**کێشی هەشت بڕگەیی: هێمن دەڵێ:**

لەخەودا دیم لەسەر هەڵگورد
لەسەر چیای سەرکەشی کورد { تاریك و ڕوون ل ٢٢٢ }
کێشی هەشت بڕگەیی (٤+ ٤)ە
محەمەدی نووری دەڵێ:
سلاو لـــــە تۆ ئەحمەدی کۆر
خۆزگەم بەخۆت کە نەتدی زۆر { دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل ١٠٥ }
کێشی هەشت بڕگەیی (٤ + ٤)ە

**کێشی دە بڕگەیی: هێمن دەڵێ:**

وەهام بیستووە سەردەمی پێشوو
لەگەورە شارێك نـازدارێك هەبوو { تاریك و ڕوون ل ١٩٩}
کێشی دە بڕگەیی (٥ + ٥)ە
محەمەدی نووری دەڵێ:
مەڵبەندی ژیان و جێی بیرەوەریم
ڕۆژگاری خۆشی بێ دەردەسەریم{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل ١١١}
کێشی (دە) بڕگەیی (٥ + ٥)ە.

**ب – سەروا:**

سەروا یەکێکە لەبنەما سەرەکیەکانی مۆسیقای دەرەوەی شیعر و بە هاوکاری لەگەڵ کێشدا مۆسیقای دەرەوەی شیعر پێك دەهێنن و لە هەمان کاتدا جوانی و ناسکی و چێژێکی خۆش بە شیعر دەبەخشن. (سەروا بریتییە لەو دەنگە یان کۆمەڵە دەنگەی کە هەندێ جار بەبڕگەو لای هەندێ بەتیپ ئاماژەی بۆ کراوە. لە کۆتایی وشە سەروا دارەکان دووبارە دەبنەوە. ئەمە بەتایبەتی لە کۆتایی لەت یان دێڕە شیعر و هەندێ جار لە ناوەوەش دێ، هەروەك و دەشێ لە پەخشانیشدا هەبێ، بەتایبەتی لە کۆتایی فاسیلەکان)[1]. ئەگەرچی سەرواش وەك کێش تا ڕادەیەکی زۆر بیر و هەست و سۆزی شاعیری کۆت و بەند کردوە، بەڵام لە هەمان کاتدا پانتاییەکی فراوانی هەیە و بایەخێکی زۆری پێدراوە. لێرەدا چەند نموونەیەك لەو سەروا باوانەی کە لە لایەن ئەم شاعیرانەوە بەکار هێنراون دەخەینە ڕوو:

**١- سەروای یەکگرتوو:**

ئەو جۆرە سەروایەیە کە لە سەرەوە تاخوارەوە واتە لە پیتییەکەمەوە تاکو دوا بەیت بەیەك جۆرە سەروا دێتە خوارەوە. لەلای زۆربەی شاعیران بەکار هاتووە و هێمنیش بەڕادەیەکی زۆر بەکاری هێناوەو دەڵێ:

**پەیـــامی من بەگوێی ئەم دولْبەرە نازدارە ڕانــاگا A**
**نەسیم بێ سیم دەبینێ، شل دەبێ، بەم کارە ڕاناگا A**
**گوتی ســــــەبرت هەبێ دووبارە دێمە دیتنت ئەمما B**
**لـــــەکورتی دا تەمەن، وادیــارە بەو دیدارە ڕاناگا A**

{ تاریك و ڕوون ل ٢٢٨ }

ئەم جۆرە سەروایەش لای محەمەد نووری بە پلەییەکەم دێت کە دەڵێ:

**دڵێك دەکـرێ کە هەمبانەی غەمـــان بێ A**
**مەکۆگـەی مەینەت و هــاوار و ژان بـــێ A**
**دەبێ سیسبوونی گـــوڵ بڕوانی بێ دەنگ B**
**دڕو داڵی پژارکەی ســــــەوز و جـــوان بێ A**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل ٦١}

---

(١) عەزیز گەردی، سەروا، چاپییەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٩٩٩، ل ٢٦.

**٢ – سەروای مەسنەوی (جووت سەروا):**

ئەو جۆرە سەروایەیە کە دوو نیوە دێڕی شیعرێك یەك جۆرە سەروایان هەبێت. ئەمەش بەڕادەیەکی زۆر و فراوان لەلایەن شاعیرانی کوردەوە بەکار هێنراوە، ئەم جۆرە سەروایەش بەشێکی زۆری لە شیعرەکانی (هێمن)ی پێ نووسراوە. لەوانە شاکارە شیعریەکەی نالەی جودایی کە دەڵێ:

**ســـاقــی یــا وابـــادەوە، وابـــادەوە A**

**ڕوو لــە لای من کـــە بەجامی بادەوە A**

**موشتەریی وەك مــن لە مەیخانە کەمن B**

**زۆربەیان شاد و بەکەیف و بـــێ خەمن B**

{ نالەی جودایی ل ١٨ – ١٩ }

ئەم جۆرە سەروایە لەلای محەمەدی نووری بە پلەی دووەم دێت کە دەڵێ:

**کــە مردم نەما شوێن و ئاکاری من A**

**حەساوە زەمان گوێی لە هاواری من A**

**دڵــی نـــاهــومێد و لـــەشی بێ وار B**

**بەساردی و سڕی کەوتە کۆشی مەزار B**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل ١٧}

**١- سەروای متەناوب:**

ئەم سەروایە بەشێوەی نۆرە و متەناوب لەدێڕ نا دێڕێکی شعرێك لەسەرەوە تا خوارەوە یەك سەروا بەکار بهێنرێت. لەلای شاعیرانی کورد بەڕادەیەکی زۆر بەکار هاتووە و هێمنیش تا ڕادەیەکی زۆر بەکاری هێناوە و دەڵێ:

**ژین بەیەخسیری و دیلی بێ کەڵکە A**

**بۆیـــە لـــە مێژە لـــــە ژینم تێرم B**

**گوزەران بۆ من لـــە ناو ئەو خەڵکە A**

**سەختە، ناخۆشە، چۆنی ڕابوێـــــرم B**

{ تاریك و ڕوون ل ١١٧ }

محەمەدی نووری دەڵێ:

**پیرێژنی کـــۆنەکـــاری دەوران A**
**شیپانە تەقین و دەرك و بـــاندڕ B**
**کۆلانەگەری کوچەی شەو و ڕۆژ A**
**بێـــعار و گەڕاڵ و بڵح و بن شڕ B**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل ٤٣}

**٤- چوارین:**

بریتیە لە کۆپڵە شیعرێك کە لە چوار نیوە دێڕ پێك دێت. یان لەچەند کۆپڵە شیعرێکی چوار نیوە دێڕی پێك دێت کە هەر چوار دێڕە شیعرەکە یان دێڕییەکەم و دووەم و چوارەمی بەیەك جۆرە سەروا کۆتایی هاتبێت. هەر بۆیە پێی دەوترێت چوارین. عەزیز گەردی دەربارەی چوارین دەڵێ: ((چوارین پارچەیەکی چوار لەتییە، کێش و سەروای تایبەتی خۆی هەیە، پارچەیەکی تەنیایە و مەبەستێکی تایبەتی دەردەبڕێ وەکو سۆفیزم و دڵداری و فەلسەفە و مەی و مەیخانە و پەند و قسەی نەستەق و دانایی و شتی تر، زۆرجاریش پارچەیەك لە هۆنراوەیەکی دوور و درێژ کەبەسەر چوارینەدا دابەش بووە)) [(١)].بێگومان چوارین لە شیعری شاعیرانی کوردیدا ڕووبەرێکی فراوان و دیاری هەیە و بەکاریان هێناوە. هێمن دەڵێ:

**ئەوساڵ جێژنەمان تـــــــاڵە A**
**دوژمنی زاڵـــم زاڵــــــــە A**
**لاو جێ یان سیاچـــــــاڵە A**
**دەســــتی دۆیان بە تـــــاڵە A**

{ تاریك و ڕوون ل ٩٥ }

ئەم جۆرە سەروایەش لای محەمەدی نووری بەدی دەکرێت کە دەڵێ:

کــــە دنیا پڕ لە خۆشی بێ و لــــــە شادی A
گـــولالان شـــــــاد بکا وادی بــــــە وادی A

(١) عەزیز گەردی، سەروا، ل ٢٤٠.

هەموو کەس پێی خەنی بێ بەش بەشی کەن B
بـەشـــی من مەینەت و هـەر نـامـــــرادی A

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل ۱۱۹}

لەکۆتاییدا گەیشتینە ئەو ڕاستیە کە هەریەکە لە هێمن و محەمەدی نووری کێشی عەرووزیان بەڕادەیەکی زۆر بەکاریان هێناوە و لە ڕووی سەرواش سەروای یەکگرتوو مەسنەویان بە پلەی یەکەم و دووەم بەکار هێناوە، بەڵام ئەوەی جێی ئاماژەکردنە محەمەدی نووری لە چاو هێمن کەمتر چوارینی بەکار هێناوە.

## ١- مۆسیقای ناوەوەی شیعر:

شیعر وەك گیان و جەستە جگە لە مۆسیقای دەرەوەی شیعر، خاوەنی مۆسیقای ناوەوەی شیعرە. ئەم مۆسیقایە زیاتر لە ڕووی جۆری هەڵبژاردنی وشەی نێو بەیتەکانی شیعر خۆی دەنوێنێ. هەروەها بەکارهێنانی هەندێك دەنگ لەنێو دێڕەکانی شیعردا دەتوانێ جۆرە مۆسیقایەکی ناوەوەی شیعر دروست بکات. بۆ نموونە هەڵبژاردنی هەندێ وشەی وەك شادی و کامەرانی و خەندە و بزەی لێو تا دوایی، ئەوا جۆرە مۆسیقایەکی کاریگەری ناوەوەی شیعر دروست دەکەن و دەتوانن جۆرە هەڵچوونێکی گەشبینی لەناوەوەی خوێنەردا دروست بکات، بە پێچەوانەش ئەگەر وشەکان لە جۆری غەمناکی و دڵتەنگی و بێزاری و هەتا دوایی بێت. ئەوا جۆرە مۆسیقایەکی ناوەوەی خاوەن جۆرە هەڵچوونێکی ڕەشبین دەبێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە لە هیچ بارێك دا شیعر و مۆسیقا لەیەك دانابڕێت. بۆیە ((ئەگەر ئاوڕێکی مێژوویی لە سروشتی پەیوەندی نێوان هونەر و ئەدەب بدەینەوە، بەر لە هەموو شتێك خزمایەتی شیعر لەگەڵ مۆزیکدا دەدۆزینەوە، خزمایەتیەك کە ئاواز دەباتەوە سەر وشە یان بە پێچەوانەوە))[1].

بەم شێوەیە هەریەکە لە هێمن و محەمەدی نووری ڕۆڵی خۆیان لەم بوارەدا بینیوە. جوانی و ناسکی مۆسیقای ناوەوە لە شیعرەکانی هێمندا سیمایەکی گەش و دیارە. چونکە ((هێمن مۆسیقای وشەشی بەلاوە بایەخدارە، کەم شیعری وای هەیە، دەنگ و ئاهەنگی وشەکانی بە تەرزێکی دڵ بزوێن و گوێ لاوێنەوە ڕێك نەکەوتبن)) .

---

(١) شاهۆ سەعید، ڕیتم لە نێوان شیعر و موزیکدا، گ ئاینده، ژ ٥٠، ٥١، ٢٠٠٣، ل ٩٥.

هێمن مۆسیقای ناوەوەی لە شیعرەکانیدا بە ڕادەیەکی زۆر لە هەردوو گەشبینی و ڕەشبینیدا بەکار هێناوە. بەمەش ئێستاتیکی بەرزی بە شیعرەکانی بەخشیوە. لە شیعری (کچی مهاباد) بە شێوەیەکی گەشبینی ئەم جۆرە مۆسیقایەی بەکارهێناوە و دەڵێ:

**لەباری نازەنینی، نــــــــەرم و نۆڵی، دڵتەڕی، شادی**
**لەچاوی بەد بەدوور بی، ئەی کچی، جوانی، مهابـــادی**

{ تاریك و ڕوون ل ١٠٣ }

لەم دەقەدا شاعیر بە هۆی دەنگی (ی)ەوە لە وشەکانی (لەباری، نازەنینی، نەرم و نۆڵی، دڵتەڕی، لە چاوی، بەدووربی، ئەی، کچی، جوانی) توانیویەتی مۆسیقایەکی ناوەوەی زۆر جوان و ناسکی بەشیعرەکانی ببەخشێت، بەشێوەیەك تواناو لێهاتووی ئەزموونی شاعیر دەردەخا. جگە لەمە لە شیعری ڕەشبینیشدا ڕۆڵی شاعیر دەردەکەوێ. وەك لە شیعری (ناڵەی جودایی)دا دەڵێ:

**پەڕوەریوی، باڵ شکاوی، دەنگ بڕاو**
**بێ بژێوی، بەش خــــوراوی، دەرکراو**

{ ناڵەی جودایی ل ٢٤ }

شاعیر لەم دەقەدا بەشێوەی ڕەشبینی و بەهۆی پیتی (ی)ەوە لە وشەکانی (وەریوی، شکاوی، بژێوی، خوراوی) مۆسیقای ناوەوەی شیعرەکەی بە شێوەیەکی هونەری بەرز و جوان سەرکەوتوو دروست کردووە. جگە لەمەش (وی) دووجارو (اوی) دووجار دووبارە بۆتەوە.

محەمەدی نووری شاعیریش بەهەمان شێوە گرنگیەکی زۆری بە مۆسیقای ناوەوەی شیعر داوە لە هەردوو لایەنی گەشبینی و ڕەشبینیدا بەکاری هێناوە. لەشیعری (قۆرغی قالاو) بەشێوەیەکی گەشبینی مۆسیقای ناوەوەی شیعرەکەی دروست دەکات و دەڵێ:

**ئەی بەسەربەرزی ژیاوی لە هەموو کاتی حەیــات**
**ئەی نەوەستاوی لــە هەنگاوی بەرەو بەرزیی وڵات**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل ٨١}

لەم شیعرەدا شاعیر بەهۆی پیتی (ی) لە وشەکانی (ئەی، بەرزی، ژیاوی، کاتی) لە دێڕییەکەمدا وە لە وشەکانی (ئەی، نەوەستاوی، هەنگاوی، بەرزی) لە دێڕی دووەمدا.

مۆسیقایەکی ناوەوەی جوانی دروست کردووە. جگە لەمە لە بواری ڕەشبینیشدا مۆسیقای ناوەوە لە شیعرەکانی بەدی دەکرێت. وەك لە شیعری (دەردی بێ دەرمان)دەردەکەوێ و دەڵێ:

**وەك بێ مەیلی تــۆ دەردم نەدیوە**

**دڵ نـــــەبرژیوە، غەم نـــــەباریوە**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل ٣١}

لەم دەقەدا شاعیر بەهۆی وشەکانی (نەدیوە، نەبرژیوە، نەباریوە)مۆسیقایەکی جوانی ناوەوەی دروست کردووەو لە گەڵ مۆسیقای دەرەوەدا ئاوازێکی ڕازاوەیان بۆ شیعرەکە پێك هێناوە. لە کۆتایی گەشتینە ئەو ڕاستیەی کە هەریەك لەم شاعیرانە تا ڕادەیەکی زۆر گرنگیان بە مۆسییقای ناوەوەی شیعر داوە و بەمەش شیعرەکانیان بەئاراستەیەکی جوان و ناسك و بەرز بردووە. دیارە هەریەکە لە مۆسیقای دەرەوەو ناوەوە لە شیعرەکانی هێمندا بە شێوازێکی زەق و دیار و لەچوارچیوەیەکی پڕ گۆڕانکاری و داهێنان خۆی دەنوێنێت، بەڵام لەلای محەمەدی نووری لەو پلەو ئاستەدا نییە.

## تەوەرەی سێیەم

## بایەخی وێنەی شیعری لای ئەم شاعیرانە

وێنەی شیعری: وشەی وێنە وەرگیراوە لە وشەی (imag)ی ئینگلیزی کە لە ڕووی واژەو واتاوە نزیکە لە وشەی (imagination)کە باواتای خەیاڵ و مەبەست دێت[1].

وێنەی شیعری ڕەنگدانەوەی ئەزموونەکانی شاعیرە، لە هەمان کاتدا هۆکارێکە بۆ دەربڕین هەست و نەستی ناوەوەی شاعیر، خۆشی و ناخۆشیەکان لە ڕابردوو ئێستا و داهاتوودا، کە سەرچاوەی لە هەڵچوون و خەیاڵەوە وەرگرتووە. ((وێنە لە شیعری نوێ دا فەلسەفەیەکی جوان و جۆراو جۆری هەیە کە گرینگترینیان زیندوویەتی و بزافتنە)) [2]. دەربارەی وێنەی شیعری چەندەها چەمك و پێناسەی جۆراو جۆر هەیە بەلاّم هەموویان لەیەك خالّدا یەکدەگرنەوە. ئەویش وێنەگرتنی هەست و نەستی شاعیرە. یان دەربڕینی ناخەوەی شاعیرە لە ڕێگای وێنەوە. جان بارتلیمی دەڵێ: (وێنە وەك بنەمایەك ئەوەیە کە سەرچاوەی جوانی وێنەیە. وشەی (Farma)کە وەرگێڕدراوی وێنەیەلەلاتینیدا بە واتای جوانی دێت)) [3].

بلنسکی دەڵێ: ((هیچ بوارێکی داهێنان نییە وەکو شیعر گرنگی بە وێنە بدات، شیعر کۆمەڵە وێنەیەکە، وشە بەشێوەیەکی تایبەتی بەرجەستەیان دەکات، شیعریش تەنیا بیرکردنەوەیە بە وێنە)) [1]. کەواتە شیعری سەرکەوتوو ئەوەیە جگە لە وێنەی هونەری بەرز نابێ بەدەر بێ لە سۆز و ئەندێشەی داهێنەرانە، لەپاڵ ڕەگەزەکانی تری شیعری. کۆلێردیج دەڵێ:

((وێنەی شیعری هەرچەندە جوان بێ، شاعیری سەرکەوتوو دەست نیشان ناکات. تەنیا لەو کاتەدا نەبێت کە بەسۆزی ناسك و ئەندێشەی خولّقێنەر ڕازابێتەوە تا بتوانی هەست و سۆزی گوێگر یان خوێنەر ڕابچڵەکێنێ)) [2]. وێنە لە ڕەگەزە هەرەگرنگ و سەرەکی و دیارەکانی

---

(١) کیلاس محمد عزيز العسكرى، نفس المصدر، ص ٢١٠.

(٢) د. عزالدين اسماعيل، نفس المصدر، ص ١٤٤.

(٣) د. على بَطَل، الصورة في الشعر العربي حتى القرن الثاني الهجرية، الطبعة الثانيية، دار الأندلس للطباعة و النشر والتوزيع، ١٩٨١، ص ٣٠.

شیعری هاوچەرخ و ڕۆمانسیزمە. بۆیە شاعیرانی سەربەم ڕێبازە بایەخێکی زۆریان پێداوە. (مالارمێ) بەلای وێنەدا دەگەڕێتەوەو دەڵێ:- ((ئەگەر وێنە نەبوایە قسەکانمان لە شیعردا ئەبوونە قسەی سادە)) [(١)].بۆیە دەتوانین بڵێین ((وێنەی شیعری لە سادە ترین واتایدا وێنەکێشانە بە وشە)) [(٢)]. بەم شێوەیە وێنەی شیعری ڕۆڵێکی بەرز و کاریگەر دەبینێ لە پێکهاتەی هەموو شاکارێکی شیعری نەمر و پڕ داهێنان. چونکە شاعیر چەند لە دروستکردنی وێنەی شیعری دا وەستاو زیرەك و لێهاتوو بێت و هەڵچوون و ئەندێشەکانی زۆر و فراوان بێت. باشتر و زیاتر بەسەر گواستنەوەی بیرو بۆچوونەکانی ناخی خۆی زاڵ دەبێت و دەتوانێ بیگەیەنێتە خوێنەر یان پەیاموەرگرەکەوە. بۆیە دەبینین ((بەهۆی وێنەوە شاعیر هەست و بیر و یادەوەریەکانی بەشێوەیەکی هونەری پێکەوە دەنێ، هەر لە ڕێگای وێنەوەش تێ ڕوانینە تایبەتیەکانی دەخاتە ڕوو)) [(٣)]. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە وێنەی شیعری ئاوێنەی ڕەنگدانەوەی دەروونی شاعیرە. کارۆڵین دەڵێت: ((شاعیر خۆی خۆی ئاشکرا دەکات لەناو وێنە شیعریەکانی بە ڕێگای ناهەستی)) [(٦)]کەرستەو پێکهاتەکانی وێنەی شیعری زۆرن بەگەلێك شێوە دروست دەبن، ((خەیاڵ کەرەسەی خاوی وێنەی شیعریە و ڕۆڵێکی سەرەکی و گرنگی هەیە لە بونیات نانی وێنە شیعریەکەدا و بەشەکانی وێنە بەشێوەیەکی گونجاو ڕێك دەخات))[(٤)]. (یڤۆن بلاڤال – youvn Belavale)دەڵێ: ((لێکچواندن و خواستن و هەڵبژاردنی واژەکان و مۆسیقا هەموویان وێنە دێنە کایەوە))[(٥)].وێڕای ئەمانەش هەریەکە لە ڕەمز و ئەفسانەو خوازەو بەشەکانی تری ڕەوانبێژی ڕۆڵێکی گرنگ دەبینین لە درووست بوونی وێنەی شیعریدا. ((بنەمای پێکهاتەی وێنەی شیعری هونەرەکانی ڕەوانبێژییە))[(٥)]، چونکە

---

(١) سیسل دی لویس، الصوره الشعریه، ت: أحمد نصیف الجنابی و أصدقائه، ص ٢١.

(٢) د. کمال معروف، ڕەخنەی نوێی کوردی، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٧، ل ١٣٥.

(٣) ئوسامە حوسێن رەسول، شێواز لەدەقی ئەدەبیدا، گ ئایبندە، ژ ٣٥، ٢٠٠٢، ل ١٠.

(٤) هیتلەر ئەحمەد حەمە، وێنەی شیعری لای نالی، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین، کۆلیژی ئاداب، ٢٠٠١، ل ٩.

(٥) الدلالة الإجتماعیة لحرکة الادب الرومانطیقي في لبنان، بین الحربین العالمیتین، ص ١١٧.

(٦) دلشاد عەلی محەمەد، دیلان و تاقیکردنەوەی شیعری، نامەی دکتۆرا، کۆلیژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٦، ل٢٢٠.

شاعیر لە کاتی کێشانی هەر وێنەیەکی شیعریدا وێنەی شتەکان وەکو خۆی بەشێوەیەکی فۆتۆگرافی ناگرێت بە ڵکو گۆڕانی بەسەردا دەهێنێت. ڕادە و کەموزۆریی ئەم گۆڕانانەش بەستراوە بە ئاست و پایەو مەوداکانی فراوانی ئەندێشە و ڕێژەی هەڵچوونەکان و ئەزموونی شیعری و توانا و لێهاتوویی شاعیر.

هەندێك وێنەی شیعریش هەیە کە وێنە گرتنێکی ڕاستەوخۆیە واتە فۆتۆگرافییە و کەمتر هەست بە جوڵەو درەوشانەوەی دیمەن و تابلۆکان دەکرێت و جاروبار شاعیر بۆ مەبەستی تایبەتی و بەراوردکردن و شکانەوەی نیازی سەرەکی خۆی بەسەر ئەو وێنە فۆتۆگرافیە ڕاستەوخۆیانەدا ئەم چەشنە وێنانە دەکێشێت))[٤]. وێنە لەلای شاعیرانی ڕۆمانسیزم بایەخێکییەکجار گەورەو فراوانی هەیە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو جیهانە پڕ سۆز و ئەندێشەیەی کە تێدا دەژین و ئەم خەسڵەت و تایبەتمەندیانەی ئەو شاعیرانە لەم ڕووەوە هەیانە، ((وێنە لە هۆنراوەی ڕۆمانتیکیەتدا لەسەر بنەمای بەدوای یەکتر هاتندا دروست دەبێ هەروەك خەونەکان، لەوانەیە بێ واتابێ و لەوانەیە پەیوەندیەك لە نێوان بەشەکانیدا نەبێ. چونکە زادەی هۆشی لای مرۆڤ نییە، بەڵکو زادەی ڕێکەوتە.. وێنە بەم واتایە پارچە پارچە دەبێ لەچەند پارچۆکەی جیاوازی شتەکان پێك دێت))[٥].بەتایبەتی لەلای ئەو شاعیرە ڕۆمانسیزمیە بەرزە فڕانەی کە لە جیهانی یۆتۆبیا دەژین، بەلاّم ئەم دیاردەیە لە لای ئەوانی تر بەم شێوەیە نییە. بەڵکو واقیعیانەترن و هەست و سۆز بەخۆوە دەگرن و بەرەو هزر و بیر دەچن. هەرچۆنێك بێت وێنە لە گەلێك جۆر و شێوازی جیا پێك دێت و بەپێی کات و بارو دۆخ و ئەزموونی شاعیر دەگۆڕێت.

وێنەی شیعریش لەلای هەردوو شاعیران هێمن و محەمەدی نووری بایەخێکی گەورە و بەرزی هەیە. ڕووبەرێکی فراوانیشی لە شیعرەکانیاندا داگیر کردووە. زۆری و کەمیی ئەم وێنانەش لەوێدا لە ڕووی بنیاد و پێکهاتەوە دەگۆڕێت. هەرچەندە ئەوەی لێرەدا پێویستە ئاماژەی پێ بکرێت ئەوەیە، کە ئەم شاعیرانە لەگەڵ ئەوەی لە ڕووی بنیادەوە وێنەی جۆراو جۆر لە شیعرەکانیان دەبینرێت. بەلاّم بەشێوەیەکی گشتی زیاتر وێنەی سادەو لێکدراو گشتی

---

(١) کاکەی فلاح، وێنەی شیعر چییە، گ کاروان، ژ ٤٩، ١٩٨٦، ل٢٥.

(٢) د. یاسین عەساف، وێنەی شیعری لە ڕێبازی ڕۆمانتیکیەتدا، و: عادل گەرمیانی، گ ڕامان، ژ ٣٧، ١٩٩٩، ل ١٧٤.

یان کێشاوه و کەرستەکانی لێکچواندن و ڕەمز و ئەفسانەیان بەکار هێناوه. وێنەی شیعری لە شیعرەکانی هێمن دا تایبەتمەندی و خەسڵەتی خۆی هەیە و خاوەنی ناسنامە و سەربەخۆیی خۆیەتی جیاوازە لە هی شاعیرانی تر. ((هێمن لە ڕێگای وێنەو دیمەنە ڕەسەنەکان و نیشاندانی پەیوەندیە ئینسانی و کۆمەڵایەتیەکانی مرۆڤ بەو وێنانەوە. جیهانێکی شاعیرانەی هەستپێکراو دەنەخشێنێ)) [1]. لەپاڵ ئەمانەشدا شاعیر هەر وێنەیەکی گرتووە مۆرکێکی کوردانەشی هەیە. ئەمەش لە شیعری (بۆسەی ڕۆژگار)زۆر ڕوون و ئاشکرایە کە دەڵێ:

**کـیژی شاریمان لە خۆی وەرگرتووە چارشێوی ڕەش**

**داخەکەم نەم دی لەوێ مانگێکی دەورەی تەم نەبێ**

**شـــــادی جارێکی بەمیوانی نـــەهاتۆتە دڵــم**

**ڕەنگە خەڵوەتخانەیی خەم شوێنی نــامەحرەم نەبــێ**

{ تاریك و ڕوون ل ١٣٢ }

لێرەدا شاعیر جوانترین و بەسۆزترین و کاریگەرترین وێنەی ڕۆمانسیزمیانەمان بۆ دەکێشێ. کە لە جۆری وێنەی تاکەو بە شێوازی لێکچواندن بنیاد نراوه. شاعیر زۆر وەستایانەو هۆنەرمەندانە دیمەنی ئەو کیژە شاریانەی کە چارشێوی ڕەشیان پۆشیوه، دەچوێنێ بەو مانگە جوان و گەشەی ئاسمان کە تەم دای پۆشیوە و دەورەی گرتووە جوانییەکانی شاردۆتەوه. بۆیە غەمی بۆ دەخوات داخ و حەسرەتی بۆ هەڵدەکێشێ. دواتر شاعیر لە دێڕی دووەمدا بەو پەڕی ڕەشبینی و نائومێدیەوە و لە چوارچیوەیەکی پڕ لە هەست و سۆزی ڕۆمانسیزمیدا وێنەیەکی ژیانی بەدبەختی و کەساسی خۆیمان بۆ دەکێشێ هەر بەڕێگای لێکچواندن و جۆری تاکەوه. کاتێك ڕاز و سکاڵای خۆی بۆ ڕۆژگار هەڵدەڕێژێ کە شادی نەهاتۆتە ماڵی دڵی. چونکە شاعیردڵی خۆی هەمیشە بە خەڵوەتخانەی خەم و شادیشی بە نامەحرەم چوواندووه. بۆیە دەزانێ دڵنیاشە لەوەی بەم شێوەیە شادی لە نێو دڵیدا خۆی ناگرێ و نامینێتەوه. ((هێمن لە دارشتنی وێنەی هونەریدا هێمنە بە پێچەوانەی زۆربەی شاعیرانی ئێستاوە کە بەشوێن یەکدا وێنەکان پێکەوە دەبەستنەوه. بێ ئەوەی ڕەچاوی پەیوەندیەکی پتەوی نەپساو بکەن، لە نێوان مرۆڤ و سروشتدا)) [2].

---

(١) عوسمان دەشتی، هەمان سەرچاوە، ل ٩٨.

(٢) محەمەد فەریق حەسەن، هێمن و بۆنی غەریبی، گ بەیان، ژ ٦٥، ئابی ١٩٨٠، ل ١١.

بۆیە خۆشەویستی گەل و نیشتمانەکەی وای لێکردووە کە زۆربەی وێنەی شیعرەکانی لە مێژوو کەلتورو سروشتەکەیەوە هەڵهێنجێ، لەمەش زیاتر شاعیر توانیویەتی کاریگەری ئەو بارو دۆخە سەخت و دژوارەی میللەتەکەی لە نێو وێنەکاندا بنەخشێنێ و ڕەنگبداتەوە. جگە لە پێشاندانی غەم و ئێش و ئازارەکانی و خستنە ڕووی بارە دەروونی و ڕامیاری و کۆمەلأیەتیەکان. وەك لە شیعری ((چارەنووسی شاعیر))دا کۆمەڵێ وێنەی ڕۆمانسیزمیمان دەخاتە پێش چاو و دەڵێ:

**لەسەر بەفرێ بەکار نایە وەکو بیستوومە داوی ڕەش**

**لەسەر کولـــمت ئەدی بۆ دڵگرە ئەو بسکە تاتایە؟**

**دوایی دەڵێ:**

**بەڕیشی بـــۆزەوە سوجدەی دەبەم بۆ جەماڵی تۆ**

**ئەدی بۆچی دەیانگوت دار کـــە پیر بوو تازە دانایە**

{ تاریك و ڕوون ل ١٣٣ }

لەم دەقەدا شاعیر کاتێ ئاوڕ لە مێژوو کەلتووری نەتەوەکەی خۆی دەداتەوە، بیستویەتی کە داوی ڕەش لەسەر بەفری سپی هەرگیز بەکار نایەت بۆ ڕاوکردن. چونکە دیارەو نێچیر خۆی لێ لادەدات و پێوەنابێ. کەچی شاعیر لەوە سەری سوور دەمێنێت، کە چۆن دڵی بەو داوەوە بووە کە یارەکەی بە بسکە ڕەش و تاتایەکانی لەسەر کولمە سپیە بەفریەکەی ناوەتیەوە. لەبەیتەکەی تردا شاعیر دێتە سەر ئەو بیر و باوەڕەی کە یارەکەی لەجوانی و شۆخ و شەنگی دا بێ هاوتایە. بۆیە هەرگیز بڕوا ناکات، هیچ هێزێك بتوانی لەبەرامبەری بوەستێت و شکست نەهێنێت. بەم شێوەیە شاعیر تاسەر ئێسقان دەکەوێتە ژێر کاریگەری جوانی خۆشەویستەکەیەوە. تاڕادەی پەرستن و کڕنۆش بردن خۆشی دەوێ و بەڕیشی بۆزەوە کڕنۆشی بۆ دەبات و مل کەچ دەکات و لەبەر دەمیا دەچەمێتەوە، بۆچوونی ئەوانەش ڕەت دەکاتەوە کە دەیان گووت دار کە پیر بوو دانایەو ناچەمێتەوە. وەك ئاشکرایە شاعیر لەم دەقەدا بەهۆی کۆمەڵێ وێنەی تاکەوە وێنەیەکی گشتی پڕ ئێستاتیکیەتی بەرز و ڕۆمانسیزمیمان پێشاندەدات. کە لە ڕێگای لێکچواندنەوە بنیات نراون. بەم شێوەیە ((هێمن خاوەنی تاقیکردنەوە خۆیەتی و نوسخەی دووەمی شاعیرێکی تر نییە، وێنەی هونەری و زاراوەی هاوچەرخەکانی خۆی کەمتر دەجوێتەوە)). بەڵکو بە پێچەوانەوە زۆربەی کات وێنەی شیعری هێندە بەرز و ڕازاوەی نەخشاندووە، داهێنان و ئەفراندنی گەورەی

پێوە دیارە. جۆرێك لە جودا کاری و نوێخوازیشی بە خۆوە گرتووە. ئەمەش لە شیعری ((پەیامی ڕانەگەیەنراودا)) زۆر زەق و بەرچاوەو کە تێیدا کۆمەڵێ وێنەی شیعری جوان و سەرنجڕاکێشمان پێشان دەدات و خوێنەر سەرسام دەکات و بەرەو دەریای قووڵی خەیاڵ و بیرکردنەوەی دەبات. تەنانەت شاعیر لەم دەقەدا خۆی لەقەرەی هەندێ وێنەداوە و بە ئەندێشەی چڕ و فراوانی خۆی وێنەی وای نەخشاندووە هیچ شاعیرێك لە پێش ئەو پەی پێ نەبردووە و هەستی پێ نەکردووە. جگە لەوەش شاعیر بە شێوازێکی تایبەتی خۆی وێنەکانی کیشاوە کە داهێنانی گەورەو ئیستاتیکیەتێکی بەرز و جودا کاری و ئەزموونێکی شیعری قووڵ و فراوانی پێوە دیارە وێڕای ئەمە شاعیر توانیویەتی کۆمەڵێ وشەی تازە و ناسك و جوان بەکار بهێنێت و خۆی دووربخاتەوە لە تەوژمی لاساییکردنەوە و جوینەوەی ئەو وێنانەی کە لەپێش ئەودا لەلایەن شاعیرانی تردا بەڕادەیەکی زۆر بەکار هێنراون و سوواون. تەنانەت هیچ تام و چێژ و جوانی و کاریگەریان تێدا نەماوە و بەهیچ شێوەیەکیش کار لە خوێنەر ناکات و هەستی نابزوێنێ.

کەچی بە پێچەوانەوە، ئەو وێنە شیعریانەی لە شیعرەکانی هێمن دا هەن، ئەوە دەگەیەنی و دەسەلمێنی کەشاعیر خاوەنی وێنەی شیعری تازەی خۆیەتی و کۆنەکا بەبا ناکاتەوە. ئەمەش لە وشەو وێنەی (مینی ژۆپ) دا دەردەکەوێت کە دەڵێ:

**هەتا کۆمتر دەبێ پشتم پتر هەڵدەکشێ مینی ژۆپ**

**ئیتر دەســــتم بە داوێنی کچی ئـــەم شارە ڕاناگا**

{ تاریك و ڕوون ل ٢٢٨ }

هێمن لێرەدا ئەوپەڕی فراوانی ئەندێشەو تواناو لێهاتوویی ئەزموونی خۆیمان پێشاندەدات و بەدروستکردنی بونیاتی وێنەی شیعریش دا وەستایەتی و زیرەکیی خۆی دەسەلمێنێ، لەهەمان کاتدا جوانی زەق و هەستی ناسك و بالاّ دەستی شاعیرمان لە بوارە بنچینەییەکانی هونەرەکانی ئێستاتیکیەت و وێنەی شیعریدا بۆ دەردەکەوێت. ((شاعیر بەراوردێك لە نێوان خۆی و (کە ڕوو لە پیریە تادێ پشتی کۆمتر دەبێ) لەگەڵ مینی ژۆپ دا (کە ڕۆژ بەڕۆژ کورتر دەبێتەوە) دەکا و ئەنجام ئیتر ناتوانێ دەستەو داوێنی کچی ئەم شارە ببێ..... دیارە بەکارهێنانی ئەم وێنانە لە پلەی ئێستاتیکی شیعرەکە بەرز دەکەنەوە. لەلایەکی تریشەوە خەیاڵی بە پیزی شاعیرانەی (هێمن)مان بۆ بەدەر دەخەن)) [1]. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو

---

(١) هەمان سەرچاوە، ل ١٥.

جیهانە چڕو پڕەی ئەندێشەی شاعیر و شارەزایی لە هەڵبژاردنی ئەو وێنانەی کەشیاو گونجاون لەگەڵ دەربڕینی هەست و نەستی شاعیردا. بۆیە بە شێوازی لێکچواندن وێنە تاکەکانی دروست کردووە هەروەها هێمن موکریانی لە شیعری ((ناڵەی جودایی))دا دەیان وێنەی جۆراو جۆری بۆ کێشاوین بەلاّم ئەوەی زیاتر بەدی دەکرێت وێنەی تاکە جگە لە وێنەکانی لێکدراو و گشتی کە بەشی هەرەزۆریان بەڕێگای لێکچوواندنەوە بنیات نراون هەروەکو دەڵێ:

**کـەوتمە نێو چـــــاڵی دیـــــلی وەك (مەمێ)**

**(یایە زین) لـە کوێیە هـــاواری کــــــــەمێ**

**کوا (قەرە تاژدین)، (چەکۆ)و (عەرفۆ) لە کوێن؟!**

**بێنـــە هانـام وەك پڵینگـی چـەنگ بـە خـوێـن**

**(لاس)ە شـــۆڕێك بــــــووم غەنیمی دووژمنان**

**ئێســـــــتە ئەنگاوم بـــــــــەتیری چلکنان**

**وام بـــــــەتەنیایی لــــــــەنێو خوێنا شەلاّڵ**

**(کـــوانێ عێل و، کوانـــێ خانزاد) و (خەزاڵ).!**

**زۆر لـــــــەمێژە نارەنـــاری منی نــــەبیست**

**هەروەکو (شەمزین)، (شەمیلە)ی خۆش ئەویست**

**وەك (سیامەند)ێ لــــــەچۆڵ و بـــەندەنــــــێ**

**جەرگی لـــــــەت کردم پـەلی دارەبــــــەنێ**

**شـەتڵـــــی جواناوم منی ســـاردە بـــــــرین**

**کــــــوا (خەج)م تــــــا بۆم بگێڕێ گەرمەشین؟!**

**مــــــانگی (کانونێ بـــــــــە چلوان دەرکرام)**

**وەك (بـــــرایم) لــــــەو ولاّتە ڕاونـــــــــرام**

{ ناڵەی جودایی ل ٢٩ – ٣٠ }

شاعیر لێرەدا بەشێوەیەکی ڕۆمانسیزمیانەو بەهونەرێکی بەرز و پڕ ئێستاتیکیەتی شیعرییەوە وێنەیەکی میللی کوردانەمان بۆ دەکێشێت بە سوود وەرگرتن لە مێژوو و کەلتووری نەتەوایەتی. شاعیر زیرەکانە بەڕێگای لێکچواندن دەیان وێنەی سادە و تاك و لێکدراو لە

قاڵبێکی ڕۆمانسیزمی دادەڕێژێ. هەرجارەی خۆی بەو پاڵەوانە بە ئاکام نەگەیشتوانە دەچووێنێ کە بوونەتە ڕەمز و ناسنامەی ئەو داستان و ئەفسانە دڵداری و خۆشەویستیانەی کە لەناو وڵاتی کوردەواری و لە دەرەوەشدا دەنگ و سەدایەکی گەورە و بەرز و فراوانی هەیە.

هەروەك خۆی چوواندوە بە (مەم)، لەو کاتەیدا کەوتۆتە چاڵی دیلی خۆشەویستەکەیەوە، یارەکەشی بە (یایەزین) چوواندوە و دەگەڕێ بەدوایدا بۆ ئەوەی بیدۆزێتەوە، تا هاواری پێبگەیەنێت. یان خۆی دەچوێنێ بە (لاس)ە شۆڕ، ئەو ئاشقەی کەوا شێت و شەیدای (خەزاڵ)ە شۆڕی مەلا نەبیان دەبێت. لەم ڕێیەدا سەختی و ستەمی زۆر دەبینێ، تا لە کۆتاییدا بەتیری چڵکنێك شەلاڵی خوێن دەبێت، پاشان خۆی بە (سیامەند) دەچوێنێ کە بە هۆی پەلی دارە بەنەوە جەرگ و دڵی لەتلەت بووە. دواتر خۆی وەك برایمی مەلای زیندینان پیشان دەدات، کە چۆن بە مانگی ساردو سەرماو ڕۆژی باران و بەفر بە چلوان دەردەکرێت و لە وڵاتی خۆیدا بە ناهەق ڕاو دەنرێت. شاعیر لە هەموو ئەو وێنانەدا هەوڵی داوە چەند شتێك ڕوون بکاتەوە و چەندەها ئامانج و مەبەستیش بپێکی. کە گرنگترینیان ئەو خالآنەی خوارەوەدا چڕ دەبێتەوە:

١- شاعیر دەیەوێت لە ڕێگای ئەم داستانە دڵداریانەوە باس لە ئەشق و خۆشەویستی ناکامانەی خودی خۆی و گەنج و کیژی میللەتەکەی بکات، هەر لە ڕوانگەی ئەمانەوەش پێناسەی ئەشقی خۆی بکات.

٢- شاعیر دەیەوێت پەنجەی تاوان و شەرمەزاری بۆ ئەو داب و نەریت و دیاردانە ڕابکێشێت کە دەبنە بەر بەست و دیدار لەبەردەم هێنانەدی هیوا و ئاواتی ئاشقانی کوردستان لە ژێر پەردەی یاسا و ڕێساکانی دەسەلآت و کۆمەلآیەتیدا.

٣- بەم هۆیەوە شاعیر جارێکی تر گیانی نەمری بەم داستانانە و پاڵەوانەکانیان دەبەخشێتەوە و پۆشاکی نوێگەری و داهێنانیان بەبەردا دەکاتەوە.

٤- شاعیر لە ڕێگەی ئەم کارەوە بەرەو ژیانی ڕابردوو و مێژووی باوك و باپیران و گەورە پیاوان و قارەمان و ناودارەکان دەگەڕێتەوە و ئاوڕیان لێ دەداتەوە. ئاخ و داخ و حەسرەتیان بۆ هەڵدەکێشێت و فرمێسکی گەشی بەدیار بیرەوەریەکانیاندا دەبارێنێت. ئەمانەش هەموو لە خەسڵەت و شەنگەستە دیارەکانی شاعیرانی ڕۆمانسیزمن.

وەك لە پێشەوە باس کرا جگە لەوەی شاعیر زۆر لەوێنە شیعریەکانی لە دیمەنە جوان و دڵگیر و سەرنج ڕاکێشەکانی بەهاری لادێ و سروشتی کوردستانەوە سەرچاوەی گرتووە. لەگەڵ ئەمەشدا ئافرەت لەم بوارەدا کەرستەیەکی بنچینەیی و سەرەکی و گرنگی پێکهاتەی

ڕێژەیەکی هەر زۆری ئەم وێنانە بووە. ئەم وێنانەش کە ڕەنگدانەوەی جوانی و ناسکی و شۆخ و شەنگی ئافرەتە، یاخوود دیمەنەکانی دەرەوەو ناوەوەی بووە، ئاست و پلەو پایەکی بەرزی وەرگرتووەو گەیشتۆتە ترۆپك. شیعری (جۆلانە)ش نموونەیەکی بەرزی ئەم وێنە شیعریە جوانانەیە کە دەربارەی ئافرەت کێشراون وەك دەڵێ:

**چــــوومە لای دکتۆر و گوو تـــی**

**نەخۆشی دەردەکەت ســــــەختە**

**گـــوتم: تۆ پێت وایـــــە دەمرم؟**

**بــــــەداخەوە، گوتـــــی: وەختە**

**

**ئـــــــەو دڵـــــە کوتەی گرتوتە**

**پیـــــــــــاوی بەهێزیش بیگرێ**

**بێت و ئـــــــــاگای لەخۆ نەبێ**

**هێنــــــدەی پێ ناچێ دەمـــــرێ**

**

**پـــــــێ کەنیـــم و گوتم دکتۆر!**

**نــــــــــاڵێم زاناو شـــارەزا نی**

**بـــــــەڵام تۆ پزیشکی ویشـــکی**

**بـــــاری دڵداری نـــــــــازانی**

**

**دڵـــــــــــە کوتـــــــەم نییە، دڵم**

**جێی کیژێــــــکی خان و مـــــــانە**

**منداڵـــــــــــــە، ئۆقرەی نـــاگرێ**

**بــــــــۆم دروســــــت کردووە جۆلانە** { تاریك و ڕوون ل ١٣٤ }

لێرەدا کاتێك سەیری شیعرەکە دەکەیت هەر لە ناو نیشانەکەیەوە کە (جۆلانە) یە یەکسەر بۆ ڕابردوو و ژیانای منداڵی دەگەڕێتەوە و جیهانی پاك و بێگەرد و جوان و ناسك و هەست بزوێن و پڕ بەرائەتی ئەو دەمانەت دێتەوە پێش چاو و گەلێ یادەوەری تاڵ شیرین سەرنجت ڕادەکێشێ و دەتخاتە دەریای ئەندێشەیەکی بێ سنورەوە، کە تەمێکی سپی ڕۆمانسیزمی سەری داپۆشیوە، بەلاّم کاتێك دوایی وردە وردە بەروە ناخی شیعرەکە شۆڕدەبێتەوە. دەبینی ئەم جۆلانەیە جۆلانەکەی سەردەمی منداڵی نییە. کەمنداڵ بەهۆیەوە ئەوپەڕی تام و چێژی خۆشی و شادی لێ وەر دەگرێ بەدەم قاقای پێکەنینەوە مەست دەبێت بەئاسماندا دێت و دەچێت، بەڵکە ئەمەیان دڵێك دێنێ و دەبات گوڵی غەم و مەینەت و ئێش و ئازاری دڵبەرەکەی و ناخۆشی کارەساتەکانی ڕۆژگاری هەڵگرتووە. ((هێمن لەم وێنە شیعریەدا دوو هەڵوێستی دژیەکی بە خەیاڵی زیرەکانەی خۆی خستۆتە ڕوو، یەکەمیان باری پیری و دڵتەڕی و ناسکیە دووەمیان دیمەنی کێژێکی شۆخ و شەنگ و ناسك و جوانکیلەیە و بێ ئارامە و ئۆقرە ناگرێ)) [1]. لە هەمان کاتدا تابلۆی ئەو پیرە دڵتەڕەمان پێشان دەدات کە دەڵێ خۆی کردۆتە جۆلانە بۆ ئەو کچە شۆخ و ناسکەی کە لە ماڵە خنجیلانەکەی دڵی ئۆقرەو ئارام ناگرێ. بەم شێوەیە شاعیر بەهۆی کۆمەڵێ وێنەی سادەی تاکەوە وێنەیەکی گشتی درووست کردووە کەلەسەر بنیاتی لێکچواندنەوە و شێوازی دایالۆگی بەخۆوە گرتووە هێمنی شاعیر توانیویەتی بە زوومی کامێرای چاوەکانی جوانترین و بەرزترین و هونەریترین، وێنەی شیعریمان دەربارەی جوانی سروشت و ئافرەت و دڵداری و خۆشەویستی و بابەتە ڕەنگاوڕەنگەکانی دیکەی ژیانمان بۆ بکێشێ و ڕووی ناوەوە و دەرەوەی خۆی و ئەم ژینگەیەی تێیدا ژیاوە، پێشان بدات و شاکارێکی پڕ داهێنان و نەمریش بێنێتە کایەوە. دیارە وێنەی شیعری لای محەمەدی نووری شاعیریش وەك ئەلبومێکی ڕازاوە و ڕەنگاوڕەنگی ڕۆمانسیزمی خۆی دەنوێنێ. بۆیە ئەگەر گەشتێکی خێرا بەناو پێشانگای وێنە سەرنجڕاکێشەکانی شیعری ئەم شاعیرەدا بکەین، ئەوا بەگەلێك وێنە و بابەت و یادەوەریی کاریگەر و وروژێنەر و هەستبزوێن بەدی دەکەین و بەئاسایی بەرەو ناخی دڵ و دەروون و هزرماندا گوزەر دەکەن و جێی خۆیان دەکەنەوە. محەمەدی نووری شاعیر لە بنیاتی وێنەی شیعریدا مەند و لەسەرخۆ و بالاّدەست و زیرەك بووە، ئەگەرچی وێنەکان سادە و ساکارن، بەلاّم خنجیلە و ناسك و ئێسکسووك و بەرزن و خاوەنی

---

(١) ڕوۆف عوسمان، بحثين في الأدب الكردي، مطبعة للثقافة والشباب، اربيل، ١٩٨٩، ص ١٧.

سیما و ئەندێشەی تایبەتی خۆیانن و مۆرکی مێژوویی و کەلتوری نەتەوەکەی خۆشی هەڵگرتووە. شاعیر وەك ڕۆڵەیەکی بەوەفای گەلەکەی و وەك کوڕە لادێیەکی خاکی، بەتوندی کەوتۆتە ژێر کاریگەریی سروشت و دیمەنەکانی لادێ و بارودۆخی ژینگەکەی خۆیەوە. بۆیە زیاتر ئەو وێنانەشی هەڵبژاردووە کە لە کانگای جوانیی سروشتە سیحراویەکەی کوردستان و کیژۆڵە بەناز و چاو ڕەش و پەرچەم خاوەکانی لادێوە هەڵقولاٚوە لە ناخی سەختی و ئاڵۆزی گیرو گرفتە کۆمەلاٚیەتیەکانەوە سەرچاوەی گرتووە. شاعیر لە شیعری (یادێك لە زادگا) کۆمەڵێ نمونەی بەرزمان لەو وێنە شیعریانە پێشاندەدات کە سروشت ئیلهامی بەخشی بووە. وەك دەڵێ:

**ئـــــاوی خڕاوکەی حەوزی بەر مالاٚن**

**شـــیوەڵەی خوار دێی کردۆتـــــە دالاٚن**

**چۆڕە چۆڕە دەتکێ وەك فرمێسکی چاو**

**بـــــۆ سەر ڕوومەتی گوڵی قەتیس ماو**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل١١٣ }

لێرەدا محەمەدی نووری شاعیر وێنەیەکی جوان و سەرنجڕاکێشی دێیە خنجیلانەکەی خۆمان بۆ دەخاتە ڕوو. بەهۆی شێوازی لێکچواندنەوە. وێنەیەکی گشتی دەکێشێ و هەست و نەست و خۆشەویستی خۆی تێدا پێشان دەدات. شاعیر لێرەدا ویستوویەتی وەفاو دلسۆزی و ئەوینی خۆی بۆ گوندەکەی و نیشتمانەکەی دەربڕێ و لە هەمان کاتدا ناوی ئەو شوێنەی کە لێی لە دایك و پەروەردە بووە بەرز ڕابگرێ و بەنەمری بیهێلێتەوە بۆیە دێت زۆر بە جوانی و هونەریانە دیمەنی ئەو ئاوەمان نیشان دەدات کە وەك گۆمێك یان حەوزێك لەبەر مالاٚنی دێ درووست بووەو بەشی خوارەوەی کردۆتە دالاٚن، ئینجا هەستاوە چۆڕە چۆڕەی ئەو ئاوەی کە لەسەرەوەدا لەنێو گۆمەکەدا دێتە خوارێ بەهۆی ئامرازی لێکچواندنی (وەك)ەوە دەچوێنێ بەو دلۆپە فرمێسکانەی کە لە گۆمی چاوانەوە دەتکێتە سەر ئەو ڕوومەتە ئاڵ و گەشانەی کە لە جوانی و ناسکی سوورو گەشیدا وەك گوڵ وایە، لە جێگای خۆیدا قەتیس وەستاوە و چەسپاوە. بەم شێوەیە شاعیر وێنەیەکی گشتی ئەو بە سیمایەکی جوانی وێنەی شیعری و هونەریانە پێشان دەدات. جگە لە سروشتی ئافرەتیش وەك بابەتێکی تری گرنگ و بەهادار لە وێنە شیعریەکانی شاعیردا بوون و ڕۆڵی خۆیان دەسەلمێنن. جوانیی ئافرەت وەك ڕەگەزێکی ئێستاتیکی لە شیعرەکانی شاعیردا بەدیار دەکەون. شاعیر هەوڵیداوە بەوپەڕی هونەریانەوە

وێنەی دیمەنەکانی ناوەوەو دەرەوەی ئافرەت بکێشێ و لەم ڕووەوە جۆرە جوانکاریەك دروست بکات و ئاست و پلەو پایەی شیعرەکانی پێ بەرز بکاتەوە لە هەمان شیعردا دەڵێ:

**لــــــە قەڵای خواریێ و لــــــە قەڵای ســەرێ**

**پــــــۆل پۆل پــــــەریزاد هەر دێنــــــە دەرێ**

**هەروا وەك خۆیــــــــان شۆخ و شەنگ مــاون**

**تــــــەپکەی بــــــێ دانەی پەرچەمی خــاون**

**لــــــەبــــــەر بێلاّیە و کۆشك و تــــــەلاران**

**هــــەر بەسیلەی چاو دەدوێن وەك جــــــاران**

**ڕاوچــــــی نێو سیپــــەن بــــــەبرژانگی تــیر**

**دەپێکــــــن جــــەرگ و هەنــــــتــاوی نێچیر**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل١١٢ }

شاعیر لێرەدا باسی پاك و بێگەردی سادەو ساکاری لادێمان بۆ دەکات. دیمەنی ئەو کیژە نازدارانەمان پیشان دەدات کە وەك پەریزادان لە قەڵای خوارێ و سەرێی لادێیەکەوە دەچنە خوارێیان لە بێلاّیەکانی کۆشك و تەلاراندا، دەبنە دانەو دوای گەنجان و بەسیلەی چاوەکانیان و تیری برژانگەکانیان دڵ و جەرگی شۆرە لاوان دەپێکن. شاعیر لەم شیعرەدا کۆمەڵێ وێنەی سادەو تاکی کێشاوە بەهۆی لێکچواندنەوەش بنیاتی وێنەکانی پێك هێناوە.

محەمەدی نووری شاعیر لە زۆر کات و بارودۆخدا لە ڕوانگەی ڕۆمانسیزمەوە دەڕوانێتە ژیان و شرۆڤەیان دەکات، بۆیە پەی بە شەنگەستە و ڕەگەزەکانی ڕۆمانسیزم دەبات و ئاوێتەیان دەبێت و لە ناخی شیعرەکانیدا ڕاەنگدەدەنەوە. هەر ئەمەش وای کردووە لە سروشتی خودەوە یان لە بنەماو خەسڵەتەکانی تری ئەم ڕێبازەوە شتەکان بخوێنێتەوە. هەروەك دەڵێ:

**نـیسێی دێوە زمەی غەم و پەژارە**

**ســواری سەرم بوون سەر لە ئێوارە**

**ڕێچکــەی شالاّوی خەیالاّتی دوور**

**بیریـــان کێشامە دەریای بێ سنوور**

**دنیـــای بێدەنگی و دیاری خامۆشان**

**مـــــەڵبەندی خێڵی ڕێك كفن پۆشان**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل١٠٤ }

وێنەی ئەم جارەیان كە لە كانیاوی ڕۆمانسیزمی ناخی شاعیرەوە هەڵدەقووڵێ و كەف و كوڵی پەنگ خواردووی هەڵدەڕێژێ، ڕاستی ئەو ڕووداو و بەسەرهاتەمان پێشان دەدات كەبەسەر شاعیر هاتووە و خستوویانە دەریای بێ سنووری ئەندێشەوە و بەرەو جیهانی كپ و بێدەنگ و خامۆشی بردووە. شاعیر لێرەدا هەستاوە غەم و پەژارەی بە كەسایەتی كردووە. بەلاّم نەك كەسێكی ئاسایی بەڵكو كردوویەتی بە كەسێكی ئەفسانەیی وەك (دێوەزمە) كە سواری سەری دەبن، كە كرداری (سواربوونە سەریش) تایبەت بە مرۆڤ نەك غەم و پەژارە. دیسان لە دێڕی دووەمدا شاعیر (شالاّوی خەیالاّتی) بەكەسایەتی كردووە چونكە خەیاڵ هیچ ڕێچكەیەكی نییە و بەڵكە ئەمەش دیاردەیەكە بەهۆی زۆری هاتو چوونی مرۆڤەوە دروست دەبێ. بەمەش شاعیر توانیویەتی ئەفسانە وەك یەكێك لەو بابەتە دەوڵەمەندانەی ئەدەبیاتی كوردی لەبنیاتی وێنەی شیعرەكانیدا بەكار بهێنێ. كە ئەم ئەفسانەیەش لای شاعیر زیاتر واتاو مەبەستێك دەگرنە خۆ. هەرچۆنێك بێت محەمەدی نووری شاعیر بالاّدەست و لێهاتوو بووە لە وێنەكێشانی ڕووی دەرەوەو ناوەوەی مرۆڤ و دیاردە كۆمەلاّیەتی و سروشتیەكان. بەهای ئێستاتیكیەتی ئەم ڕەگەزە گرینگەكەی شیعریش بە زەقی لە شیعرەكانیدا بەرزو دیارن. جگە لەمەش محەمەدی نووری وەك شاعیرێكی ڕۆمانسیزمی هەوڵی داوە وێنەی لە ژیانی سەردەمی خۆیدا وەربگرێت. بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕووداوو گۆڕانكاریەكان بەرەو پێشەوە بڕوات و وێنەی شیعرەكانی ڕەنگ دانەوەی واقیعی ژیان و هاوچەرخی خۆی بێت. چونكە ژیانی تازە پێویستی بە شیعری تازەو وێنەی تازە هەیە. وەك لە شیعری (لەسەر بستووی ژیان) خۆی دەنوێنێ و دەڵێ:

**لە چۆڵ و بـــــــەردەلاّنی قـاقڕی ژین**

**لە پێ كەوتم تـــەریك و دوورە دەستم**

**بەلاّم دەنگی وەكــــو خەونێكی هاڵۆز**

**بە گوێی ڕوحما دەچرپێنێ كـە هەسـتم**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل١٦ }

لەم دەقەدا شاعیر بە شێوەیەکی هونەری جوان و ڕۆمانسیزمی وێنەکانی کێشاوەو باسی ئەشکەنجەی دەروونی خۆی و سروشتی خود دەکات، کە لەژێر سایەی ژیانی ترش و تاڵی ئەم چەرخە نەگریسەدا گۆشە گیر و سەرگەردان و زەرد و ژاکاو بووە. بەلاّم هێشتا بیّ ئومێد نییەو چرای هیوای نەکوژاوەتەوە. شاعیر لێرەدا بەهۆی شێوازی بەکەس کردنەوە و بەیاریدەی کۆمەڵیّ وێنەی تاکەوە وێنەیەکی بەرز و جوانی بۆ کێشاوین. کە تاڕادەیەکی زۆر توانیویەتی تازەگەریی تێدا بکات، بەلاّم لەگەڵ ئەمانەشدا شاعیر هەرگیز مێژوو و کەلتوور و ڕابردووی نەتەوەکەی خۆی فەرامۆش نەکردووە، چونکە شاعیر پێی وایە کە ئەمڕۆ تەواوکەری دوێنێیەو شتە تازەکانیش لە منداڵدانی شتە کۆنەکان لەدایك بوون. هەر لەسەر ئەم بنەڕەتەش بووە کە شاعیر لایەکی فراوانی لەو بابەتانە کردۆتەوە کە بوونەتە کەرستەو هەوێنی بونیاتی وێنەی شیعری. وەك بابەتی ئایینی و ئەفسانەو گەلێکی تر هەروەك لە شیعری (ئەتۆ خۆش)دا دەردەکەوێت و دەڵیّ:

**لـــــەسەر بـــــــەرزیی ولاّت نزمیم گەلیّ دی**

**ئـــــــــەوەی کێشام لە ڕێت جزیا ئەتۆ خۆش**

**ئـــــەنەلحق گــــــــۆ وەکو مەنسووری هەللاج**

**ســـــــــەرم بڕوا لـــــــە پێی دارا ئەتۆ خۆش**

**چ بـــــــوو ساتێك بــــــــــە دڵشادی ژیابام**

**کەمـــن نەمدی، کوڕی ئـــــــــازا ئەتۆ خـــۆش**

**کە ((مەجنوون)) وەسڵی ((لەیلا)) ی بردە بن گڵ**

**لـــــە گۆڕیشدا دەڵیّ لـــــــــەیـــلا ئە تۆ خۆش**

**کـــــە (وامیق) هـــــــــەر کوتای ئاسن بەساردی**

**نـــــــــەسووتا دڵ بـــــەوی (عەزرا) ئەتۆ خۆش**

{ دیوانی محەمەدی نووری، بستووی ژیان ل٨٧ }

لەم دەقەدا شاعیر ئاماژەی بە هەندیّ ناو کردووە کە لە مێژوو و کەلتور و ئەفسانەی میللەتەکەی، یان بیرو بۆ چوونی ئایینەوە سەرچاوەی گرتووە. وەك مەنسووری حەللاج کەسەری خۆی لە ڕێگای ئەنەلحەق و ڕاستی ڕەوادا بەخشیوە. یان (مەجنوون) کە بەهۆی (لەیلا)وە شێت بووە سەری ناوەتەوە. یان وەك (وامیق)کە ئاسنی ساردی کوتاوە و ڕەنج و ماندووبوونی بە فیڕۆ ڕۆیشتووە. دەستی نەگەیشتۆتە عەزرای خۆشەویستی و ڕەنج بەخەسار

بووه. له هه‌موو ئه‌و وێنانه‌دا شاعیر به‌شێوه‌ی لێکچواندن خۆی به‌م ناوانه ده‌چوێنێ که له نێو مێژوو که‌لتوری میلله‌تی کورد و میلله‌تانی ڕۆژهه‌ڵات وه‌ك ئه‌ستێره‌یه‌کی گه‌ش ده‌دره‌و شێته‌وه. به‌و مه‌به‌سته‌ی له لایه‌که‌وه نه‌مری به‌و ناوانه بدات و له لایه‌کی تریشه‌وه ده‌یه‌وێ قووڵی و به‌رزی و گه‌وره‌یی و فراوانی ئه‌و نائومێدیه‌ش له‌م باره‌یه‌وه بخاته ڕوو.

دیاره هه‌ریه‌ك له هێمن و محه‌مه‌دی نووری تا ڕاده‌یه‌کی زۆر وێنه‌ی شیعریان به‌کار هێناوه. به‌مه‌ش جوانی و نه‌مری و به‌رزی و ئێستاتیکیه‌تیان به شیعره‌کانیان به‌خشیوه، هێمن له بونیاتی وێنه‌ی شیعریدا ڕۆڵ و ئه‌زموونێکی فراوانی هه‌یه‌و توانیویه‌تی وێنه‌ی تازه‌و پڕ داهێنان و گۆڕانکاری بونیاد بنێ. به‌تایبه‌تی ئه‌و وێنانه‌ی له جوانی سروشت و ئافره‌ته‌وه سه‌رچاوه‌ی گرتووه، به‌ڵام له‌لای محه‌مه‌دی نووری زیاتر سروشت سه‌رچاوه‌ی وێنه‌کانی بووه نه‌ك ئافره‌ت و بابه‌ته‌کانی تر.

# ئەنجام

١- ڕۆمانسیزم لە شیعری شاعیرانی کوردستانی ڕۆژهەلاّت، بەتایبەتی لای هێمن و محەمەدی نووری سیمایەکی دیار و گەش و پانتاییەکی فراوانی هەیە.

٢- سروشت وەك یەکێ لە بنەما سەرەکیەکانی ڕۆمانسیزم، سەرچاوەو هەوێنی بەشێکی زۆری شیعری ئەم شاعیرانە بووە. ئەمەش خۆشەویستی ئەو شاعیرانە بۆ سروشت و پابەندبوونیان بەم ڕێبازەوە دەسەلمێنێ.

٣- جوانی ئافرەت لە دیدی هێمن دا زیاتر لە شێوەو ڕوخساری دەرەوەدا بەرجەستە دەبێ. بە پێچەوانەوە لای محەمەدی نووری لە ناوەرۆك و ڕەوشت و هەڵسوکەوت و ئەرکەکانی خۆی دەدۆزێتەوە.

٤- هێمنی شاعیر زیاتر لە خۆشەویستیەکی لە بۆتەیەکدا تواندۆتەوە ئەویش خۆشەویستیی ئافرەت و نیشتمانە. کە هەریەکە لەم دوو خۆشەویستیەی لای شاعیر هێندە ئاوێتە و هاوڕێکن کە بەشێوەی دوو ئاراستەی تەریب دەر دەکەون و کەم جار هەیە یەکێکیان پێش ئەوەی تریان بکەوێت، بەڵکو هەمیشە لە پێش بڕکێ دان. ئەمەش لە سیماو تایبەتمندی و خەسڵەتەکانی شیعری هێمنە.

٥- گەشبینی لەچاو ڕەشبینی دا لە هەریەکە لە شیعرەکانی هێمن و محەمەدی نووری دا کەمتر دەردەکەوێ. ئەمەش بۆ خراپی و ئەو بارە ئابووری و کۆمەلاّیەتی و رامیاریەی کە دەورەی شاعیریان داوە دەگەڕێتەوە.

٦- نامۆیی لە شیعرەکانی محەمەدی نووریدا، تا ڕادەیەك بەدی دەکرێت، بەلاّم هێشتا نەبۆتە سیمایەك شاعیری پێ بناسرێتەوە. هەروەك هێمنی شاعیر پێی دەناسرێتەوە.

٧- سۆز و ئەندێشە لە شیعرەکانی ئەم شاعیرانەدا تا بڵێی قووڵ و فراوان و کاریگەرن. ئەمەش بۆ هەست ناسکی و بێ سنووری ئەندێشە و توانا و لێهاتوویی ئەزموونی شیعری ئەم شاعیرانە دەگەڕێتەوە.

٨- ڕۆمانسیزمی شۆڕشگێڕی وەك بابەتێکی ڕۆمانسیزم، جێگای بایەخ و ئاوڕ لێ دانەوەی هەریەك لەم شاعیرانە بووە. ئەمەش بۆ ئەم بارو دۆخە ڕامیارییەی کە تێیدا ژیاون دەگەڕێتەوە.

٩- مەی و مەیخانە لە شیعرەکانی هێمندا دیاردەیەکی زەقە و ڕووبەرێکی فراوانی گرتووە، بەڵام لە لای محەمەدی نووری بە هیچ شێوەیەك بەرچاو ناکەوێ ٠

١٠- زمانی شیعری ئەم شاعیرانە زمانێکی سادە و ساکار و تەڕو پاراو و ڕەوانەو هەڵقوڵاوی زمانی ڕەسەنی لادێکانی کوردستان بووە. لەگەڵ ئەوەی محەمەدی نووری لە ڕووی زمانەوە دەوڵەمەندە، بەڵام هێمن لەم بوارەدا خاوەنی تایبەتمەندی و زمانێکی (هێمنانەی) پڕ داهێنانە و گەیشتۆتە ترۆپك و گۆڕانکاری و جوداکاریی پێوە دیارە.

١١- مۆسیقای شیعری بە هەردوو لایەنی دەرەوەو ناوەوە، بەڕادەیەکی زۆر جێگای بایەخی ئەم شاعیرانە بووە. ئەمەش وای کردووە کە ئاوازێکی خۆش و ئێستاتیکیەتێکی بەرز لە شیعرەکانیدا بەرجەستە بکەن. لە ڕووی کێشەوە زیاتر پەیڕەوی کێشی عەرووزیان کردووە لە ڕووی سەرواوەش بە پلەی یەکەم و دووەم سەروای یەکگرتوو و مەسنەویان بەکاریهێناوە.

١٢- وێنەی شیعری لە شیعرەکانی هێمن و محەمەدی نووریدا پانتاییەکی فراوان و بەهایەکی بەرزی هەیە. بەتایبەتی لای هێمن داهێنان و گۆڕانکاری پێوەدیارە و جوانی و ڕازاوەیی و زیندوویەتیی تێدا بەرجەستە کردوە.

# بیبلۆگرافیای سەرچاوەکان

## أ- سەرچاوە کوردییەکان

### یەکەم- کتێبەکان:


١- ئەرستۆ، هونەری شیعر، و: عەزیز گەردی، چ گەنج، لەبلاۆکردنەوەکانی چاپ و پەخشی ڕێنما، سلێمانی، ٢٠٠٤

٢- ئەحمەد تاقانە، تۆفیق فیکرەت و شاعیرە نوێخوازەکانی کورد، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

٣- ئەحمەد سالار، ڕێبازە سەرەکیەکانی ئەدەب و هونەر، چاپخانەی (دار الحریە)، بەغدا، ١٩٨٨.

٤- ئەحمەد هەردی، ڕازی تەنیایی، چ ٢، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ١٩٨٤

٥- ئومێد ئاشنا، دەربارەی ئەدەب و مێژوو، چاپخانەی داناز، سلێمانی، ٢٠٠٧

٦- ئیحسان تەبەری، ئیستاتیك و هونەر، و: هێدی، چاپییەکەم، ئەڵمان، ١٩٩١.

٧- ئیدریس عەبدوڵا، قۆناغی پێش ڕۆمانسیزمی شیعری کوردی (١٨٥١ – ١٩٢١)، چ ١، چاپخانەی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٦.

٨- بەختیار سەجادی، محەمەد مەحمودی، فەرهەنگ شیکارانەی زاراوەی ئەدەبی، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤.

٩- بێرڤی، زیما، هەڵوەشاندنەوەی گەرایی، و: ڕێبین ڕەسول ئیسماعیل، چ ١، دەزگای ڕێبین بۆ چاپ و پەخشی کتێب، هەولێر، ٢٠٠٥.

١٠-پیرەمێرد، دیوانی پیرەمێرد، کۆکردنەوەو ساخ کردنەوەی، فائق هۆشیار و هاوڕێیانی، چاپخانەی زەمان، بەغدا، ١٩٩٠.

١١-جیهانگیر غەفاری، بەرو باغی بەهەشت، چ ١، چاپخانەی گەنج، سلێمانی، ٢٠٠٣.

١٢-چارلس بریسلێر، ڕەخنەی ئەدەبی و قوتابخانەکان، و: عبدالخالق یەعقوبی، چ ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢.

١٣-حمید عزیز، سەرەتایەك لە فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان، چ ٢، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٥.

١٤- حوسێن محەمەد عەزیز، یاقووت و زمرڕوتی کوردی، (سروشت و جوانی)، بەرگی سییەم، چاپخانەی سیما، سلێمانی، ٢٠٠٧.
١٥- خالید دلێر، هێمن و هەژار دۆست و دژوار، چاپخانەی دیموکراسی، سلێمانی، **٢٠٠٣.**
١٦- ــــــــ، هێمن و بیر و هەڵوێست و شیعر، چ ١، چاپخانەی دەزگای دیموکراسی، سلێمانی، ١٩٩٣.
١٧- خورشید ڕەشید ئەحمەد، ڕێبازیڕۆمانتیکی لە ئەدەبی کوردی دا، چاپخانەی **جاحظ**، بەغدا، ١٩٨٩.
١٨- ڕەفیق حلمی، شیعرو ئەدەبیاتی کوردی، بەرگییەکەم، چاپخانەی خوێندنی باڵا، هەولێر، ١٩٨٨.
١٩- سەلیم ڕەشید ساڵح، شێواز لە کورتە چیرۆکی کوردیدا، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠٠٥.
٢٠- سوارەی ئێلخانی زادە، تاپۆ بوومە لیل، چ ١، چاپی ساڵحان، تاران، ١٣٧٩.
٢١- عبدالرزاق بیمار، کێش و مۆسیقای هەڵبەستی کوردی، چ ١، چاپخانەی (دار الحریە)، بەغدا، ١٩٩٢.
٢٢- عبدالخالق علاءالدین - دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد، چ ٢، چاپخانەی (دار أفاق العربیە)، بەغدا، ١٩٨٥.
٢٣- عبدولقادر محەمەد ئەمین، وێنەی شیعری لە ڕێبازی ڕۆمانسی کوردیدا، چاپییەکەم، چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٢.
٢٤- عەبدولقەهاری شێخ، ئەزموونەکانی شیعری کوردی، چاپخانەی پاك، هەولێر، ٢٠٠١.
٢٥- علاءالدین سجادی، ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ١٩٦٧.
٢٦- ــــــــــــ، نرخ شناسی، چاپخانەی معارف، بەغدا، ١٩٧٠.
٢٧- د. عەزیز گەردی - ئەدەب و ڕەخنە، چاپخانەی (**الحوادث**)، بەغدا، ١٩٧٤.
٢٨- ــــــــــــ، سەروا، چ ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ١٩٩٩.
٢٩-------------ڕابەری کێشی شیعری کلاسیکی کوردی، چاپخانەی دێکان، سلێمانی، ٢٠٠٣.
٣٠- د. عوسمان دەشتی، هێمن دەربارەی ناوەرۆکی سیاسی و کۆمەلایەتی شیعرەکانی، چاپخانەو ئۆفسێتی تیشك، سلێمانی، ٢٠٠٣.

٣١-د. عیزەدین مستەفا ڕەسول، ئەدەبیتی نوێی کوردی، چاپخانەی خوێندنی بالاٚ، هەولێر، ١٩٨٩.
٣٢-فازیڵ مەجید مەحمود، سروشت لە شیعری گۆراندا، چ ١، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٧.
٣٣-فەرهاد پیربالٚ ـ شیعری نوێی کوردی (١٨٩٨ — ١٩٨٥)، چاپ و بلاٚو کردنەوەی دەزگای کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٥.
٣٤-فەرهاد پیربالٚ ـ ڕێبازە ئەدەبیەکان، چ ٢، چاپخانەی منارە، هەولێر، ٢٠٠٦.
٣٥-ــــــــــــــــــ، شیعری نوێی کوردی (١٨٩٨ — ١٩٨٥)، چاپ و بلاٚو کردنەوەی دەزگای کوردستان، هەولێر، ٢٠٠٥.
٣٦-کاکەی فلاح، کاروانی شیعری نوێی کوردی، بەرگییەکەم، چ ٢، چاپخانەی زانکۆی سەلاٚحەدین، هەولێر ١٩٨٧.
٣٧-د. کمال معروف، ئەدەبیاتی کلاسیکی و نوێخوازی کوردی، چاپخانەی ژین، سلێمانی، ٢٠٠٣.
٣٨-کەریم حسامی، یادی هێمن، لە بلاٚوکراوەکانی سەردەمی نوێ، سوئێد، ١٩٨٧.
٣٩-کەریم دەشتی، ئەدەب و فەلسەفە، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٤.
٤٠-کەمال میراودەلی، فەلسەفەی جوانی و هونەر، (ئێستاتیکا)، خانەی چاپ و بلاٚو کردنەوەی قانع، سلێمانی، ٢٠٠٥.
٤١-ــــــــــــــــــ، هەردی و ڕۆمانسیزمی خود، چاپخانەی شەهید ئازاد هەورامی، سلێمانی — لەندەن، ٢٠٠٧.
٤٢-گۆران، دیوانی گۆران، کۆکردنەوە ئامادەکردنی: محەمەدی مەلا کەریم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێڕاق، بەغدا، ١٩٨٠.
٤٣-د. مارف خەزنەدار — لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردیەوە، چاپخانەی (المؤسسە العراقیە) بەغدا، ١٩٨٤.
٤٤----------------مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی پێنجەم، دەزگای چاپ و بلاٚو کردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥.
٤٥-ــــــــــــــــــ، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی شەشەم، چ ١، دەزگای چاپ و بلاٚو کردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥.
٤٦-د. محەمەد بەکر، کێش و ڕیتمی شیعری فۆلکلۆری کوردی، دەزگای چاپ و بلاٚوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤.

٤٧-محەمەد کوردۆ، گەڕان بەدوای شیعر و جیاوازیدا، بەڕێوەبەرایەتی چاپ و بلاوکردنەوەی سلێمانی، ٢٠٠٦.
٤٨-محەمەدی نووری، دیوانی محەمەدی نووری، پێداچوونەوە و ئامادەکردنی، سەلاحەدین ئاشتی، چاپخانەی شڤان، سلێمانی، ٢٠٠٦.
٤٩-مصلح مصطفی جلالی، شێخ نووری دەنگی ڕەسەنی شیعر، چاپخانەی (دار الحریە)، بغدا، ١٩٨٤.
٥٠-مەولەوی، دیوانی مەولەوی، کۆکردنەوەو لێکۆڵینەوەی: مەلا عبدالکریم مدرس، چ ١، چاپخانەی نجاح، بەغدا، ١٩٦١.
٥١-هێرش، هێمن و من، چ ١، چاپخانەی شیرکەتی کتێبی هەرزان، سوئێد، ١٩٩٢.
٥٢-د. هیمداد حسێن، ڕێبازە ئەدەبیەکان، چ ١، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٥.
٥٣-هێمن، تاریك و ڕوون، لە بلاوکراوەکانی بنکەی پێشەوا، ١٩٧٤.
٥٤-هێمن، دڵی شاعیر، کۆکردنەوەی: ئەسعەد عەدۆ، چاپخانەی عەلاءبەغدا، ١٩٨٠.
٥٥-هێرش، هێمن و من، چ ١، چاپخانەی شیرکەتی کتێبی هەرزان، سوئێد، ١٩٩٢.
٥٦-هێمن، چەپکێ گوڵ و چەپکێ نێرگز، چ ٢، چاپەمەنی و ئینتشاراتی، مهاباد، ١٩٩٩.
٥٧-هێمن، ناڵەی جودایی، ئامادەکردن و پێداچوونەوەی: سەیران حیکمەت، چاپخانەی دەزگای ڕۆشنبیری، سوئێد، ٢٠٠٣.
٥٨-هێمن، دیوانی هێمن، بەسەرپەرشتی، سەیران حیکمەت و سەردار شەمزاو، بلاوکراوەی کوردستان، کوردستان، ٢٠٠٥.
٥٩-یادگار ڕەسوڵ باڵەکی، سیماکانی تازە کردنەوەی شیعری کوردی (١٨٩٨ — ١٩٣٢)، چ ١، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥.
٦٠-یاسین صابر ساڵح، ئینسایکلۆپیدیای گشتی، چ ١، دزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی،٢٠٠٥.

## دووەم: – گۆڤارەکان:


١- ئامانج عوسمان محەمەد - سایکۆلۆژیەتی دەقی ئەدەبی، گ ڕامان، ژ ٢٠، ١٩٩٨.

٢- ئەحمەد سەلام - بەشێك لە ئەدەبی هاوچەرخی تورکی، وەرگێڕان، گ بەیان، ژ ٧٩، ١٩٨٢.

٣- ئەدۆنیس - شیعر ئەو ڕەگەزەیە کە دژوارەکان یەك دەخات، وەرگێڕانی لە فەڕەنسییەوە: ئارام سعید،گ ئاینده، ژ ٦، ٢٠٠٦.

٤- ئەژی گۆران - شێخ نووری شێخ سالّح چەند بیرو ڕاو سەرنجێکی ڕەخنەگرانە، گ بەیان، ژ٧١ ، ١٩٨١.

٥- ئیبراهیم ئیسماعیل پور- هێمن شاعیری عیشق و ئازادی،گ مهاباد، ژ ٤٥،(١٣٨٣– ٢٠٠٤)

٦- ئەکرەم قەرەداغی، زمان لە شیعری نوێدا، گ ئاینده، ژ ٦٥، ٢٠٠٦.

٧- ئوسامە حوسێن ڕەسول - شێواز لە دەقی ئەدەبیدا، گ ئاینده، ژ ٣٥، ٢٠٠٢.

٨- جەمال محەمەد - ئەدەبی ڕۆمانتیکی ئینگلیزی و شۆڕشی، وەرگێڕدراوەلە ئینگلیزیەوە، گ. ڕۆژی کوردستان، ژ ٣٤، ١٩٨١.

٩- حەمە سەعید حەسەن - شیعری ڕۆمانتیك، گ ڕۆمانسی، ژ ١، ٢٠٠٧.

١٠- د. حمید عەزیز - ڕێبازی ڕۆمتنتیکی لە جیهانی فەلسەفەدا، گ ڕامان، ژ ١٢١، ٢٠٠٧ .

١١- خالید ئەحمەد شەریف -شیعری هێمن، گۆڤاری سروە، سالّی پێنجەم، ژ ١٠، ١٩٨٧.

١٢- ڕامین جەهانبەگلو- ئازادی لە ڕوانگەی هیگل و کانتدا، و: ئاکار مەریوانی، گ سەردەم، ژ ٥٢، ٢٠٠٧.

١٣- د. ساسین عەساف - وێنەی شیعری لە ڕێبازی ڕۆمانتیکیەت دا، و: عادل گەرمیانی، گ ڕامان، ژ ٣٧، ١٩٩٩.

١٤- سەباح ڕەنجدەر- شتێك لە نووسین، گ ئاینده، ژ ٥٣، ٢٠٠٤.

١٥- سەرکەوت پێنجوینی - تاسەی غوربەت لە شیعری نوێی کوردی تاراوگەدا، گ ڕامان، ژ ٤٨، ٢٠٠٠.

١٦ سەرکەوت پێنجوینی - تاسەی غوربەت لە شیعری نوێی کوردی تاراوگەدا، گ ڕامان، ژ ٤٨، ٢٠٠٠.
١٧- سەعید شوان - هێمن شاعیری خەم و خاوەن هەڵوێست، گ ئاوێنە، ژ ٢١ — ٢٢، ١٣٧٤.
١٨- سەڵاحی شێخ شەرەف - هێمن و ئاوارەیی، گ كۆسار، ژ ١١،٢٠٠٠.
١٩- سەلاحی شێخ شەرەف - هێمن و ئاوارەیی، گ كۆسار، ژ ١١، ٢٠٠٠.
٢٠- سەید قادر سیادەت - باسی ئەدەبی، گ سروە، ساڵی سییەم، ژ ٨، ١٩٨٧.
٢١- سوارە قەلاڎزەیی - دیالۆگێك لە دیداری (هێمن)ی گەورەدا، گ كاروان، ژ ٢١٣، ٢٠٠٧.
٢٢- شاهۆ سەعید - ریتم لە نێوان شیعر و موزیكدا، گ ئایندە، ژ ٥١ — ٥٢، ٢٠٠٣.
٢٣- د. شوكریە رەسول - دوونامەی (هێمن)ی شاعیر بۆ شوكریە رەسول، گ زمان، ژ ٥٢، ٢٠٠٠.
٢٤- د. عیزەدین مستەفا رەسول - شیعری تازەی كوردی، گ ڕۆشنبیری، ژ ١٥، ١٩٨٥
٢٥- د. عیزەدین مستەفا رەسول، چاوپێكەوتن و ئەنجامدانی: فوئاد حوسێن، گ كاروان، ژ/٧٩، ١٩٨٩.
٢٦- كاكەی فەلاح - وێنەی شیعری چییە، گ كاروان، ژ ٤٩، ١٩٨٦.
٢٧- كامەران موكری، عەرووز، گ ڕامان، ژ ١١٣، ٢٠٠٦، ل ٥٥.
٢٨- كەریم حسامی - شاعیری ناوداری كورد هێمن، گ پەیڤ، ساڵییەكەم، ژ ٢، ١٩٨٦.
٢٩- كەریم مستەفا شارەزا - دڵدار و شیعری ڕۆمانسی، گ كاروان، ژ ٢٥، ١٩٨٤.
٣٠- ______________، جوانی لە شیعردا، گ كاروان، ژ ٧٩، ١٩٨٩.
٣١- ------------- وێنەی شیعری لە هۆنراوەی كوردیدا چۆن دروست دەبێ بە چ هەستێك وەردەگیرێ، گ ڕۆشنبیری نوێ، ژ ٦٩، ١٩٧٨.
٣٢- كەمال مەعروف - چەمكی نامۆبوون لە ئەدەبیاتی ئەورووپی و شیعری نوێی كوردیدا، گ گەلاوێژی نوێ، ژ ٣٠، ٢٠٠٢.
٣٣- د. فەرهاد پیرباڵ - شێخ نووری شێخ ساڵح و بەرگریكردنێك لە شاعیرانی نوێخوازی ئەمڕۆ، گ ڕامان، ژ ٢٤، ١٩٨٨.

٣٤- فەرمان حەسەن سالّح - مرۆڤ و نامۆ بوون، گ ڕامان، ژ ٢٤، ١٩٨٨.
٣٥- محسن ئاوارە - لە ژێر ساباتی شیعردا، گ ڕامان، ژ ٦٦، ٢٠٠١.
٣٦- محەمەد ئەمین ئەحمەد - هێمن و سکالاێ، گ بەیان، ژ ٥١، ١٩٧٩.
٣٧- ـــــــــــــ، مەی و مەیخانە لە شیعری هێمن دا،گ ڕۆشنبیری نوێ، ژ ٧٩، ١٩٨٠
٣٨- محەمەد ئەمین هەورامانی -چەند دێڕێك لە ئەدەبی ڕۆمانسی، گ بەیان، ژ ١٥، ١٩٧٥.
٣٩- محەمەد فەریق حەسەن - هێمن و بۆنی غەریبی، گ بەیان، ژ ٦٥، ١٩٨٠.
٤٠- ناسری رەزازی - یادێك لە مامۆستا هێمن، گۆڤاری مامۆستای کورد، ژ ٢٢، ١٩٧٨.
٤١- ناسر وەحیدی - شاعیر لە غوربەت شیعر لە کۆچدا، گ ڕامان، ژ ٣١، ١٩٩٩.
٤٢- هیوا عومەر ئەحمەد - دینامیکی بیرۆکەو شاعیری لە نێوان هێمن و هەڵمەتدا، گ ڕۆشنبیری نوێ، ژ ٦٦، ١٩٧٨.

## سێیەم: ڕۆژنامەکان

١- برهان شاسوار، هێمن مهابادی شاعیرە ئاوارەکەی کوردستان، ڕۆژنامەی هاوکاری، ژ ٢٢٠، ١٩٧٤.
٢- مستەفا مەعروفی، یادێك لە مامۆستا هێمن، ڕۆژنامەی کوردستان، ژ ١٥٨، ١٩٩٨.

## چوارەم: نامەی ئەکادیمی

١- ئاسۆ عومەر مستەفا، بەها ئێستاتیکیەکانی شیعری لای (پیرەمێرد و شێخ نووری شێخ سالّح و گۆران)، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٣.
٢- پەخشان عەلی ئەحمەد، شێوازی شیعری گۆران، نامەی ماستەر، زانکۆی کۆیە، کۆلیژی زمان، ٢٠٠٧.
٣- حەسەن عەلی عومەر، ڕۆمانسیەت لە هۆنراوەکانی پیرەمێرد دا، نامەی ماستەر، زانکۆی بەغدا، کۆلیژی پەروەردەی ئیبن ڕوشد، ٢٠٠٤.

٤- دلشاد عەلی محەمەد، بنیاتی هەڵبەست لە هۆنراوەی کوردیدا، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین، کۆلیژی ئاداب، ١٩٨٨.

٥- دلشاد علی محەمەد، دیلان و تاقیکردنەوەی شیعری، نامەی دکتۆرا، زانکۆی سەلاحەدین، کۆلێژی ئاداب، ١٩٩٦.

٦- رێزان سالح مەولود، ئەندێشەی شیعری لە نێوان ڕێبازی کلاسیك و ڕۆمانتیکی کوردی لە کرمانجی خواروودا، نامەی ماستەر، زانکۆی کۆیە، کۆلیژی زمان، ٢٠٠٧.

٧- ڕێزان محەمەد غفور، ڕیبازی ڕۆمانسیزم لە شیعری کوردیدا، (١٩١٨ — ١٩٤٥)، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین کۆلیژی پەروەردە، ٢٠٠٥.

٨- عادل مەجید محەمەد گەرمیانی، وێنەی بابەتی لە هۆنراوکانی گۆران و سەیابدا، نامەی دکتۆرا، زانکۆی بەغدا، کۆلیژی پەروەردەی ئیبن روشد، ٢٠٠٠.

٩- عەزیز گەردی، کێشی شیعری کلاسیکی کوردی، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٤.

١٠ - کوێستان جەمال سەلام، سروشت لە شیعری نوێی کوردی (١٩٣٠ — ١٩٦٠)، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٦.

١١- هیتلەر ئەحمەد حمە، وێنەی شیعری لای نالی، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین، کۆلیژی ئاداب، ٢٠٠١.

**موحازەراتەکان:**

١- د. سەردار گەردی، موحازەراتەکانی خوێندنی بالاّ، بەشی کوردی، کۆلیژی زمان، زانکۆی کۆیە، ٣١ / ١ / ٢٠٠٧.

٢- د. عەبدولاّ حەداد، موحازەراتەکانی قۆناغی دووەم، بەشی کوردی، کۆلیژی ئاداب، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩١.

**ب – سەرچاوە عەرەبییەکان:**

**یەکەم: کتێبەکان:**


١- احسان عباس، فن الشعر، الطبعة الرابعة، دار الشروق لنشر وتوزيع، عمان، أردن، ١٩٨٧.

٢- اميه حمدان، الرمزية والرومانتيكية في شعر اللبنانى، منشورات ثقافة و الأعلام، العراق، ١٩٨١.

٣- د. انطونيوس بطرس، الأدب (تعريفه، انواعه، مذاهبه)، المؤسسة الحديثة للكتاب، طرابلس، لبنان، ٢٠٠٥.

٤- ايليا الحاوي، الرومانسية في الشعر الغربى والعربى، دار الثقافة، بيروت، لبنان، بدون سنة.

٥- د. حلمى مرزوق، الرومانتيكية والواقيعية في الأدب، دار النهظة العربية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٨٧.

٦- ر.م.ألبيرس، الأتجاهات الأدبية الحديثة، ت: جورج طرابيشى، منشورات عويدات، ط ٢، بيروت – باريس، ١٩٨٠.

٧- روبرت جلكنر و جيرالد إنسكو، الرومانتيكية، ماها و ماعليها، ت: احمد حمدى محمود، مطابع الهيئة المصرية، ١٩٨٦.

٨- رؤوف عثمان، بحثين في الأدب الكردى، مطبعة الثقافة والشباب، اربيل، ١٩٨٩.

٩- روز غريب، تمهيد في النقد الحديث، ط ١، مطبعة دار المكشوف، بيروت، لبنان، ١٩٧١.

١٠- د. سالم احمد حمدانى، مذاهب الأدب العربي ومذاهرها فى الأدب العربي الحديث، مطبعة تعليم العالى في الموصل، ١٩٨٩.

١١- سيسل دى لويس، الصورة الشعرية، ت: أحمد نصيف الجنابى و أصدقائه، دار الرشيد للنشر، بغداد، ١٩٨٢.

١٢- د. شفيق بقاعى، د. سامى هاشم، المدارس الأنواع الأدبية، منشورات المكتبة المصرية، صيدا، بيروت، ١٩٧٩.
١٣- د. طاهر احمد مكى، الشعر العربى المعاصر روائه و مدخل قرأته، مطبعة دار المعارف، مصر، ١٩٨٠.
١٤- طلعت عبدالعزيز ابو العزم، الرؤية الرومانسية للمصير الأنسانى لدى الشاعر العربي الحديث، الهيئة المصرية العامة للكتاب، قاهرة، ١٩٨١.
١٥- عاطف جودة نصر، الخيال و مفهوماته ووضائفه، الهيئة المصرية العامة للكتاب، مصر، .١٩٨٤
١٦- د. عبدالمنعم تليمه، مقدمة فى نظرية الأدب، ط ٢، كلية لآداب، جامعة القاهرة، دار العودة، بيروت، .١٩٧٩
١٧- د. على البَطَل، الصورة في الشعر العربي حتى القرن الثانى الهجرية، الطبعة الثانيية، دار الأندلس للطباعة و النشر والتوزيع، ١٩٨١.
١٨- على عبدالرزاق محمود، النقد الأدبى الحديث، دار الحكمة للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٩١.
١٩- د. علي علي مصطفى صبح، فن الأدب الحديث في ضوء المذاهب الأدبية والنقدية، مطبعة منيمة الحديثة، دار المريخ، سعودية، .١٩٧٩
٢٠- د. عزالدين اسماعيل، الأدب و فنونه، الدار العربية للكتاب، ليبيا، تونس، ١٩٧٨.
٢١- د. عماد حاتم، مدخل الى تأريخ الأدب العربية، دار العربية للكتاب، ليبيا، تونس، ١٩٨٩.
٢٢- ف. ل. سولنيه، الرومانطيقية في الأدب الفرنسى، ت: احمد دمشقية، ط ١، منشورات عويدات، بيروت، لبنان، ١٩٦٠.
٢٣- د. كمال عبيد، فلسفة الأدب والفن، الدار العربية للكتاب، ليبيا، تونس، ١٩٧٨.

٢٤- د. كمال معروف، الحركة التجديدية في الشعر الكردى المعاصر (١٩١٤ – ١٩٦٥)، ج ١، مطبعة ازاد، ستكوهولم، ١٩٩٢.
٢٥- ـــــــــــــــــــــــــ، دراسة عن اعمال طوران الأدبية، ط ١، مطبعة طقنج، منشورات دار رينما، السليمانية، ٢٠٠٥.
٢٦- ليليان فيرست، الرومانتيكية، ت: عدنان خالد، من المنشورات المركز الثقافى الأجتماعى، بغداد، ١٩٨٧.
٢٧- محمد جلوب فرحان، دراسات في فلسقة التربية، مطبعة التعليم العالى، موصل، .١٩٨٩
٢٨- محمد رضا مبارك، اللغة الشعرية فى الخطاب النقد العربي، مطبعة وزارة الثقافة، بغداد، ١٩٩٣.
٢٩- د. محمد غنيمى هلال، الرومانتيكية، ط ٦، دار العودة، بيروت، ١٩٨١.
٣٠- د. محمد مندور، الأدب و مذاهبه، دار نهضة مصر للطبع و النشر، الفجالة – القاهرة، بدون سنة.
٣١- مجد محمد الباكير البرازى، في النقد الأدبي الحديث، الطبعة الأولى، مكتبة الرسالة الحديثة، عمان، اردن، ١٩٨٦.
٣٢- د. محمود عبدالله الخوالده، د. محمد عوض الترتوري، التربية الجمالية وعلم النفس الجمال، ط١، دارالشروق للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠٠٦.
٣٣- مجموعة من المؤلفين، تاريخ الأدب الاوروبية، قسم الثالث، ت: صباح الجهيم، وزارة الثقافة، سورية، دمشق، ٢٠٠٢.
٣٤- د. نبيل راغب، المذاهب الادبية من الكلاسيكية الى العبثية، الهيئة المصرية العامة للكتاب، ١٩٧٧.
٣٥- يمنى العيد، الدلالة الاجتماعية لحركة الادب الرومانطيقي في لبنان، بين الحربين العالمتين، دار الفارابي، بيروت، ١٩٧٩.

**دووەم – گۆڤارو ڕۆژنامەکان**

- محمد روحی فیصل، المدرسة الرومنطيقية – نشأتها و خصائصها ومكانها بين المدارس الادبية، مجلة الكتاب، مجلد ٢، مطبعة دار المعارف، مصر، ١٩٤٦.

**سێیەم – نامەی ئەکادیمی**

١- كيلاس محمد عزيز العسكرى، الاغتراب في شعر الشاعرين: محمود درويش و شيركو بيكەس، رسالة ماجستير، جامعة بغداد، كلية التربية للبنات، ٢٠٠٥.

٢- ليلى عثمان عبدالله، شعر الطبيعة بين ابراهيم ناجى و طؤران، رسالة ماجستير، كلية اللغات، جامعة سليمانيية، ٢٠٠١.

### ج – سەرچاوە ئینگلیزیەکان

**یەکەم کتێبەکان:**

1- J.A.cuddon، Adictionary of litray terms، Hazell Watson and virylimited1979 157--lilan R. farst ، Romanticism in pres pactive، second Ediction، 1979.

2- Iogan ، Adams ، the Nortor Anthology of: Fulum 29 sixth Edition، Norton، London، 1981.

3- Stephe prickett، the context of English litera ture، the Romanticsm London 1978.

ء

**- - سەرچاوەی فارسی/ کتێب:-**

- جیلین بیر، ترجمەی: سودابە دقیقی، چاپ دوم، نشر مرکز، تهران، ۱۳۸۳.

